# خاڵ

گۆڤارێکی هزریی ڕۆشنبیریی وەرزییە، ژمارە (٣٢) ئایاری ٢٠٢١

بە سپۆنسەری سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری

خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر
تۆفیق کەریم

٠٧٥١١٤١٢٥٤٣ - ٠٧٧٣٢٦٣٧٦٦٤
tofeqkarem@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین: عادل سدیق

بەڕێوەبەری هونەریی: ڕەوشت محەمەد

ڕاوێژکاری یاسایی: بەکر حەمەسدیق

**دەستەی نووسەران**

د. ئیسماعیل بەرزنجی

ڕێدار ئەحمەد

ئیسماعیل تەها

د. مەریوان حەمەدەرویش

د.حسێن محەمەد ئیبراهیم

**دەستەی ڕاوێژکاران**

پ. د.موحسین عەبدولحەمید

پ. د. سەباح بەرزنجی

پ. د. عوسمان هەڵەبجەیی

پ.ی. د. عوسمان عەلی

پ.ی. د. ئیسماعیل بەرزنجی

م.ی. ئیدریس سیوەیلی

سایتی گۆڤاری خاڵ
www.xallkurd.com

تیراژ: ١٥٠٠

نرخ: ١٥٠٠ دینار



# ناوەرۆك

## تەوەری ژمارە:



## بابەتی گشتی:





## تەوەری داهاتوو

# ڕۆمان و چیرۆکی کوردی

## دوای سەدەیەک ئەزموون، بەرەو کوێ؟

وا نزیک دەبینەوە لە یادی سەد ساڵەی نووسینی یەکەم چیرۆکی کوردی، بە حوکمی ئەوەی ڕۆمان و چیرۆک سەر بەیەک ژانری ئەدەبین و لە ڕەخنەی نوێدا لە قاڵبی گێڕانەوەخوازیدا یەکدەگرن دەکرێ مێژووی ئەو ئەزموونە هی هەردووکیان بێت. بۆیە لەم تەمەنەدا و لە چاوەڕوانی هاتنی نەوەی پێنجەمی تەکنۆلۆجیادا جێی خۆیەتی بپرسین: دەبێت ئێستا پێگەی چیرۆک و ڕۆمانی کوردی لە کوێی کولتوور و گرنگی پێدانی کۆمەڵگادا بێت؟ ئەگەر لەو مێژووە دوورودرێژە بڕوانین چەندە ئەزموونی بەرهەمهێنان و ڕەخنەی دەقی گێڕانەوە دەبینین؟ لێرەوە دەخوازین قەڵەمبەدەستان توێژینەوە و بابەتەکانیان لەم تەوەرانەدا بۆ ژمارەی داهاتووی گۆڤاری خاڵ بنێرن:

١- چیرۆک و ڕۆمانی کوردی، دەسپێک و ئەزموون، کامیان ژانری داهاتوو دەبێت؟
٢- کاریگەریی ڕەوت و ئاڕاستە جیاوازەکانی ئەدەب لەسەر ڕۆمانی کوردی.
٣- ڕۆمان و بەرەنگاری.
٤- کاریگەریی ڕۆمان لەسەر بنیادنانی فیکریی خوێنەری کورد.
٥- ڕۆمان و پەیامداریی لە نێوان گەیاندن و ئەدەبیبووندا.
٦-داهاتووی ڕۆمانی کوردی لە سایەی پەرەسەندنی هونەری سادەی ناو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا.
٧- ڕۆمان لە سایەی تەکنۆلۆجیادا، کاریگەرییە ئەرێنی و نەرێنییەکان.
٨- بەشداریی تەوژمی ئیسلامی لە ئەزموونی چیرۆک و ڕۆمانی کوردیدا.
٩- ڕۆمانی وەرگێڕدراو یان بەکوردی نووسراو دیارترە لەم ئەزموونەدا؟
١٠-ئایا ڕەخنەی ئەدەبی هاوتەریبە لەگەڵ پێشکەوتنی ئەزموونی ڕۆمان و چیرۆک نووسیندا؟
١١- داواکارین لە نوسەرانی بەڕێز، لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر ئەو تەوەر و بوارانەی کە ئاماژەیان پێدراوە تا ڕێکەوتی (٢٠٢١/٧/١) بنێرن بۆ گۆڤارەکەمان.



تەوەری ژمارە

# قەیرانی ئابووری هاوچەرخ

## لەدیدگای سیستمی ئابووری ئیسلامییەوە

جیهانی ئەمڕۆ بەگشتی جیهانێکی ماددیگەراییە، ڕژێمی سەرمایەداری دەسەڵاتی خۆی بەسەریدا سەپاندووە، بەشێوەیەک دەیەوێت مادده بکات بە جێگرەوەی هەموو شتەکانی دیکە، وادادەنێت لەو ڕێگەیەوە چارەسەری هەموو گرفت و قەیرانەکان بکات و جیهانیکی خۆشگوزەران و ئازاد و ئارام فەراهەم بهێنێت، کەچی خود ڕژێمەکە خۆی کەوتووەتە قەیرانەوە، ئەو سستمە ئابوورییەی کە دایڕشتووە گرفتی گەورەی لەسەر ئاستی تاک و کۆمەڵگە و دەوڵەتاندا دروستکردووە.

کەواتە ئەم دۆخە ئاڵۆزەی ئەو بەرپای کردووە، سەرەنجام دەگاتە کوێ؟ ئەو کەموکورتییانە کامانەن کە لە سستمی ئابووری ئەمڕۆی جیهاندا هەن؟ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە مرۆڤایەتی بەدوای ئەلتەرناتیڤێکدا بگەڕێت؟ تێڕوانینی ئیسلام لەم بوارەدا چییە؟ ئایا سستەمێکی ئابووری تێروتەسەلی بۆ ئەم سەردەمە پێیە؟

پرسیاری زۆر لەسەر ئابووری جیهانی و قەیرانەکانی و چارەسەر سەرهەڵدەدەن، وەڵامەکانیش پێویستییان بە توێژینەوەی زانستی و بابەتی هەیە، کۆڤاری خاڵ لەم ژمارەیەیدا تەوەرێکی بۆ کردووەتەوە و بۆچوونی کۆمەڵێک مامۆستای پسپۆڕ و قاڵبووی مەیدانی ئابووری دەخاتەڕوو، بەو ئومێدەی خوێنەرانی هێژا وەڵامی پرسیارەکانیان لە بواری ئابووریی و قەیرانەکانی لە دوو توێی ئەو بابەتانەدا وەرگرن.



د. ئالان ئیبراهیم محەمەد

# ئایا سیستمی چاودێری شەرعی دەتوانێت بانکە ئیسلامییەکان لە مایەپووچ بوون ڕزگار بکات؟


**پوختەیەک**

بەڕێوەبەریی شەرعی تایبەتمەندییەکی بێهاوتا و گرنگی سیستمی بەڕێوەبەری داراییە کە بایەخ بە لایەنی شەرعی کۆی چالاکی دامەزراوە داراییە ئیسلامییەکان ئەدات بەراود بە دامەزراوە داراییە ڕیبەوییەکان. چاودێری شەرعی زیاتر میکانزمێکی نێوخۆییە بۆ چاودێریکردنی کار و چالاکییەکانی بانکە ئیسلامییەکان و سەرجەم ئەو دامەزراوە داراییانەی کە کاری بانکی ئیسلامی ئەنجامدەدەن بەمەبەستی دڵنیابون لە جێبەجێکردن و پەیڕەوکردنی بنەماکانی ئابووری ئیسلامی لەو مامەڵانەی کە لەلایەن ئەو دامەزراوە داراییانەوە ڕادەپەڕێنرێن. بەهۆی گەشەسەندنە خێرا و گرنگەکانی کەرتی داراییی ئیسلامی، بوونی سستمێکی پتەوی بەڕێوەبەری شەرعی لە ئێستادا لە هەموو کات گرنگتر و بەبایەخەترە، بۆیە بوونی چاودێرییەکی شەرعی کاریگەر و بەتوانا پێویستییەکی هەنوکەیی بەنرخە بۆ دامەزراوەیەکی داراییی ئیسلامی متمانەپێکراو. کەوابوو نەبوونی ستسمێکی بەڕێوەبەری شەرعی پتەو و کاریگەر دەرەنجامی نێگەتیڤ و نەرێنی دەبێ لەسەر پرۆسەی پێشخستن و گەشەسەندنی کەرتی داراییی ئیسلامی کە ئەمەش ئەگەر و هەڕەشەیەکی ڕاستەقینەیە بۆ هەرەس و داڕمانی ئەو دامەزراوە داراییانەی کە کاری بانکی ئیسلامی دەکەن. بۆیە ئامانج لەم بابەتە لێکۆڵینەوەیە لە گرنگی سستمی بەڕێوەبەریی شەرعی و پراکتیزەکردنی لە دامەزراوە داراییە ئیسلامییەکاندا، هەروەها سەرنجدان و وردبوونەوە لەو کۆسپ و تەگەرانەی دێنە ڕێی ئەم سستمە.

## پێشەکی

بانکە ئیسلامییەکان کۆمەڵە دامەزراوەیەکی دارایی تایبەتمەندن کە  پشت بە بنەما و یاسا فقهییەکانی شەریعەتی ئیسلامی ئەبەستن لە چالاکییەکانیاندا بەتایبەتی لە بوارەکانی فقهی مامەڵە و بنەما فقهییەکان (فقه المعاملات واصول الفقه). پابەندبوون بەم بنەما و یاسایانە گرنگییەکی تایبەتی هەیە کە بەهۆیەوە جیادەکرێتەوە لە بانکە ڕیبەوییەکان بۆیە بانکە ناڕیبەوییەکان یاخود بانکە ئیسلامییەکان ڕووبەڕووی زیاتر لە ڕیسک و مەترسیەک دەبنەوە لە چالاکی و مامەڵەکانیاندا بە بەراود لەگەڵ سستەمی بانکە ڕۆژئاواییەکان. گەلێک جار ئەم مەترسییانە، بەتایبەت ڕیسکی لادان و پابەندنەبون لە ڕێسا ئابوورییە ئیسلامییەکان، هۆکارێک بوون بۆلاوازبوونی متمانەی بەکارهێنەران و بەشداربووانی ئەم جۆرە بانکانە، هەروەها بونەتە هۆی دارمان و مایەپوچبوونی چەندین بانک و دامەزراوەی دارایی ئیسلامی. شکست و مایەپوچبوونی ژمارەیەک بانکی ئیسلامی لە نێوان ساڵەکانی (١٩٩٠ ـ ٢٠٠٠)، لەنێوانیاندا دامەزراوەی دارایی ئیخلاس بۆ دروستکردنی خانوبەرە لە تورکیا، بانکی ئیسلامی لە ئەفریقای باشوور هەروەها کۆمپانیای وەبەرهێنانی ئیسلامی لە میسر لە دیارترین نمونەی ئەو دامەزراوە داراییە ئیسلامییانەن کە دوچاری ئەو مەترسییانە بوونەوە بەهۆی بایەخ نەدان و بەهەندوەرنەگرتنی ئەو بنەما و پرنسیپە ئابوورییە ئیسلامییانەی کە پێویستە وەک بانکێکی ئیسلامی پێوەی پابەندبن.

لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی کە ئاماژەی پێدرا، بوونی سستمێکی چاودێری شەرعی پێداویستییەکی بنەڕەتی و سەرەکییە لە سەرجەم دامەزراوە داراییە ئیسلامییەکاندا بۆ فەراهەمهێنان و پاڵپشتیکردنی بنەماکانی دادگەریی و شەفافیەت لەکاری ئەو دامەزراوانەدا. لەڕاستیدا دەستەی چاودێری شەرعی بەشێکی هەرە گرنگی کۆی سستەمی چاودێری شەرعییە لە دامەزراوە داراییە ئیسلامییەکاندا کە ڕۆڵێکی قوڵ و سەرەکی دەبینێ لە چاودێریکردن و ڕێنمایی کردن و دەرچوواندنی بڕیاری پەیوەندیدار بەکار و چالاکییەکانی ئەو دامەزراوانە. ڕۆڵ و کاریگەری سستەمی چاودێری شەرعی تەنها بەمەبەستی چاودێری چالاکییە داراییەکانی دامەزراوە و بانکە ئیسلامییەکان نییە بەتەنها، بەڵکو بە ئامانجی بەهێزکردنی متمانەی سەرجەم بەشداربووانی ئەو دامەزراوانەن تا لەڕێیەوە ڕیشەی ئەو بانک و دامەزراوە داراییە ئیسلامییانە لە وڵاتە ئیسلامییەکان و تەنانەت ڕۆژئاواییەکانیشدا توندوتۆڵ بکەن و پەرەی زیاتر بە گەشەسەندنەکانیان بدەن.

سەرباری ئەوەی کە ئاماژەی پێکرا، بوونی پەیکەرێکی یاسایی تۆکمە پێویستییەکی لە پێشینە و بنەڕەتییە بۆ پاڵپشتیکردنی سستمێکی چاودێری شەرعی کاریگەر و چالاک. یاسا ڕۆڵێکی کاریگەری دەبێت لە ڕێکخستنی ئەو مامەڵە بازرگانی و داراییانەی کە لەلایەن بانکە ئیسلامییەکانەوە جێبەجێ دەکرێن. یاسا ئامرازێکی سەرەکییە بۆ دیاریکردنی ئەرک

و بەرپرسیاریێتی دەستەی چاودێری شەرعی، وەک گرنگترین بەشی سستمی چاودێری شەرعی، هەروەها دیاریکردن و چەسپاندنی ئەو پێودانگانەی کە گرنگن بۆ دامەزراندنی ئەندامانی ئەو دەستەیە و ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان ئەو دەستەیە و بەشداربوونی ئەو دامەزراوانەی کە کاری بانکی ئیسلامی دەکەن. بۆیە بوونی یاسایەکی بەهێزی پەیوەندیدار ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە کەمکردنەوەی مەترسییە ڕاستەقینەکانی سەر کۆی سێکتەری بانکە ئیسلامییەکان کە دەبنە هۆی لاوازبوونی گەشەسەندنی ئەو بانکانە. لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی ئاماژەی پێدرا، بوونی سستمێکی چاودێری شەرعی کاریگەر و چالاک شانبەشانی سستمێکی یاسایی پتەو بەهێز هۆکارێکی مسۆگەرە بۆ دەستەبەرکردنی سێکتەرێکی بانکی ئیسلامی پێشکەوتوو متمانەپێکراو.

لەم نوسینەدا سەرەتا تیشک خراوەتە سەر کورتەیەک لە مانا و چەمکی سستمی چاودێری شەرعی. هەروەها ڕۆڵ و گرنگی سستمی چاودێری شەرعی لە دامەزراوە داراییە ئیسلامییەکاندا خاڵێکی گرنگی ترە کە ئاماژەی پێدراوە لەم بابەتەدا. بەشێکی تری ئەم لێکۆڵینەوەیە تەرخانکراوە بۆ تاوتوێکردنی سەرەکیترین مۆدێلەکانی ئەم سستمە چاودێرییە. لەکۆتاییدا شیکاری باوترین گرفت و لەمپەڕەکانی سستمی چاودێری شەرعی کراوە لەگەڵ پوختەیەک لە دەرئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

### ماناو چەمکی سستمی چاودێری شەرعی

مێژووی سەرهەڵدانی سستمی چاودێری شەرعی تاڕادەیەکی زۆر هاوتایە لەگەڵ سەرەتای دامەزراندنی بانکە ئیسلامییە مۆدێرنەکان، کە دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی ساڵانی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو، کە ئەمەش مێژوویەکی نوێیە. بەوهۆیەوە نوسەران و توێژەرە پسپۆڕەکان کەمترین بایەخیانداوە بەم سستمە بەتایبەتی لەڕووی واتا و ڕاڤەکردنی چەمکە گرنگەکانی ئەم بوارە. بێگومان ئەمەش هۆکارە بۆ ناڕوونی و جیاوازی لە تێڕوانینەکان سەبارەت بە تێگەیشتن لە گرنگترین ڕۆڵ و ئەرکەکانی ئەم سستمە. لەبەر ئەم هۆکارە پێویستە بۆ زانین و تێگەیشتن لە واتای سستمی چاودێری شەرعی بگەڕێینەوە سەر ئەو ڕێنمایی و یاسایانەی کە لەلایەن ڕێکخراو و دامەزراوە تایبەتمەندەکانەوە دەرکراون. لە گرنگترین ئەو ڕێکخراوە تایبەتمەندانە ڕێکخراوی بۆردی خزمەتگوزاری دارایی ئیسلامییە (IFSB) کە پسپۆڕە لە بوارەکانی سستمی چاودێری شەرعی. بەپێی بنەماکانی ئەو ڕێنماییانەی کە لەلایەن ڕێکخراوی ئاماژەپێدراوەوە سستمی چاودێری شەرعی بریتییە لە:

«کۆمەڵێ ڕێکخستنی ڕێکخراوەیی و دامەزراوەییە کە لە ڕێیەوە دامەزراوە داراییە ئیسلامییەکان لە بوونی چاودێرییەکی کاریگەر و سەربەخۆ دڵنیائەبنەوە بەمەبەستی

چەسپاندنی پابەندی شەرعی لەڕێی دەرچوواندنی ڕاو بۆچونی شەرعی پەیوەندیدار و خستنەڕووی زانیاری دروست و پرۆسەی دوبارە پشکنینە نێوخۆییەکانی تایبەت بە پابەندی شەرعی»

بۆ ناساندن و تێگەیشتن لە واتا و چەمکی سستەمی چاودێری شەرعی لەبەر ڕۆشنایی ئەو پێناسەیەی سەرەوەدا ئەوە ڕوونە کە سستەمی چاودێری شەرعی پێکهاتووە لە چەند ڕێکخراوێکی دامەزراوەیی کە هەریەکە و تایبەتمەندییەکی هەیە وەک دەستەی شەرعی و چەند دامەزراوەیەکی تری تایبەت و پەیوەندیدار بەو دەستەیە کە لە گرنگترینیان بەشی وردبینی ناوخۆییە. هەروەها لەو پێناسەیەدا ئاماژە دراوە بە بوونی چاودێرییەکی کاریگەری پابەندبوونی شەرعی کە بێگومان ئامانج لێی ڕەخساندنی میکانزمێکی کاریگەر و گونجاوە بۆ جێبەجێکردنی پابەندبونی شەرعی. جگەلەوەی کە باسکرا، ئەوەی مابێت ئاماژەی پێبدرێت بریتییە لە دەرچوواندنی ڕاوبۆچوونە شەرعییەکان و خستنەڕووی زانیارییەکان بەشێوەیەکی دروست کە ئەمەش کۆی پرۆسەی پابەندبوونی شەرعی لە کار و چالاکییە داراییەکانی بانکە ئیسلامییەکان دەگرێتەوە.

هەروەها ئەم پێناسەیە ئەوە دەخاتە ڕوو کە دەستەی شەرعی لە گرنگترین بەشی سستەمی چاودێری شەرعییە وەک دەستەیەکی ڕێگەپێدراو و فەرمی بۆ دڵنیابوون لە پەیڕەوکردنی پابەندی شەرعی لە دامەزراوە داراییە ئیسلامییەکاندا. ئەم دەستەیە، هەروەک لە زۆرینەی یاسا و ڕێنمایی پەیوەندیدارەکاندا ناسراوە، بریتییە دەستەیەکی سەربەخۆ متمانەپێکراو کە ئەرک و فرمانگەلێکی پێ ڕاسپێدراوە سەبارەت بە بەڕێوەبردن و چاودێریکردن و کۆنترۆڵکردنی سەرجەم چالاکییەکانی بانک و دامەزراوە داراییە ئیسلامییەکان بەمەبەستی جێبەجێکردنی پابەندبوونی شەرعی و دەرچوواندنی یاسا و ڕێسا پەیوەندیدارەکان بەکاری بانکی و دارایی ئیسلامی. لەڕاستیدا دەستەی شەرعی بە چەند شێوەیەک پێناسەکراوە کە گرنگترینیان ئەوەی سەرەوە بوو کە لە ڕێنماییە تایبەتەکانی ڕێکخراوی (ژمێریاریی و وردبینی بۆ دامەزراوە داراییە ئیسلامییەکان)ەوە ئاماژەی پێدراوە.

بەشێوەیەکی گشتی چاودێری شەرعی سستمێکی تەواوکاریی و بێهاوتایە لە پەیکەری دارایی ئیسلامی کە بایەخ بە لایەنی شەرعی ئەدات لە چالاکییەکانی دامەزراوە داراییە ئیسلامییەکان کە کاریگەریەکی گرنگی هەیە لە چاندنی متمانە لای بەشداربووانی بانکە ئیسلامییەکان و بەرەوپێشخستنی کۆی کەرتی دارایی ئیسلامی.

**جۆرەکانی دەستەی شەرعی**

وەک پێشتر ئاماژەی پێدرا دەستەی شەرعی گرنگترین بەشی سستمی چاودێری شەرعییە کە ڕۆڵی کاریگەر و سەرەکی دەبینێت لە چاودێریکردن و سەرپەرشتیکردنی کار و چالاکییەکانی ئەو دامەزراوانەی کە کاری بانکی ئیسلامی ڕادەپەڕێنن. لەبەر ئەم گرنگییەی کە هێمای بۆ کرا زۆرترین سەرنجەکان لەسەر دەستەی ناوبراو ئەبێت بەتایبەتی لە دیاریکردنی جۆرەکانی و ئاماژەدان بە ڕۆڵ و کاریگەرییەکەی. سەبارەت بەجۆرەکانی دەستەی شەرعی گرنگە ئەوە بخرێتە ڕوو کە ئەم پۆلێنکردنە بایەخی خۆی هەیە لە دیاریکردنی ڕۆڵ و بەرپرسیارێتی دەستەی شەرعی. بۆ ئەم مەبەستە توێژەران بە چەندین شێوەی جیاواز مۆدێل و جۆرەکانی دەستەی شەرعیان پۆلێنکردووە پاڵپشت بە چەند بنەمایەکی جیاواز. پۆلێنکردنی دەستەی شەرعی بۆ جۆرەکانی نێوخۆیی و دەرەکی لە گرنگترین و وردترین ئەو دابەشکردنانەن کە لەم بابەتەدا هەوڵدراوە بەکورتی باسیان لێوە بکرێت کە بەپێی جۆری یەکەمیان دەستەکە دابەشدەبێت بۆ دەستەی شەرعی تاک یاخود تایبەت و دەستەی شەرعی ناوەندی. سەبارەت بە دووەم جۆریان، واتا دەرەکی، دەستەی شەرعی پۆلێن دەبێت بۆ سێ جۆری جیاواز ئەوانیش دەستەی شەرعی نیشتیمانی و نێودەوڵەتی و ڕێکخراوەیی کە لە خوارەوە هەریەکەیان بەجیا باسی لێوە دەکرێت.

**١. دەستەی شەرعی نێوخۆیی**

١,١. دەستەی شەرعی تایبەت

ئەم مۆدێلەیان لە بەربڵاوترین جۆرەکانی دەستەی شەرعین کە مەبەست لێی ئەو دەستە شەرعیانەن کە تایبەتن بە چاودێری کردنی مامەڵە و چالاکی دامەزراوەیەکی دارایی ئیسلامی تایبەت. بەشێوەیەکی گشتی هەر بانکێکی ئیسلامی یاخود دامەزراوەیەک کە کاری بانکی ئیسلامی دەکات مەرجە کە دەستەیەکی شەرعی تایبەت بەخۆی هەبێت بەمەبەستی دڵنیابوون لە بەجێهێنانی پابەندی شەرعی لە چالاکییەکانیدا. لەم جۆرەیاندا، مەرجی دامەزراندنی دەستەی شەرعی مەرجێکی سەرەکییە و پێویستە هەموو بانکێکی ئیسلامی لە گرێبەستی دامەزراندنەکەیدا (Articles of Association) بەڕوونی ئاماژەی پێدابێت. ئەوەی جێی ئاماژەیە، پێکهاتەی ئەم جۆرە لە دەستەیەکەوە بۆ یەکێکی تر ئەگۆڕێت.

١,٢. دەستەی شەرعی ناوەندی

بە پێچەوانەی جۆرەکەی سەرەوە، ئەم مۆدێلەیان بریتییە لە بوونی تەنها یەک دەستەی شەرعی بۆ سەرجەم ئەو بانک و کۆمپانیایانەی کە چالاکی بانکی ئیسلامی ئەنجام دەدەن کە مەبەست لێی بە سەنتەرکردنی دەستەی شەرعییە بۆ کۆی چالاکییە

داراییە ئیسلامییەکان. ئەم جۆرە لە دەستەی شەرعی دەکرێ بە مۆدێلێکی ناکارامە و ناچالاک ناوببرێت لەبەر دژواری کارەکانی کە ئەرکی چاودێریی و سەرپەرشتی گرووپێکی زۆر دامەزراوەی دارایی ئیسلامی دەگرێتە ئەستۆ سەرەڕای جیاوازی سستەم و پەیکەری یاساییان.

**٢. دەستەی شەرعی دەرەکی**

٢,١. دەستەی شەرعی نیشتیمانی

دامەزراندنی دەستەی شەرعی بەپێی ئەم مۆدێلە پێویستی بە ڕەزامەندی دەزگایەکی حکومی فەرمی هەیە لەسەر ئاستی نیشتیمانی. زۆرجار ئەو دەزگایە بانکی ناوەندییە یاخود دەزگای کاغەزە داراییەکانە، کە ئەم مۆدێلە زیاتر لە وڵاتانی باشووری ئاسیادا باون وەک مالیزیا و ئەندەنوسیا و بروونای و سەنگاپور. لە هەندێ وڵاتی تردا وەک کوەیت، وەزارەتی ئەوقاف تایبەتمەندە بە دامەزراندنی دەستەی شەرعی بانکە ئیسلامییەکان. فۆرمێکی تری ئەم مۆدێلە ئەوەیە کە دەبینرێ لە کۆماری ئیسلامی ئێران کە دامەزراندنی دەستەی شەرعی پێویستی بە ڕەزامەندی ئەنجومەنی شورای پاسەوانی هەیە کە تاکە ئەنجومەنی ڕێگە پێدراوە بۆ سەرجەم دامەزراوە داراییەکانی ئێران. ئامانج و مەبەست لەم مۆدێلەدا ڕێکخستن و بە ستانداردکردنی بڕیارە شەرعییە پەیوەندیدارەکانن وەک دوایین بڕیاری پابەند.

> **بانکە ئیسلامییەکان کۆمەڵە دامەزراوەیەکی دارایی تایبەتمەندن کە پشت بە بنەما و یاسا فقهییەکانی شەریعەتی ئیسلامی ئەبەستن لە چالاکییەکانیاندا بەتایبەتی لە بوارەکانی فقهی مامەڵە و بنەما فقهییەکان**

٢,٢. دەستەی شەرعی نێودەوڵەتی

دەستەی شەرعی لەم مۆدێلەدا ئەو جۆرانە دەگرێتەوە کە وەک دەستەیەکی سەربەخۆ لەلایەن چەند وڵاتێکی ئیسلامییەوە دادەمەزرێن لەسەر بنەمای هاوکاری هەمەلایەنەی نێوانیان. هەریەک لە ڕێکخراوی ژمێریاریی و وردبینی بۆ دامەزراوە داراییە ئیسلامییەکان (AAOIFI) و بانکی گەشەپێدانی ئیسلامی (IDB) لە گرنگترین نمونەی ئەم مۆدێلەن کە ڕۆڵیان پەرەپێدانی ستاندارد و ڕێنماییە شەرعییەکانە کە تایبەتن بە چالاکی بانکە ئیسلامییەکان، هەروەها هەوڵدان بۆ یەکخستنی کاری چاودێری شەرعی.

٢,٣. دەستەی شەرعی ڕێکخراوەیی

دەستەی شەرعی لەم مۆدێلەیاندا لە فۆرمی ڕێکخراوێکدا دادەمەزرێت بەمەبەستی پێدان و پێشکەشکردنی ڕێنمایی تایبەت بەشێوەی سەرپەرشتیاری یاخود ڕاوێژکاری. لە گرنگترین ئەو ڕێکخراوانەش کە کاری دەستەی شەرعی دەکەن بریتین لە ئینستیوتی بانکی ئیسلامی و دڵنیایی(IIBI)، ئینستیوتی نێودەوڵەتی بۆ دارایی ئیسلامی(IIIF)، ئینستیوتی بانکی ئیسلامی و دارایی(IBFIM)، یەساری سنوردار(YL) هەروەها ڕێکخراوی مینهاج بۆ ڕاوێژکاری شەرعی(MSFA). ئەم ڕێکخراوانە بریتین لە چەند یەکەیەکی بزنس کە بەشێک نین لە هیچ دامەزراوەیەکی دارایی و بانکی تایبەت و مەبەستیان پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری ڕاوێژکاری هەمەلایەنەی بانکی و داراییە لە نێویاندا بابەتە شەرعییەکانی تایبەت بەکاری بانکی ئیسلامی.

### ڕۆڵ و کاریگەری دەستەی شەرعی

بێگومان دەستەی شەرعی ڕۆڵ و کاریگەری سەرەکی و بەرچاوی هەیە نەک تەنها لە پێشخستن و پەرەپێدانی کەرتی بانکی ئیسلامی، بەڵکو لەسەر ئاستی تەواوی سستمی ئابووری. بەڵام ئەوەی جێی باسە ئەوەیە کە کاریگەریی و ڕۆڵی ئەم دەستەیە ئەگۆڕێت لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تر کە هەریەکەیان پشت بە پێوەرێکی تایبەت دەبەستێت لە سروشت و مەوداو و ئاستی پابەندبوونی شەرعی. هەربۆیە توێژەران هاوڕا نین لەمبارەیەوە و هەریەکەیان بە جۆرێک گرنگییەکانی دەستەی شەرعی دەخەنەڕوو.

بەشێوەیەکی گشتی دەستەی شەرعی بە میکانزمێک وێنادەکرێت بۆ چاودێریکردنی کار و چالاکییەکانی سەرجەم ئەو دامەزراوانەی کە کاری بانکی ئیسلامی ئەنجامدەدەن بەمەبەستی پابەندکردنیان بە بنەما شەرعییەکان. بۆیە ئامانج لە دامەزراندنی دەستەی شەرعی لە بانکە ئیسلامییەکاندا بریتییە لە ڕێنماییکردنی ئەو بانکانە لە دارشتنی سیاسەتێکی ئابووری هاوسەنگ و یاساو ڕێنمایی پێویست و بەهێز پاڵپشت بە ئەحکامە شەرعییە پەیوەندیدارەکان بەمەبەستی ڕاستاندنی مامەڵە داراییەکان لەڕووە یاساییەکەیەوە، هەروەها ئامادەکردنی گرێبەستە یاساییەکان بەپێی پێوەرە شەرعییەکان. هەروەها دەستەی شەرعی ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە پابەندکردنی بەڕێوەبەرانی بانکە ئیسلامییەکان بەدارشتنی سیاسەتێکی ژمێریاری ورد بۆ دڵنیابوون لە ڕاستێتی ئەو هاوکێشە و شێوازانەی کە بەکارهاتوون لە دابەشکردن و بۆدانانی ئەو داهاتانەی بەدەستهاتوون لە مامەڵە داراییەکاندا، هەروەها دڵنیابوون لەو داهاتانەی بۆ زەکات تەرخانکراون کە بەشێوەیەکی دروست مامەڵەی لەگەڵدا کراوە وەک ئەرک و بەرپرسیارێتییەکی کۆمەڵایەتی گرنگ بەرامبەر کۆمەڵگە و بەشداربوونی بانکە ئیسلامییەکان.

ئەوەی کە باسکرا ڕۆڵ و کاریگەری دەستەی شەرعی بوو بەشێوەیەکی گشتی، بەڵام

گرنگە کە بەشێوەیەکی تایبەتی ئاماژە بە فەرمانەکانی ئەو دەستەیە بدرێت بەپێی جۆر و مۆدێلەکانی تا بەڕوونی لە کاریگەریی و ڕۆڵی دەستەی شەرعی تێبگەین. لەمبارەیەوە هەوڵدەدەین تیشک بخەینە سەر ڕۆڵی دەستەی شەرعی تەنها لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و نیشتیمانی. مەبەست لە ئاستی نێودەوڵەتی هەریەک لە ڕێکخراوەکانی ژمێریاریی و وردبینی بۆ دامەزراوە داراییە ئیسلامییەکان (AAOIFI) و بانکی گەشەپێدانی ئیسلامی (IDB)ن. ڕۆڵی ئەم ڕێکخراوانە بریتییە لە هەوڵدان بۆ یەکخستن و لێکنزیکردنەوەی تێڕوانینی دەستە شەرعییەکان بەئامانجی نەهێشتنی هەر ناچونییەکی و دژبەیەکییەک لەو ڕێنمایی و فەتوا و یاسا شەرعییانەی کە لەلایەن ئەو دەستانەوە دەردەچێت بەمەبەستی بەهێزکردنی متمانەی بەشداربووانی بانکە ئیسلامییەکان کە ڕۆڵی کارایان هەیە لە پەرەسەندن و پێشخستنیان. بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجەش جگە لە پێشخستنی ئەو خزمەتگوزارییانەی کە لەلایەن بانکە ئیسلامییەکانەوە پێشکەش دەکرێن، تێڕوانین بۆ هەموو ئەو کۆسپ و گرفتانە دەکەن کە ڕووبەڕووی بانکە ئیسلامییەکان دەبنەوە هەروەها پێداچونەوە و وردبینی بە هەموو ئەو ڕێنمایی و ستاندارد و ڕوونکردنەوە دەکەنەوە کە لەلایەن بانکە ئیسلامییەکانەوە دەردەچێت بەمەبەستی دڵنیابوون لەوەی کە هاوتایە لەگەڵ گرنگترین ئەحکامەکانی بنەما شەرعییە پەیوەندیدارەکان.

سەبارەت بە ڕۆڵی دەستەی شەرعی لەسەر ئاستی نیشتیمانی، گرنگە ئەوە بوترێت کە تەنها لە پێنج تەشریعدا ڕێگە دراوە بە دامەزراندنی دەستەی شەرعی لە بانکی ناوەندیدا ئەوانیش تەشریعاتی هەریەک لە وڵاتانی مالیزیا، ئەندەنوسیا، برۆنای، پاکستان و سودانن. بەشێوەیەکی بنەڕەتی دەستەی شەرعی لەسەر ئاستی نیشتیمانی وەک دەزگایەکی ڕێگەپێدراو ڕۆڵ دەبنێت لە دەرچوواندنی ڕێنماییە تایبەتەکانی کاری بانکی ئیسلامی و داڕشتنەوەی سیاسەتی نیشتیمانی سەبارەت بە کەرتی دارایی ئیسلامی. لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی کە لەسەرەوە باسکرا، ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە بەشێوەیەکی گشتی دەستەی شەرعی سێ ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت، کە ئەوانیش دەرچوواندنی ڕێنمایی و فەتوای تایبەت بەکاری بانکی ئیسلامی، سەرپەرشتیاریی و چاودێری کاری بانک و دامەزراوە داراییە ئیسلامییەکان و پێداچوونەوە و وردبینیکردنی ئەو خزمەتگوزارییانەی کە لەلایەن بانکە ئیسلامییەکانەوە پێشکەش دەکرێت.

### کۆسپ و گرفتەکانی سستمی چاودێری شەرعی

سازشکردن لە پابەندبوونی شەرعی لە کاروچالاکییەکانی بانکە ئیسلامییەکان مەترسیدارە و دامەزراوە داراییە ئیسلامییەکان ڕووبەڕووی چەندین کۆسپ و لەمپەر دەکاتەوە کە زۆرجار هۆکارن بۆ لەباربردن و داڕمانی ئەو دامەزراوانە. بێگومان

بەرپرسیاریێتی چارەسەرکردنی ئەو گرفتانەش بەشێوەیەکی سەرەکی لە ئەستۆی دەستەی چاودێری شەرعیدایە وەک گرنگترین و بنەڕەترین بەشی سستمی چاودێری شەرعی. سەرەکیترین ئەو کۆسپ و لەمپەرانە بریتین لە سەربەخۆیی دەستەی شەرعی، کارامەیی، خستنەڕوویی زانیارییەکان و شەفافیەت، هەروەها هاوتابوونی فەتواو بڕیارە شەرعییە پەیوەندیدارەکان کە هەوڵدراوە بابەتییانە تیشک بخرێتە سەریان و شیکار بکرێن.

**١. سەربەخۆیی دەستەی شەرعی**

سەربەخۆیی دەستەی شەرعی، وەک لە ڕێنماییەکانی ڕێکخراوی بۆردی خزمەتگوزاری دارایی ئیسلامی (IFSB) ئاماژەی پێدراوە، بریتییە لە توانای دەستەکە بۆ بەجێهێنانی دادوەرییەکی دادپەروەرانە پاش لێکۆڵینەوەیەکی ورد بۆ سەرجەم ئەو زانیارییانەی کە لەبەردەستن بێ ئەوەی بکەونە ژێر هیچ کاریگەرییەک لەلایەن بەڕێوەبەری بانک یاخود ڕاو بۆچونێکی دەرەکی نادروست. کەواتە کاریگەری نادروستی لایەنی دەرەکی بۆ سەر ئەندامانی دەستەی شەرعی لە گرنگترین هۆکارە زەقەکانی لاوازبوونی سەربەخۆیی ئەو دەستەیەن کە هۆکارێکیشن بۆ لاوازبوونی کۆی کەرتی بانکی ئیسلامی.

لەڕاستیدا هۆکارەکانی ئەم گرفتەش زۆرترین گفتوگۆی لەبارەوە کراوە کە توێژەران هەوڵیانداوە لەم ڕووەوە دەستنیشانی چارەسەرە گونجاوەکان بکەن بەمەبەستی بەرەوپێشخستنی زیاتری کەرتی بانکی ئیسلامی. لە گرنگترین هۆکارەکانیش بۆ لەقبوونی سەربەخۆیی دەستەی شەرعی وەک ئاماژەی پێدەکرێت ئەوەیە کە ئەندامانی دەستەی شەرعی شایستە داراییەکانیان لەلایەن ئەو دامەزراوە داراییە ئیسلامییانەوە بەدەست دەگات کە کاری تێدا دەکەن، بۆیە ئەمەش ئەگەرێکی بەهێزە بۆ کەوتنە ژێر کاریگەری نادروستی بەڕێوەبەرانی ئەو دامەزراوانە و خاوەن پشکەکانیان کە ببێتە هۆکاری داننان بە زۆرێک لە بڕیار و بەرژەوەندی نایاسایی و گومانلێکراو. لەبەر ئەم هۆکارە پێویستە لەڕووی یاساییەوە بایەخی زیاتر بە ڕەوش و پایەی ئەندامانی دەستەی شەرعی بدرێت بەوەی کە بەرپرسیاریی و دەسەڵاتی ئەندامانی ئەو دەستەیە بەڕوونی دیاری بکرێت بەتایبەتی لە گرێبەستی دامەزراندنی ئەو دامەزراوانەدا(Articles of Association) بەجۆرێک وەک دەستەیەکی بەدەسەڵات بناسرێنێت و ڕەچاوی تەواوی پلە و پایەیان بکرێت، کە نەکەونە ژێر هیچ کاریگەریەکی نادروست و گوماناوی.

**٢. کارامەیی دژبەیەکی بەرژەوەندییەکان**

مەبەست لە کارامەیی ئاستی زانیاریی و پسپۆری ئەو ئەندامانەن کە لە دەستەی شەرعیدا کار دەکەن، کە پێویستە شارەزایی تەواویان هەبێت لەو کایانەی کە پەیوەستن بەکاروباری بەڕێوەبردنی ئەو دامەزراوە داراییانەی کە کاری تێدا دەکەن. گرنگترین ئەو بوار و پسپۆڕییانەش بریتین لە زانستە ئیسلامییەکان و دارایی و ئابووریی و یاسا. نەبوونی

پرۆگرامی تایبەت بۆ پێگەیاندنی کەسانی شارەزا زۆرجار گرفتی سەرەکین بۆ بوونی دەستەیەکی شەرعی کارامە و لێهاتوو، بۆیە سەرباری بوونی ئەو پسپۆڕییانە گرنگە ئەندامانی ئەو دەستانە بەردەوام لە هەوڵی نوێگەری پسۆڕییەکانیاندا بن بەتایبەت لەڕێی ڕاهێنان و خولی بەردەوام بۆ بەدەسهێنانی ئەزموونی پراکتیکی لەو بوارانەی کە تایبەتن بەکاری بانکی ئیسلامی لە هەموو ڕەهەندە جۆراوجۆرەکانی وەک شەرعی، دارایی، ئابووریی و یاسایی.

**٣. شەفافیەت**

شەفافیەت یاخود ڕوونی لە زانیارییەکان خەسڵەتێکی گرنگ و بەبایەخی سستمی چاودێری شەرعییە. مەبەست لەم خەسڵەتە هەروەک ڕێکخراوی بۆردی خزمەتگوزاری دارایی ئیسلامی (IFSB) لە ڕێنماییەکانیدا بە ئاشکرا ئاماژەی پێداوە، ئەو کەشەیە کە سەرجەم زانیارییە باوەڕپێکراوەکان ڕوون و لەبەردەست بن لەکاتی پێویستدا بۆ لایەنی پەیوەندیدار بەتایبەت بۆ بازاڕ بەشێوەیەکی گشتی و، هەروەها بەشداربووانی دامەزراوە داراییە ئیسلامییەکان. لەڕاستیدا ئاشکرایی ئەم زانیارییانە جێی بایەخن بۆ ڕەواندنەوە و کەمکردنەوەی زانیاری ناچوونییەک و گوماناوی بەتایبەت لە بازاڕە داراییەکاندا کە کار لە متمانەی بەشداربووانی دەکات. زانیارییەکان زیاتر لەڕێی ڕاپۆرتە شەرعییەکانەوە دەخرێنە ڕوو بەشێوەیەکی ڕێکخراو کە پێویستە یەکانگیر بێت لەگەڵ مەرجە ستانداردە جیهانییەکان و بنەما شەرعییە پەیوەندیدارەکان. بۆیە هەر ناڕوونییەک یاخود کەمی زانیاری دروست لەسەر چالاکی بانک و سەرجەم ئەو دامەزراوە داراییانەی کە کاری بانکی ئیسلامی جێبەجێ دەکەن ئەنجامی مەترسیداریان دەبێت بۆ سەر متمانەی کۆی سستمی بانکی ئیسلامی.

**٤. هاوتایی**

بەهۆی زۆری پەیرەوکردن و پراکتیزەکردنی کاری بانکی ئیسلامی و بوونی ئەندازەیەکی زۆر لە دژبەیەکی فەتوا و بۆچوون و ڕوونکردنەوە شەرعییەکان زۆرجار متمانەی بەشداربووانی دامەزراوە داراییەکان بە کەرتی بانکی ئیسلامی لاواز دەکات. لەم ڕووەوە ئەنجومەنی گشتی بانکە ئیسلامییەکان و دامەزراوە داراییەکان (CIBAFI) لە ڕاپۆرتێکدا ئاماژە بەئەندازەی ئەو ناهاوتاییە ئەدات و ئاشکرای دەکات کە بەشێک لەو بۆچوونە شەرعییانەی لەلایەن دەستەی شەرعی بانکە ئیسلامییەکانەوە دەردەچێت ناچوونییەک و ناهاوتان کە ئەمەش ڕاڕایی و بێمتمانەیی لای بەکارهێنەران و بەشداربووانی بانکە ئیسلامییەکان دروستکردووە. بۆیە گرنگە کە هەوڵی بەردەوام هەبێت بۆ یەکخستنی ڕاو بۆچوونە شەرعییەکان بەتایبەتی لەلایەن ئەو ڕێکخراو و ئەنجومەنە پسپۆڕانەی کە کار لەسەر کار و چالاکی بانکی ئیسلامی دەکەن بۆ نزیکبوونەوەی زیاتر و هاندان و پشتگیری هاوتایی و تەریبی بۆچوونە شەرعییەکان.

## دەرئەنجام

سستمی چاودێری دارایی سەرەڕای ئەوەی کە سستمێکە بۆ سەرپەرشتیکردن و چاودێریکردنی کار و چالاکی بانکە ئیسلامییەکان، لەهەمانکاتدا سستمێکی ئەخلاقییە کار بۆ بەدیهێنانی دادپەروەریی و بەها بەنرخەکانی بواری دارایی و بازرگانی دەکات. بۆیە بوونی سستمێکی چاودێری شەرعی کاریگەر هۆکارە بۆ فەراهەمکردنی کەشێکی تەندروست و گونجاو بۆ پەیڕەوکردنی کاری بانکی ئیسلامی و ڕەخساندنی زەمینەیەکی لەبار بۆ گەشەندن و پێشخستنی کەرتی بانکی ئیسلامی کە ڕۆڵی گرنگ و سەرەکی هەیە لە ژیاندنەوەی کۆی سستمی ئابووری ئیسلامی. بۆیە بەهەند وەرنەگرتنی کاریگەرییەکانی ئەو سستمە چاودێرییە کەرتی بانکی ئیسلامی ڕووبەڕووی ڕیسک و مەترسی ڕاستەقینە دەکاتەوە کە لەئەنجامدا بانک و دامەزراوە داراییە ئیسلامییەکان دوچاری دارمان و لەناوچوون دەکاتەوە وەک ئەو نموونانەی کە پێشتر ئاماژەیان پێدرا.

لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی کە ئاماژەی پێدرا گرنگە پشگیری سستمی چاودێری شەرعی بکرێت لەڕێی بوونی یاسایەکی بانکی تۆکمە کە بەهۆیەوە پێگە و دەسەڵاتی دەستەی شەرعی بەهێزبکرێت وەک بەشێکی سەرەکی و گرنگی سستمی چاودێری شەرعی. بۆ ئەم مەبەستە پێویستە بایەخ بەچەند پۆینتێکی گرنگ بدرێت، لەوانەش ناساندنی دەستەی شەرعی وەک یەکەیەکی سەربەخۆی خاوەن دەسەڵات بەجۆرێک کە لە بڕیارەکانیدا نەکەوێتە ژێر کاریگەری بەرژەوەندی هیچ لایەنکی تری دەرەکی. هەروەها گرنگە کە کار و فەرمانی ئەندامانی دەستەی شەرعی بە جۆرێک ڕێکبخرێن کە نەبنە لایەن لە هیچ بەرژەوەندییەکدا، بۆیە گرنگە کە یاسا ڕێگربێت لە دامەزراندنی ئەندامانی دەستەی شەرعی زیاتر لە یەک دامەزراوەی دارایی ئیسلامی، چونکە کاریگەری نەرێنی دەبێت لە سەرهەڵدانی ئەو کۆسپانەی کە دێنە ڕێی بانکە ئیسلامییەکان بەتایبەتی لەکاتی دژیەکی بەرژەوەندییەکان. دامەزراندنی دەستەی شەرعی لەسەر ئاستی نیشتیمانی، واتە بوونی دەستەی شەرعی سەربەخۆ لە بانکی ناوەندی لە گرنگترین ئەو لایەنانەیە کە پێویستە بە یاسا ڕێکبخرێت، هەروەها دەسەڵاتی تەواوی پێببەخشرێت لە یەکلاییکردنەوەی ئەو کۆسپانەی کە دێنە ڕێی بانکە ئیسلامییەکان. بوونی دەستەی شەرعی بەدەسەڵات لەسەر ئاستی نیشتیمانی ڕۆڵ و بایەخی زۆری هەیە بەتایبەت لە یەکخستنی ڕاوبۆچوونە شەرعییە جیاوازەکان و بەهێزکردنی متمانەی بەشداربووانی بانکە ئیسلامییەکان.

بەشێوەیەکی گشتی ئەوەی تێبینی دەکەین لەوەی باسکرا، ئەوەیە کە سستمی چاودێری شەرعی پێویستی بە بەرەوپێشچونی زیاتر هەیە بەتایبەتی گرنگە کە پەیکەری چاودێری شەرعی چاکسازی ڕیشەیی تێدا ئەنجام بدرێت بەمەبەستی بەهێزکردنی کاری چاودێریی و سەرپەرشتیاریکردنی کارە بانکیی و بازرگانییە ئیسلامییەکان. هەروەها ڕێکخراوە تایبەتەکانی بواری چاودێری شەرعی ڕۆڵی گرنگ دەگێڕن بەتایبەت لە هاندانی یەکخستنی ڕاوبۆچوونە شەرعیەکان لەڕێی ئەو ستاندارد و ڕێنماییە تایبەتانەی کە دەریدەکەن.

# سەرچاوەکان


- AAOIFI, Accounting, Auditing and Governance Standards for Islamic Financial Institutions, Governance Standard for Islamic Financial Institutions No. 1, 4.
- Abdul Karim Zaidan, Al-Madkhal Ldraseh Al-Shariah Al-Islamieah, 2nd Edition 1966, Baghdad
- Abdussalam Mahmoud Abu Tapanjeh, "Corporate Governance from the Islamic Perspective: A Comparative Analysis with OECD Principles", Critical Perspectives on Accounting, v. 20, pp 558. Retrieved from www.elsevier.com/locate/cpa
- Ahcene Lahsasna and Syed Othman Alhabshi, Shariah Governance in Islamic Financial Institutions

Aishath Muneeza, "An Insight into the Difference Between Corporate Governance of Conventional Banks and Islamic Banks", Malayan Law Journal, Vol 1 2013 page 2,<

- Azam Abdelhakeem Khalid, Hasnah Haron, Adel M. Sarea and Tajul Ariffin Masron, "The Role of Shariah Supervisory Board on Internal Shariah Audit Effectiveness: Evidence From Bahrain", Academy of Accounting and Financial Studies Journal, Volume 22, Issue 5, 2018
- Donald Nordberg, Corporate Governance Principles and Issues, (SAGE Publication Ltd, London, first published 2011)
- Dr. Rusni Hassan, Corporate Governance Practice in Islamic Financial Institutions, (Kuala Lumpur, IBFIM, 1st Edition, 2014)
- IFSB, Guiding Principles on Shariah System for Institutions Offering Islamic Financial Services, November 2018
- Islamic Financial Service Board (IFSB-10) standard, Guiding Principles on Sharia
- Jill Solomon, Corporate Governance and Accountability, (West Sussex, UK: John Wiley & Sons, second edition 2007)
- Zulkifli Hasan "Regulatory Framework of Shariah Governance System in Malaysia, GCC Countries and the UK". Kyoto Bulletin of Islamic Area Studies, 3-2 March 2010
- Zulkifli Hasan, Shariah Governance in Islamic Banks, (Edinburg, UK: University Press, 2012)



د.یونس ئەحمەد

# بۆچی گەشەی ئابووری خۆشگوزەرانی ڕاستەقینە بۆ هاوڵاتیان بەرهەم ناهێنێت؟

**پێشەکی:**

ئاشكرایە مرۆڤ لە سەرەتایی دروستبوونییەوە لە هەوڵدایە بۆ گەیشتن بە ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی، بەڵگە نەویستیشە کە سەرجەم حكومەت و دەزگا و ناوەندە باڵا دەستەكان لە هەوڵدان و بانگەشە دەكەن (گەر بەڕووكەشیش بێت) بۆ بەدیهێنانی گەشەی ئابووریی و دواتر هێنانەدی خۆشگوزەرانی بۆ هاوڵاتیان، بەڵام بەهۆی گرفت و قەیران و گۆڕانكارییە ناوخۆیی و نێودەوڵەتییە هەمە جۆرەكان (ئابووری، ڕامیاری، ڕۆشنبیریی و كلتووری، كۆمەڵایەتی و ژینگەیی... هتد) بەردەوام ئاستەنگ دروستبووە لە بەردەم بەدیهێنانی ئەو ئامانجە كە بریتییە لە بەدیهێنانی گەشەی ئابووری پێویست و هێنانەی خۆشگوزەرانی هاوڵاتیان، یاخود گەر هاوڵاتیان و تاكەكانی كۆمەڵگە لە قۆناغێك لە قۆناغەكان گەیشتبێتنە ڕادە و ئاستی خوشگوزەرانی، ئەوا نەتوانراوە پارێزگاری تەواو لەو خۆشگوزەرانییە بكرێت، بەواتایەكی تر خۆشگوزەرانی ڕاستەقینە بەدی نەهاتووە یان زۆری نەخایاندووە، چونكە خۆشگوزەرانی ڕاستەقینە پێویستە سیفەتی بەردەوامی تێدا بێت و سەرجەم بوارە ڕۆحیی و ماددییەكان بگرێتەوە.

هاوکات مەرجی بەردەوامبوون و بەدیهاتنی خۆشگوزەرانی هاوڵاتیان تەنها پەیوەست نییە بەئاستی گەشەی ئابووری، بەڵکو زیاتر پەیوەستە بەشێوازی دادپەروەربوون لە دابەشکردنی بەروبوومی ئەو گەشەی ئابوورییەی کە هاتووەتە دی، بەتایبەت لە بواری زیادکردنی داهاتی ڕاستەقینەی تاکەکەس. بۆ باسکردنی ئەم بابەتە بەشێوەیەکی فراوانتر سەرەتا پێویست دەکات شیکردنەوەیەکی زانستییانە بکەین بۆ هەندێک چەمک و بنەما کە بەشێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ پەیوەستن بە خۆشگوزەرانی ڕاستەقینەی هاوڵاتیانەوە، لەوانە:

**یەکەم: چەمکی گەشەی ئابووری (النمو الاقتصادی):**

بەپێی قۆناغە مێژووییەکان  مانا و واتای گەشەکردن بەردەوام لە گۆڕاندایە بەهۆی جیاوازی ئامانجەکانی گەشەکردنی هەر قۆناغێک لە قۆناغەکان ئەمە لەلایەک، جیاوازی کێشە و گرفت و قەیرانەکان لەلایەکی ترەوە. لەڕاستیدا جیاوازی زۆر بنەڕەتی هەیە لە ناساندن و پێوانەکردنی گەشەی ئابووری بە جیاوازی ڕوانینی ئابووری ناسەکان و قۆناغە مێژووییەکانی گەشەکردن، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی و بەشێوەیەکی سادە گەشەی ئابووری بریتییە لە «زیادبوونێکی ڕاستەقینەی بەرهەم و داهاتی گشتی نەتەوەیی بەشێوەیەک کە زیادبوونێکی بەردەوام لە پشکی تاکەکەس بێنێتەدی».

لەم چەمکەوە بۆمان دەردەکەوێت کە پرۆسەی گەشەی ئابووری تەنها زیادبوونی داهاتی گشتی نەتەوەیی ناگرێتەوە، هاوکات پێویست دەکات داهاتی ڕاستەقینەی تاکەکەس زیاد بکات، ئەمەش لەکاتێکدا دێتەدی کە ڕێژەی گەشەی ئابووری گەورەتربێت لە ڕێژەی گەشەی دانیشتوان و ئەگەر بەپێچەوانەوە گەشەی دانیشتوان گەورەتربێت لە گەشەی ئابووری ئەوا سەرەڕای زیادبوونی داهاتی گشتی نەتەوەیی، بەڵام ناتوانرێت بوترێت گەشەی ڕاستەقینە لە ئابووری وڵاتدا ڕوویداوە، چونکە لەوکاتەدا داهاتی تاکەکەس زیاد ناکات، لەهەمانکات دەبێت ئەو زیادبوونەی ڕوودەدات لە داهاتی تاکەکەس، زیادبوونێکی بەردەوام و ڕاستەقینە بێت ئەمەش کاتێک دێتەدی کە دادپەروەری هەبێت لە دابەشکردنی داهاتی وڵات بەپێ ئەرک و کار و پیشەکان بۆ سەرجەم هاوڵاتیان.

لێرەدا دەتوانین ئاماژە بەوە بکەین کە گەشەی ئابووری زیاتر جەخت دەکاتە سەر لایەنی قەبارەی داهاتی نەتەوەیی و داهاتی تاکەکەس یاخود بایەخ بەو شمەک و خزمەتگوزارییانە دەدات کە هاوڵاتیان بەدەستی دەهێنن لە ڕێگەی داهات و خەرجییەکانیانەوە و، چەمکی گەشەی ئابووری کەمتر بایەخ دەدات بەجۆر و کوالیتی شمەک و خزمەتگوزارییەکان، لەهەمانکاتدا بایەخ نادات بە لایەنی دەروونی و ئاسوودەی ڕۆحی هاوڵاتیان.

ئەوەی جێ ئاماژەیە کە لەم ساڵانەی دواییدا چەمکی نوێ هاتووەتە کایەوە بۆ

ناساندنی گەشەی ئابووری، ئەویش بە ڕەچاوکردنی خۆشگوزەرانی هاوڵاتیان، وەکو لە ڕاپۆرتی جیهانی ژینگە و پەرەپێدان پێناسەی پەرەپێدان و گەشەپێدانی ئابووری بەردەوام دەکات بە «پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی ئێستای هاوڵاتیان بەبێ ئەوەی دەرامەتە سروشتییەکان لەناو ببرێت یاخود بەفیڕۆ بدرێت، و بێ ئەوەی زیان بگەیەنرێت بە ژینگە و پێداویستییەکانی نەوەی داهاتوو». هاوکات ڕێکخراوی هاوکاریی و گەشەپێدان پێناسەی گەشەی ئابووری بەردەوام دەکەن بەوەی کە بریتییە لە«گەشەپێدانی مرۆڤـ لە ڕێگەی مرۆڤەوە و لەپێناوی مرۆڤـ».

**دووەم: بنەما و سەرچاوەکانی بەدیهێنانی گەشەی ئابووری**

**(الاسس والمصادر تحقيق النمو الاقتصادي):**

بێگومان گەشەی ئابووری لە وڵاتێکەوە بۆ ووڵاتێکی تر جیاوازە، لەیەک وڵاتیشیدا لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر. بەگشتی تیۆرەکانی گەشەی ئابووری دوو جۆری سەرەکی دەگرنەوە، یەکەمیان ئەو تیۆرانەن کە باس لە گەشەکردن و بەدیهێنانی سەقامگیری ئابووری دەکەن لە وڵاتە پێشکەوتووەکان، دووەمیان ئەو تیۆرانەن کە باس لە بەدیهێنانی گەشەکردن و پەرەپێدانی ئابووری دەکەن لە وڵاتانی دواکەوتوو.

لەڕاستیدا نوسینەکانی تایبەت بەگەشەی ئابووری دەگەڕێنەوە بۆ مێژووی زۆر کۆن، سەرەتا ئابووریناسە کلاسیکییەکان لە سەدەی هەژدە و نۆزدەوە دەستیان بە گفتوگۆ کردووە لەمبارەیەوە، باسی هەنگاوەکانی گەشەکردن و پێشکەوتنیان کردووە بەتایبەت لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازی لە وڵاتانی ئەوروپا، دواتر کۆمەڵە تیۆرێکی نوێ و جۆراوجۆر پەیدابوون کە باسیان لە فاکتەر و بنەما ناوخۆیی و دەرەکییەکانی گەشەکردن و پەرەپێدانی ئابووری دەکرد، هەربۆیە لێرەدا ئاماژە دەکەین بە هەندێک لە ئابووریناسەکان و خستنەڕووی دید و تێروانینەکانیان دەربارەی گەشەی ئابووریی و بنەماکانی:

ئابووریناسی بەناوبانگ (ئادەم سیمث)* کە باسی ئەوە دەکات گەشەی ئابووری پەیوەستە بەڕادەی کەڵەکەبوونی سەرمایە و وەبەرهێنانەوە، لەهەمانکاتدا باسی ئەوە دەکات کە وەبەرهێنان بەندە بە قەبارەی داهات و ڕادەی پاشەکەوت. یەکێکی تر لە ئابووریناسە بەناوبانگەکان (دایڤد ڕیکاردۆ)** پێیوایە قەبارەی داهات و چۆنێتی دابەشکردنی داهات و خواستی کاریگەر لە گرنگترین فاکتەرەکانی گەشەی ئابوورین، لەهەمانکاتدا گەشەکردن و پەرەپێدانی ئابووری پرۆسەیەکی پلەبەپلە و قۆناغ بە قۆناغ و کەڵەکە بووە.

یەکێکی تر لە ئابووریناسە دیارەکان(مالتوس/ مالتس)*** لە باسی بابەتی گەشەی ئابووریدا بایەخ دەدات بەخواستی کاریگەر (الطلب الفعال) و زیادبوونی ژمارەی

دانیشتووان و ڕادەی پاشەکەوت، لەهەمانکاتدا لە ڕۆڵی خاوەن زەوییەکان کەمناکاتەوە لە پرۆسەی گەشەکردندا. ئەگەر تەماشایەکی خێرای مێژووی گەشەی ئابووری بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە پێش سەرهەڵدانی قەیرانی داکشانەوەی جیهانی گەشەیەکی ئابووری خێرا ڕوویداوە، بەڵام دوای دروستبوونی قەیرانی داکشانەوەی گەورەی جیهانی لە نێوان ساڵانی (١٩٢٩-١٩٣٣) ئەم گەشەیە بەرەو سستی و لاوازی ڕۆیشتووە هەتاکو ساڵی ١٩٣٦، کە ئابووریناسی بەناوبانگ (کینز) بایەخیدا بەدوو تەوەری زۆر گرنگ ئەوانیش: گەشەی ئابووری و ئارامی و سەقامگیری ئابووری بوون. هەر لەمیانەی بیردۆزی (کینز)ەوە ئابووریناسان (هارود و دومار) باس لە گەشەی ئابووری دەکەن بەوەی کە پەیوەندییەکی زۆر بەهێز هەیە لە نێوان گەشەی ئابووریی و ڕێژەی بێکاری ئەمە لەلایەک، پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لە نێوان گەشەی ئابووریی و پێداویستییەکانی وەبەرهێنان لەلایەکی ترەوە. کەواتە بە پشتبەستن بەڕای ئەو ئابووریناسانە و بیردۆزەکانی تایبەت بە گەشەی ئابووری، دەتوانین بڵێین بەگشتی گەشەی ئابووری پشت بە چوار فاکتەری سەرەکی دەبەستێت کە بریتین لە:

١. دانیشتوان و کار و کرێکار: دروستبوونی گۆڕانکاری لە کار و شێوازی کارکردن و ئاڵوگۆڕکردنی هۆکارەکانی بەرهەمهێنان بەشێوەیەکی ئاسان، هەروەها گەڕان بەدوای هێزی کاری کەم تێچوو و پڕ داهات.

٢. دەرامەتی سروشتی: هەبوونی دەرامەتی سروشتی زۆر و جۆراو جۆرو ڕادەی سوودوەرگرتن لێیان و باش بەڕێوەبردنیان بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی بژێویی و بەدیهێنانی گەشەی ئابووری، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە زۆرینەی ئابووری ناسەکان وا دەڕوانن کە ئەم فاکتەرە فاکتەری سەرەکی گەشەی ئابووری نییە، بەڵکو تەنها فاکتەرێکی یارمەتیدەرە، چونکە وڵاتێکی وەک یابان کە زۆر پێشکەوتووە و خاوەنی گەشەیەکی ئابووری تەندروستە کەچی خاوەنی ڕێژەیەکی زۆرکەمە لە دەرامەتی سروشتی و زۆرینەی زۆری پێداویستییەکانی وزە لە دەرەوەی وڵات هاوردە دەکات بۆ بەڕێوەبردن و کارپێکردنی پیشەسازییە ناوخۆییەکانی.

هاوکات لە ڕاپۆرتێکی کەناڵی (Echo عەرەبی) ئاماژە بەوە دراوە کە وڵاتی هۆڵەندا خاوەنی تەنها (دوو ملیۆن مانگایە) جگەلە پڕکردنەوەی پێداویستی گۆشت و شیرەمەنی ناوخۆیی، بەرهەمی زیادەی هەنارده دەکات بۆ وڵاتانی دەرەوە، داهاتی ساڵانەی تەنها لە شیرەمەنی دەگاتە (١٤ ملیار دۆلار)، لەکاتێکدا وڵاتی سودان خاوەنی هەشت ملیۆن مانگایە و خاوەنی لە وەرگای زۆرە کە بە چوار هێندەی لە وەرگاکانی وڵاتی هۆڵەندە بەراورد دەکرێت، ئەوەی جێ تێڕامانە وڵاتی سودان ساڵانە بە بڕی (١٠٠) ملیۆن دۆلار بەرهەمی شیرەمەنی لە وڵاتی هۆڵەندا دەکرێت و هاوردەی دەکات. هەربۆیە ڕاپۆرتەکە

ئاماژە بەوە دەدات کە هونەری بەڕێوەبردن گرنگترە لە خاوەندارێتی کەرەسەکان.

٣. پاشەکەوت و سەرمایە و کەڵەکەبوونی سەرمایە و وەربەرهێنان: زیادبوونی قەبارەی بەرهەمهێنان هاوتا لەگەڵ زیادبوونی داهاتی هاوڵاتیان لە ماوە و کاتێکی دیاریکراو بە بەراورد بە ڕابردوو.

بەڵام ئەوەی پێویستە ئاماژەی پێبدرێت بەگشتی بیردۆزە کۆنەکان لە پرۆسەی گەشەی ئابووریدا جەختیان کردووەتە سەر کۆمەڵێک بنەما (کار، کەڵەکەبوونی سەرمایە، پاشەکەوت، وەبەرهێنان... هتد)، بەڵام لە بیردۆزە نوێیەکانی گەشەی ئابووریدا جگە لەو فاکتەرانە بایەخدراوە بەهەندێک بنەما و فاکتەری زۆرگرنگ کە پێشتر بیردۆزە کۆنەکان وەک پێویست ئاماژەیان پێنەدابوو، لەوانە:

١. بایەخدان و پشتبەستن بە وەبەرهێنانی سەرمایەی مرۆیی وەک فاکتەری گەشەی ئابووری.

٢. چاکسازیکردن لە وەبەرهێناندا (لەڕووی ژینگەیی و ڕامیارییەوە)، وەک فاکتەری گەشەی ئابووری.

٣. پشتبەستن بەتوێژینەوەی زانستی وەک فاکتەری گەشەی ئابووری.

٤. پشتبەستن بە زانست و زانیاریی و تەکنەلۆجیای پێشکەوتوو وەک فاکتەری گەشەی ئابووری. پێشکەوتنی ئامێر و تەکنەلۆجیا بریتییە لە خێرایی پەرەپێدانی زانست و زانیاریی و خێرای جێبەجێکردن و پراکتیزەکردنی لەپێناو باشکردنی ئاستی بژێویی و بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی بۆ هاوڵاتیان.

**سێیەم: پێنوێنی و پێوەرەکانی گەشەی ئابووری ڕاستەقینە(مؤشر النمو الاقتصادي):**

لەڕاستیدا پێوەری زۆر و جۆراوجۆر هەیە بۆ ئەژمارکردنی گەشەی ئابووری هەر وڵات و ناوچەیەک، بەڵام بەگشتی (پێوەری داهاتی گشتی نەتەوەیی و پێوەری داهاتی ڕاستەقینەی هاوڵاتیان) لە دیارترین و گونجاوترینی پێوەرەکانن*، بەڵام بەهۆی «جیاوازی تێچوونی بژێویی و ناهاوتایی بەها و نرخی دراو لە نێوان وڵاتان و جیاوازی ڕامیاری ئابووری وڵاتان و جیاوازی قەبارە و کوالێتی و سەرچاوەی شمەک و خزمەتگوزارییەکان و بەرزونزمی ئاستی گشتی نرخەکان»، بەرزی ئاستی داهاتی نەتەوەیی و زۆری قەبارەی داهاتی تاکەس نابنە پێوەری ڕاستەقینەی پێوانەکردنی خۆشگوزەرانی هاوڵاتیان، کەواتە گەر بنەما و سەرچاوەکانی گەشەی ئابووریی و پێوەرەکانی تەندروست نەبن ئەوا سەرەڕای دروستبوونی گۆڕانکاری پۆزەتیڤانە لە ئابووری نەتەوەیی، بەڵام خۆشگوزەرانی هاوڵاتیان لە قۆناغەکانی دواوەی ئەو گەشەکردنە دەبێت.

هەربۆیە ئامانجی سەرەکی و ڕاستەقینەی گەشەی ئابووری گەورەترە لەوەی کە کورت بکرێتەوە لە (زیادکردنی داهاتی نەتەوەیی و بەرزکردنەوەی پشکی تاک لەو داهاتە)،

بەڵکو ئامانجی گەشەی ئابووری بریتییە لە دروستکردنی گەشەی سەرمایەی مرۆیی و بەرەوپێشبردنی توانای بەرهەمهێنان و کارکردن لەپێناو بەکارهێنانێکی دروست و ناوازە بۆ دەرامەتە سروشتی و ئابووری و داراییەکان و دواتر بەرزکردنەوەی ئاستی بژێویی و خۆشگوزەرانی هاوڵاتیان کە خۆی دەبینێتەوە لە «بەرزکردنەوەی ئاستی داهات و پێشکەشکردنی چاودێری تەندروستی و باشکردنی ژینگەی کارکردن و بەدیهێنانی ئارامی ڕامیاری»، هاوکات گەشەی ئابووری ڕێخۆشکەر دەبێت بۆ حکومەت و یارمەتی دەدات کە بتوانێت ڕێگە و هۆکاری کاریگەر بگرێتەبەر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەژاریی و ڕێگریکردن لە پیسبوومی ژینگە و باشکردن چەندێتی و چۆنێتی لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری گشتی.

**چوارەم: خۆشگوزەرانی تاک و هاوڵاتی (رفاهية مجتمع والفرد):**

دەنگوباسی بەردەوامی میدیا بەناوبانگە جیهانییەکان و خاوەن بڕیارە ئابوورییی و ڕامیارییەکان بریتین لە بەدیهێنانی گەشەی ئابووریی و هێنانەکایەی خۆشگوزەرانی تاک و کۆمەڵگە، بەڵام ئەوەی جێ پرسیار و شرۆڤەکردنە ئایا گەشەی ئابووری دەبێتە هۆی بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی بەردەوام بۆ هاووڵاتیان؟

لەڕاستیدا، بازاڕە ناوخۆیی و نێودەوڵەتییەکان بەهۆی گەشەی ئابووریی و بازرگانییەوە پڕن  لە شمەک و کاڵای جۆراوجۆر، ئەمەش هۆکاری بەرزبوونەوەی بەرهەم و داهاتی گشتی نەتەوەییە، بەڵام مانای تەواوەتی بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی هاوڵاتیان ناگەیەنێت، بەڵکو خۆشگوزەرانی هاوڵاتیان زیاتر پەیوەستە بەتوانای کڕین و سەرچاوەی پەیداکردنی داهات و ئاست و ڕادەی بەردەوامی خۆشگوزەرانییەکە و ئاست و قەبارەی ئاسوودەبوونی دەروونی هاوڵاتیان. لەڕاستیدا زیادبوونی داهاتی نەتەوەیی پێوەری پێشکەوتن و گەشەی ئابوورییە، بەڵام پێوەری خۆشگوزەرانی نییە، چونکە پێوەری داهات و بەرهەمی نەتەوەیی و تاک باس لە لایەنە نێگەتیڤەکانی زیادبوون و کەڵەکەبوونی بەرهەم ناکات بەتایبەت (پیسبوونی ژینگە و بەهەند وەرنەگرتنی داواکاریی و پێداویستییەکانی نەوەی داهاتوو، یاخود لەدەستدانی هەلی کار بەتایبەت بۆ خێزانە کەم دەست و کەم سەرماییەکان، یان گەر بەرهەمهێنانەکان بەهۆی تەکنەلۆجیای پێشکەوتووەوە بێت و هاوتا نەبێت لەگەڵ ڕەخساندنی هەلی کار زیاتر و جیاوازتر، لەڕاستیدا ئەمەش سیمای دیاری زۆرێک لە وڵاتانی دواکەوتوو و تازە گەشەسەندووە.

هەندێک لە وڵاتان سەرەڕای بەدیهێنانی گەشەی ئابووری پێویست، بەڵام نەیانتوانیوە زۆرێک لە پێداویستییە ناوخۆییەکانی هاوڵاتیانەکانیان پربکەنەوە و نەیانتوانیوە سوود

لە سەرچاوە و دەرامەتە ناوخۆییەکان ببینن و بیکەنە بنەمای ئەو گەشەیە. بەواتایەکی تر بەدیهاتنی گەشەی ئابوورییەکەیان لەسەر حیسابی پێداویستییەکانی هاوڵاتیانە نەک بۆ دابینکردن و پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی هاوڵاتیان، هەربۆیە هەندێک لە وڵاتان و ئابووریناسە نوێیەکان داوای کەمکردنەوەی گەشەی ئابووری دەکەن مادام خۆشگوزەرانی هاوڵاتیانی لێ نەهاتووەتەدی و پیسبوونی ژینگە و گرفتی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی لێ هاتووەتە کایەوە*. بەڵام ئابووریناسە نوێیەکان پێیانوایە ئابووری بەشێکە لە جیهان و ناکرێت هیچ شتێک گەشە بکات بە بەردەوامی و بێکۆتا مادام زەویی و سروشتی زەوی سنوردارە، هەر بۆیە ئەو ئابووریناسانە لەگەڵ ئەوەدان کە پێویستە گەشەی ئابووری بەدی بهێنرێت لە ڕێگەی فراوانکردنی سێکتەرە گشتییەکان و پێویستە هاوسەنگی ڕابگیرێت لە نێوان دەوڵەمەندبوونی ماددیی و خۆشگوزەرانی مەعنەوی (هەروەها دەڵێن مەرج نییە ئەوەی خاوەنی سێ ئۆتۆمبێل بێت خۆشگوزەران تربێ لەوەی کە تەنها خاوەنی یەک ئۆتۆمبێلە).

> **خۆشگوزەرانی هاوڵاتیان زیاتر پەیوەستە بەتوانای کڕین و سەرچاوەی پەیداکردنی داهات و ئاست و ڕادەی بەردەوامی خۆشگوزەرانییەکە و ئاست و قەبارەی ئاسوودەبوونی دەروونی هاوڵاتیان.**

هاوکات بەشێک لە ڕێکخراوە جیهانییەکان و بەتایبەت ڕێکخراوە ژینگەیی و مرۆڤدۆستەکان، بەهۆی گەرمبوونی بەردەوامی گۆی زەویی و پیسبوونی ژینگە و کەمبوونەوەی ئاوی سەرزەویی و ژێرزەوی، داوای سنوردارکردنی گەشەی ئابووری جیهانی دەکەن، ئەوانە فشاری زۆر دەخەنە سەر حکومەتەکان و بانگەشەی پیادەکردنی ئابووری سەوز (الاقتصاد الاخضر) دەکەن بۆ دەسەبەرکردنی دادوەری کۆمەڵایەتی و پاراستنی ژینگە و بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی ڕاستەقینە بۆ تاک و کۆمەڵگە بۆ نەوەکانی ئێستا و داهاتوو، پێشبینی دەکرێت فاکتەری ژینگە و تەندروستی ببنە پێوەری بازاڕی دارایی جیهانی و بنەمای کارکردنی بازاڕ و بەدیهێنانی قازانجی ئابووریی و کۆمەڵایەتی، دواجار ببنە بنەمای سەرەکی لە بڕیاردان لە بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی ڕاستەقینەی هاوڵاتیان.

لەڕاستیدا یەکێک لە بەربەستەکانی بەردەم ئەم بیرۆکە و بانگەشانە کەمکردنەوە

یاخود ڕاگرتنی گەشەی ئابووری بەمەبەستی بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی ڕاستەقینەی هاوڵاتیان بریتییە لە زۆریی و زیادبوونی بەردەوامی ژمارەی دانیشتوان کە ساڵانە لە جیهاندا نزیکەی (٧٩ ملیۆن کەس زیاد دەکات، پێشبینی دەکرێت لە چەند ساڵی داهاتوودا ژمارەی دانیشتووانی جیهان بگاتە نزیکەی(٩) ملیار کەس، هەر ئەم هۆکارەشە وایکردووە کارێکی ئاسان نەبێت کە هەردوو وڵاتی (چین و هند) پابەند بکرێن بە کەمکردنەوەی گەشەی ئابووری بەهۆی زۆری ژمارەی دانیشتووانیان لەلایەک و زۆری کاڵا و خزمەتگوزاری بەرهەمهێنراویان لەلایەکی ترەوە، بەتایبەت بەهۆی فراوانبوونی ئاستی کێبەرکێی بازرگانی و ئابووریی و ڕامیاری نێوان وڵاتانی جیهان.

**پێنجەم: خۆشگوزەرانی هاوڵاتیان لە هەرێمی کوردستان**

**لە نێوان زیادبوونی داهات و بڵاوبوونەوەی بێکاریی و هەژاری:**

بێگومان هیچ کۆمەڵ و نەتەوە و نەژادێک لەخۆوە گەشە و بەرەوپێشچوونی بەدی نەهێناوە، هیچ گەل و نەتەوەیەکیش دواکەوتوویی بە میرات بۆ نەماوەتەوە، ئاسۆی گەشەی ئابووری بەردەوام کراوەیە، بەڵام ڕزگاربوون لە دواکەوتوویی و بەرەو ئاسۆی گەشەکردن بەندە بە هەوڵ و ماندوبوون و ئارەزوومەندیی خەڵک و حکومەت لە یەک کاتدا، کە ئەمەش لە هەرێمی کوردستان لە ئاستێکی زۆر لاوازدایە، هەربۆیە لە هەرێمی کوردستان سەرەڕای زۆری داهات و سەرمایە و فراوانبوونی سەرچاوەکانی زیادکردنی داهاتی گشتی و فراوانبوونی بازاڕ و فراوانبوونی هۆیەکانی گواستنەوە و گەیاندن، بەڵام بەهۆی لاوازی پێوەرەکانی دادپەروەریی و خراپی ئاڕاستەکردنی سەرمایە و فراوانبوونی کەرتی حیزبی لەسەر حسابی کەرتی گشتی و کەرتی تایبەت، ڕێژەی هەژاریی و بێکاریی و هەڵئاوسان بە بەردەوامی بەرەو هەڵکشان دەڕوات، کەلێنی جیاوازی نێوان چینەکان بە بەردەوامی بەرەو فراوانبوون دەڕۆن بەشێوەیەک چینی هەرە دەوڵەمەند چینێکی زۆر کەمن و چینی ناوەندش بەرەو کەمبوونەوەی زۆر ڕۆیشتووە، بەڵام چینی هەژار بەردەوام لە هەڵکشاندایە، هەربۆیە ئاستی داهاتی ڕاستەقینەی زۆرینەی زۆری هاوڵاتیانی هەرێمی کوردستان بە بەردەوامی بەرەو کەمبوونەوە و ناجێگیری هەنگاودەنێن، کەواتە دەتوانین بگەینە ئەو دەرەنجامەی کە پەیوەندییەکی زۆر بەهێزی ڕاستەوانە هەیە لە نێوان داهاتی گشتی و نیشتیمانی و دادپەروەری لە دابەشکردنی داهات و خۆشگوزەرانی ڕاستەقینەی هاوڵاتیان.

**لە هەرێمی کوردستان بۆ بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی ڕاستەقینە و هەمیشەیی پێویستە ئەم هەنگاوانە بنرێت:**

١. کارکردن و هەوڵدانی دڵسۆزانە و دانەبڕاوانە لە هەموو ئاستێکی بەرپرسیارێتی

خەڵک و حکومەت (کەرتی تایبەت و گشتی، کرێکاری ئاسایی و کارمەند و فەرمانبەری حکومی) پێکەوە کاربکەن بۆئەوەی بتوانرێت وردەوردە سیماکانی دواکەوتوویی بسرێتەوە، هاوکات ئاسۆکانی گەشەکردن فراوان بکرێت، ئەمەش دەبێتە هەنگاوێکی گرنگ بۆ بەرەوخۆشگوزەرانی چوون.

٢. پێویستە دووبارە چاو بخشێنینەوە بە بنەماکانی خۆشویستنی وڵات و نیشتمان بۆئەوەی بتوانین هەنگاوەکانی گەشەکردن خێراتر بکەین لە ڕێگەی دووبارە گەڕانەوەی ئینتیمای نیشتمانی ڕاستەقینە، بۆ سوودوەرگرتن لەم بوارە پێویستە لە هەرێمی کوردستان هەوڵی بەهێزکردنی ئینتما و ئارەزووی گۆڕانکاری بدەین لەناو خەڵکدا و باوەڕیشمان بە گۆڕانکاری ڕاستەقینە هەبێت.

٣. پێویستە لە ڕێگەی دارشتنی یاسایەکی تۆکمە و پیادەکردنی ڕامیارییەکی تەندروست کاربکرێت بۆ گەڕانەوەی ئینتما و خۆشویستنی کار لای کرێکار و کارمەند و فەرمانبەر لەڕێگەی جیاکردنەوەی کرێکار و کارمەند و فەرمانبەری کارا و ناکارا، سیستمی کارکردن لە وڵاتدا لەسەر بنەمای توانای کارکردن و پسپۆڕی بێت، گەر پیادەی وەها سیستمێک بکرێت لە ماوە درێژدا سەرجەم چینەکانی کۆمەڵگە و هاوکات حکومەت تیایدا سوودمەند دەبن، هاوکات ئەم هەنگاوە دەبێتە بنەمایەکی دروست بۆ بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی ڕاستەقینە و هەمیشەیی بۆ وڵات بەسەرجەم چین و توێژەکانەوە.

٤. پێویستە بەئاگابین لە پاراستنی دەرامەتە سروشتیی و کانزاییەکانی هەرێمی کوردستان، لەڕێگەی دانانی سیستمێکی کارگێری بەهێز و سەرکەوتوو بەمەبەستی سوودوەرگرتنی تەواو لەو دەرامەتە سروشتیی و کانزایی و داراییانەی کە هەن، بەپێچەوانەوە زۆری دەرامەتی سروشتی و دارایی بەتەنها وڵاتمان پێش ناخەن و نابنە سەرچاوەی خۆشگوزەرانی ڕاستەقینە بۆ هاوڵاتیان.

٥. هەنگاونان بۆ دامەزراندن و پاراستنی پرۆژە ناوخۆییەکان بەمەبەستی سەرکەوتنی ئەو پرۆژانە لەڕووی قازانجکردن و لەکۆتاییدا بەدیهێنانی گەشەی ئابووری بۆ ئابووری هەرێمی کوردستان. لە هەرێمی کوردستان پێویستە لەڕێگەی هەموارکردنەوەی یاسای وەبەرهێنان وەبەرهێنانی ناوخۆیی زیاد بکرێت، لەڕاستیدا زیادکردنی وەبەرهێنانی ناوخۆ کەم بایەخ دەبێت گەر ڕیزبەندی بۆ نەکرێت و نەبێتە هۆی ڕەخساندنی هەلی کاری پێویست بۆ هاوڵاتیان و نەبێتە هۆی ڕەخساندنی دەرفەتی ڕاستەقینە بۆ بەشداریکردنی هاوڵاتیان. هەربۆیە پێویستە وەبەرهێنانە ناوخۆییەکان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە دابەشبکرێن بەپێی مەحرومیەت و ژمارەی دانیشتوان و گرنگی ناوچەکان، بۆئەوەی هاوڵاتیان بتوانن بەدەستی خۆیان لە سرووشتەکەی خۆیان خۆشگوزەرانی بەدەستبهێنن. هاوکات پێویستە سوود لە ئەزموونی وڵاتانی پێشکەوتوو وەربگیرێت بەڕەخساندنی

دەرفەتی زیاتر بۆ وەبەرهێنانی بیانی لەو ناوچانەی کە پێویستیان بە ڕێژەیەکی زۆر لە وەبەرهێنان هەیە، بەمەرجێک نەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە ئاستی وەبەرهێنان و ئاستی بژێوی ناوخۆیی.

٦. پێویستە لەکاتی پلاندانان هەوڵی پەیوەستکردنی گەشەی کەرتە ئابوورییەکان بدەین بەشێوەیەکی تەریب و هاوسەنگ، بۆئەوەی سەرجەم کەرتەکان بەشداربن لە پرۆسەی گەشەی ئابووریی و بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی گشتی و تایبەت.

٧. پێویستە لە هەموو ئاستەکان و بۆ هەموو تەمەنەکان هەوڵی زیادکردنی ڕێژەی فێرخوازەکان بدرێت لەڕووی چەندێتی و چۆنێتی، هەروەها بتوانرێت پرۆگرامەکانی خوێندن پەیوەست بکرێت بە پێداویستییەکانی بازاڕی کار، سیستمی فێرکردن و خوێندن لەوە دەربکرێت کە تەنها ئەرکی پێدانی بڕوانامە و زۆرکردنی ڕێژەی دەرچووان بێت، هاوکات هانی نەوەکانمان بدەین کە چینی خوێنەوار و هەڵگری بڕوانامە بەردەوام پێشەنگی وڵاتن و ئاستی گوزەرانیان بەرزە و چاویان لەدەستی کەس نیە، هەروەک پێویستە وا تەماشای  کەرتی پەروەردە و فێرکردن بەگشتی و خوێندنی باڵا بەتایبەت بکرێت کە کەرتێکی بەرهەمهێنە و ڕۆڵی  زۆر گرنگ دەبینێت لە پێکهێنانی داهاتی گشتی نەتەوەیی و داهاتی تاکەکەس، دەتوانرێت ئەم هەنگاوە خێرا بکرێت لەڕێگەی ئەنجامدانی چاکسازی ڕاستەقینە لە دامەزراوەکانی پەروەردە و فێرکردن بەتایبەت خوێندنی باڵا بەمەبەستی پێگەیاندنی هێزی کاری کارامە و پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی بازاڕی کار لە هەرێمی کوردستان و سنووردارکردنی هاوردنی کرێکاری بیانی.

> **یەکێك لە هۆکارەکانی لاوازی ئابووری هەرێمی کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی سیستمی بانکی و کارانەبوونی ڕۆڵی بانکە بازرگانی و حکومی و ئیسلامی و بانکە تایبەتمەندەکان.**

٨. یەکێک لە هۆکارەکانی لاوازی ئابووری هەرێمی کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی سیستمی بانکی و کارانەبوونی ڕۆڵی بانکە بازرگانی و حکومی و ئیسلامی و بانکە تایبەتمەندەکان. بەگشتی بانکەکان زۆرێک لە ئەرکە سەرەکییەکانی بانکیان لەدەستداوە و بەزۆری بوونەتە شوێنی دابەشکردنی مووچە و هەندێک کاری تری کەم بایەخ لەڕووی ئابوورییەوە، بۆیە ناتوانرێت لە وەها بارودۆخێک گەشەی ئابووری ڕاستەقینە ڕووبدات لەڕێگەی کەرتی بانکییەوە، بەپێچەوانەوە دەکرێت بانکەکان و کاری بانکی بکرێتە خاڵی

بەیەک گەیاندنی سەرجەم سێکتەرە ئابوورییەکان، هاوکات ببێتە پردی بەیەک گەیاندنی بەرژەوەندییە ناوخۆیی و بەرژەوەندییە دەرەکییەکان، هەروەها دەکرێت کەرتی بانکی ببێتە سەرچاوەی گەشەی داهاتی تاکەکەس بەڕێگەیەکی ژیرانە و دوور لە سوو و وەبەرهێنانی بێ سوود، ئەمەش لەڕێگەی ڕێگریکردن لە نوستن (الاکتناز) پارە لە ماڵەکان و سوودوەرنەگرتن لێی لە پرۆسەی وەبەرهێنانی تەندروست.

٩. سەرەڕای هەبوونی سەرچاوەی سروشتی زۆر و هەمەجۆر، بەڵام کەرتی کشتوکاڵی هەرێمی کوردستان لەئێستادا بێ توانایە لە دابینکردنی کەمترین ئاست لە پێداویستییە خۆراکییەکانی ناوخۆ، کەرتی کشتوکاڵ نەبووەتە سێکتەرێکی کاریگەر و تەواوکەر لەگەڵ سێکتەرە ئابوورییەکانی تر، چارەسەری ئەم گرفتە خۆی دەبینێتەوە لە کەمکردنەوەی جیاوازی نێوان لادێکان و شارەکان و برەودان بە بازاڕکردنی بەرهەمە ناوخۆییەکان و پاڵپشتیکردنی جوتیاران و بڵاوکردنەوەی کلتووری بەکارهێنان بۆ بەرهەمە ناوخۆییەکان، کە دواجار دەبێتە هۆی دروستبوونی خۆشگوزەرانی بۆ هاوڵاتیانی بەرهەمهێن و بەکاربەر.

١٠. هەرێمی کوردستان خاوەنی یەدەگێکی فراوانە لە دەرامەتی کانزایی و پیشەسازی، هاوکات زۆر دەوڵەمەندە لەڕووی سەرمایەی مرۆیی، بەڵام ڕێژەی بێکاری بەردەوام لە هەڵکشاندایە، بۆیە دەکرێت کۆمەڵگەی ئێمە کەسانی زانستخواز و پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەی بەرز بکەن بە پێشەنگی ڕیفۆرم، هەروەها سەرمایەی تەرخانکراو زیاد بکرێت بۆ بواری وەبەرهێنان بەگشتی و وەبەرهێنانی پیشەسازی بەتایبەت، بۆئەوەی سوود لەو دەرامەتە پیشەسازیی و کانزاییانە وەربگیرێت بەشێوەیەکی گونجاو، هاوکات بکرێتە سەرچاوەی ڕەخساندنی هەلی کاری گونجاو و شیاو بۆ سەرجەم چین و توێژەکان و پشتبەستنی هاوڵاتیان بەخۆیان، ئەم هەنگاوە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ڕێژەی بێکاری(ئاشکرا، ڕووپۆشراو) کە دەرئەنجام دەبێتە هۆی ئەوەی گرفتێکی گەورە لە گرفتە ئابوورییەکانی کۆمەڵگەکەمان بەرەو چارەسەر ببات، کەمکردنەوەی ڕێژەی بێکاریش پێوەر و نیشانەیەکی گرنگە بۆ بەرەوخۆشگوزەرانی چوونی هاوڵاتیان.

١١. هەرێمی کوردستان سەرەڕای ئەوەی خاوەنی ناوچەی زۆری گەشتوگوزارییە، هەروەها خاوەنی گەشتوگوزارێکی سروشتییە و بنەمای پەرەپێدانی زۆر ئاسانترە بەبەراود لەگەڵ زۆرێک لە وڵاتانی تر کە زۆرینەی ناوچە گەشتیارییەکانیان دروستکراون و تێچوونێکی زۆریان پێویست بووە و پێویستە لە داهاتوودا، بەڵام ئێمە نەمانتوانیوە تاکو ئێستا ناوچە گەشتیارییەکانمان بناسێنین بە گەشتیارانی بیانی، ئەمە جگەلەوەی ناوچە گەشتیارییەکانمان نەیانتوانیوە پێداویستی گەشتیارە ناوخۆییەکان دابین بکەن، هەربۆیە دەتوانرێت سوود لە سروشتی گەشتوگوزاری هەرێمی کوردستان ببینرێت بۆ

هەمەجۆرکردنی ئابووری کۆمەڵگە و تاک، ئەم کارەش دەبێتە بنەمای فراوانکردنی سەرچاوەی پەیداکردنی داهات و پشتبەستنی هاوڵاتیان بەخۆیان بۆ دابینکردنی بژێوی ژیان و زیادکردنی ئاستی داهاتەکانیان بەتایبەت بۆ هاوڵاتیانی نیشتەجێی ناوچە گەشتوگوزارییەکان.

لەکۆتایدا، لە هەرێمی کوردستان پێویستە هەوڵی بەهێزکردنی پێگەی ئابووریی و ڕامیاری بدرێت، چیتر داگیرکردنی دەیان و سەدان ساڵەی نەتەوە و خاکی کوردستان لەلایەن چەند وڵاتێکی هەرێمی و نێودەوڵەتی نەبێتە بیانووی بەمیرات مانەوەی دواکەوتوویی یاخود کەم پێشکەوتنی ئابووریی و بەدینەهاتنی خۆشگوزەرانی بۆ زۆرێک لە هاوڵاتیان، چونکە داگیرکردن لەلای هەموو وڵاتانی جیهان وانەیەکی گرنگە کە ورە و هێزی پێشکەوتن زیاد دەکات، بۆیە ئێمەش پێویستە بەوشێوەیە لەو مەسەلەیە تێبگەین. هەروەها هەرێمی کوردستان دەتوانێت و دەکرێت پێش بکەوێت و گەشەی ئابووری ڕاستەقینە و بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی بهێنێتەدی بەبێ دەستهەڵگرتن و دەستبەرداربوون لە ئایین و نەتەوە و دابونەریت و کلتووری کۆمەڵگەی کوردەواری، هاوکات مەرجی پێشکەوتنی هەر وڵاتێک بەندە بەڕێزگرتن لە دابونەریتە تەندروستەکانی کۆمەڵگە. هەروەک هەرێمی کوردستان پێویستە ببێتە خاوەنی ستراتیجێکی ڕوون و ئاشکرا (هەڵگری سیستمی سەرمایەداری یان هاوبەشی یاخود تێکەڵ)، پێویستە لانیکەم سیستم و ڕامیاریی و ستراتیجێکی ڕوونمان هەبێت بۆ هەر قۆناغێک لە قۆناغەکانی گەشەکردن، دەمانەوێت چی بکەین؟ چۆن هەنگاو بنێین؟ بەرەوکوێ هەنگاو بنێین؟. هاوکات لەئێستادا هەرێمی کوردستان پێویستە دووبارە چاوبخشێنێتەوە بە بارودۆخە ڕامیاریی و ئابوورییە ناوخۆیی و دەرەکییەکان و هەوڵی پیادەکردنی ستراتیجێکی پتەو و ڕوونبدات بەشێوەیەک کە سەقامگیری ئابووریی و ڕامیاریی و کۆمەڵایەتی بێنێتەدی، ئەمەش بەبناغەی گەشەی ئابووری وڵات و بنەمای خۆشگوزەرانی هاوڵاتیان دادەنرێت.

## سەرچاوەکان


١. یونس عەلی ئەحمەد: گەشەی ئابووری ئاسیا وئاستەنگەکانی وڵاتانی (ژاپۆن، چین، کۆریای باشوور، مالیزیا) وەک نموونە، چۆن دەکرێت هەرێمی کوردستان سوود لە ئەزموونی ئەم وڵاتانە وەربگرێت؟ نوسینگەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠١٢.

٢. عبدالعزيز عبدالله الفارس القطيفي: النمو الاقتصادی (نظريات النمو: الديناميک و المنهج الرياضی) مديرية دار الكتب للطباعة و النشر، بغداد، ١٩٩٩.

٣. مدحت قريشى: التنمية الاقتصاديه، ط١، الدار الراعی، عمان، ٢٠٠٧.

٤. مدحت القريشى: التنمية الاقتصادية (نظريات وسياسات وموچوعات)، دار وائل للنشر، الاردن، ٢٠٠٧.

٥. عثمان محمد غنيم وماجده احمد ابوزنط: التنميهة المستديمة (فلسفتها واساليب تخطيطها وادوات قياسها، ط١، دارصفاء للنشر والتوزيع، الاردن، ٢٠٠٧.

٦. الوليد قسوم ميساوی: اثر ترقية الاستثمار على النموالاقتصادی فی الجزائر منذ ١٩٩٣، اطروحه دكتوراه، كلية العلوم الاقتصادية والعلوم التجارية وعلوم التسيير، جامعه محمد خيضر بسكرة، الجزائر، ٢٠١٨.

٧. ضامن حكيم: أثر السياسة الاقتصادية على النمو الاقتصادی (دراسه حاله الجزائر)، رسالة ماجستر، كلية العلوم الاقتصادية والتجازيهة وعلوم التسيير، جامعه مستغانـم، الجزائر، ٢٠١٨.

٨. هاشم على حسين: تأثير الانفاق الحكومی فی النمو الاقتصادی لدولة الامارات العربية المتحدة للمدة ١٩٩٠ – ٢٠١٨، كلية الإدارهة والاقتصاد، جامعة الموصل، العراق، ٢٠١٩.

.https://www.dw.com, 2021 9

.https://ar.wikipedia.org10



**د. محەمەد عەلی باپیر**
دکتۆرا لە زانستە ڕامیارییەکان و پەیوەندییە
نێودەوڵەتییەکان، وانەبێژ لە زانکۆی کوردستان هەولێر.

# بۆچی نەوت و گەشەی ئابووری ناتوانن عێراق ببەنە سەر هێڵی دیموکراسی؟

مۆدێرنەتە وەک ماکس وێبەر (١٩٠٥) مانای کردووە، واتا، بە ئەقڵانیکردن. چەسپاندنی ئەقڵانییەت لە ڕەهەندە کۆمەڵایەتی، ئابووریی و ڕامیارییەکان لە کۆمەڵگەکانی ڕۆژئاوادا ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە بەدامەزراوەکردنی بەها لیبراڵییەکان - بۆ وێنە ئازادی مرۆڤ، مرۆڤ کردنە پێوەر و بیری مرۆڤ کردنە ناوەند. بەمۆدێرنەکردن سێ فۆرمی سەرەکی هەن، کلتووری-کۆمەڵایەتی، ڕامیاریی و ئابووری. فۆرمی ڕامیاری بە مۆدێرنەکردن، واتە بەرەوپێشبردنی باری ڕامیاری لە ڕێی بەئەقڵانیکردنی پەیکەرەکانی دەسەڵات و چڕکردنەوەی دەسەڵات لە دامەزراوە فەرمییەکاندا. فۆرمی ئابووری بەمۆدێرنەکردن گریمانەی ئەوە دەکا کە ڕەهەندە ئابووریی و ڕامیارییەکان پێکەوەپەیوەستن و. وەک میتۆدی توێژینەوە، فۆرمی ئابووری بەمۆدێرنەکردن دەیەوێ شیکاری پەیوندی نێوان پەیکەرە ئابوورییەکان لەگەڵ پەیەکەرە ڕامیارییەکانی کۆمەڵگەکانی سەردەمدا بکا. ئەم کورتە توێژنەوەیە لەسەر فۆرمی ئابووریی بەمۆدێرنەکردنە؛ واتە ڕامانە لە کاریگەری پێشکەوتنی ئابووری لەسەر سیستەمی سیاسی.

توێژینەوەیەکی سایمۆر مارتن لیپزت کە لە ساڵی ١٩٥٩دا بڵاوکراوەتەوە، وەک یەکێک لە نوسراوە بنەڕەتییەکانی تیۆری بەمۆدێرنەکردن ناسراوە. لیپزت بڕوای وابوو کە بوارە جیاجیاکانی پێشکەوتنی ئابووری بەشێوەیەکی وا پێکەوەپەیوەستن کە هەموو پێکەوە یەک دیاردە بەرهەم دێنن، ئەم دیاردەیەش لە ڕووی سیاسییەوە، هاوواتایە لەگەڵ دیموکراسی (لیپزت ١٩٦٣:٤١). بەومانایەی، هەندێک پێشمەرجەی ئابووریی و کۆمەڵایەتی پێویستین بۆ سەرهەڵدانی دامەزراوە ڕامیارییەکانی دیموکراسی لەو شێوێنانەی ئەو دامەزراوانە نین؛ هەروەها پێویستین بۆ بەردەوامیی ئەو دامەزراوانە لەو شوێنانەی کە هەن. کەواتە، پێشکەوتنی ئابوری کۆمەڵێک گۆڕان لە پەیکەرە کۆمەڵایەتییەکاندا دێنێتە کایەوە کە دەبنە هۆکار بۆ سەرهەڵدانی دامەزراوە فەرمییە ڕامیارییەکانی دیموکراسی.

ئەمە ئاماژەیە بۆ هەبوونی پەیوەندییەک لە نێوان بڵاوبوونەوەی دیموکراسی (بڵاوبوونەوەی وەک سیتەمی سیاسی لە جیهاندا) لەگەڵ پێشکەوتنی ئابووری. بە مۆدێرنەکردن، لەم ڕووەوە تیشک دەخاتە سەر پەیوەندی نێوان فۆرمە سیاسییەکانی دامەزراوەکان لەگەڵ پیشەسازی ئابووری. دەڵێ لە پەیوندیی نێوان بەئازادکردنی ئابووریی و بەدیموکراسیکردنی سیاسی، یەکەمیان پێشمەرجی دووەمییانە. سێ جیاکەرەوەی گشتی بناغەی تیۆری بە مۆدێرنەکردنن؛ ئابووریی (پیشەسازیی و بازاڕی ئازاد)، کلتووریی (بەها ئازادیگەراییەکان) و ڕامیاریی (دامەزراوە دیموکراتیکەکان). من لەم نوسیەنەدا زۆر بەگوشراوی باسی پەوەندی نێوان دووان دەکەم، ئابووریی و ڕامیاری، لەکۆتاییدا باسەکە پەیوەست دەکەمەوە بە دۆخی عێراقەوە.

لەم بەراییەوە پێویستە پێناسەیەکی کورتی دوو چەمکی پێشکەوتنی ئابووری و دامەزراوە فەرمییە ڕامیارییەکانی دیموکراسی بکەم. جیاکارییەک هەیە دەبێ لێرەدا ئاماژەیەکی بۆ بکەم، ئەویش جیاوازی نێوان پێشکەوتنی ئابووریی و گەشەی ئابوورییە. پێشکەوتنی ئابووری واتە، تەواوی ئەو پەیکەرانەی کە پێویستن بۆ سەربەخۆیی ئابووریی و ئابوورییەکی کارا، وەک، پیشەسازی، ڕەخساندنی هەلی کار، برەودان بە پەروەدە و فێرکردن، پەرەدان بە کەرتی تەندروستی بەشێوەیەک کە هەموو ئەمانە بە تێکڕا ببنە سەرچاوەی داهاتی بەرهەمی نێوخۆ. گەشەی ئابووری ماناکەی بەرتەسکترە و زیاتر بەکۆی سامانی نیشتمانی دەپێورێ – ئەگەر سەرچاوەی ئەو سامانەش لە ناوخۆی وڵاتدا نەبێ. ئەوەی لەم نوسینەدا هەڵوەستەی لەسەر دەکەم، پێشکەوتنی ئابوورییە بە مانا فراوانەکەیەوە. سەبارەت بە چەمکی دووەم، دامەزراوە فەرمییە ڕامیارییەکانی دیموکراسی، مەبەستم لە مانا بەرتەسکەکەی دیموکراسییە. واتا شێوەی

کار و پەیوەندی نێوان دامەزراوە فەرمییەکانی دەوڵەت (دەسەڵاتی ڕاپەراندن، دەسەڵاتی یاسادانان، دەسەڵاتی دادوەری)، بەشداری سیاسیی و نوێنەرایەتی کردن و لێپێچینەوە – هەڵبژاردن و دەستاودەستکردنی ئاشتیانەی دەسەڵات. جا بۆیە لێرەدا کە ناوی سیستەمی دیموکراسی دێنم، مەبەستم لە ڕەهەندە کۆمەڵایەتیی و کلتورییەکانی دیموکراسی نییە، بەڵکو تەنها مەبەستم ڕەهەندە ڕامیارییەکانییەتی. کەواتە، باسی دیموکراسی دەکەم وەک سیستەمێکی سیاسی کە بریتییە لە کۆمەڵێک دامەزراوەی فەرمی، ئەمەش مانای بەرتەسکی دیموکراسییە.

### پێشکەوتنی ئابووریی و سەرهەڵدانی دیموکراسی

پرسیارە سەرەکییەکە ئەوەیە کە ئایا کۆمەڵگەکان بەرەو ئازادی دەڕۆن ئەگەر هاتوو بوون به وڵاتی پیشەسازیی، ئایا وڵاتان دەبنە دیموکراتیک ئەگەر بگەنە ئاستێکی دیاریکراوی پێشکەوتنی ئابووری. توێژەران بەسەر دوو بۆچووندا دابەشبوون. لەلایەکەوە، کۆمەڵێکیان دەڵێن، سەرهەڵدانی دیموکراسی دەرەنجامی پێشکەوتنی ئابووری وڵاتە (بڕوانە؛ هایک ١٩٤٤؛ لیپزت ١٩٥٩؛ پشوارزکی و لیمۆنگی ١٩٩٣؛ ڕیکەر و ویمێر ١٩٩٣). لەلایەکی دییەوە، هەندێکی دی بۆچوونیان وایە کە دەگونجێ دیموکراسی بەرپابکرێ بەبێ پشتبەستن بە پێشکەوتنی ئابووری و، دەڵێن، پەیوەندییەکی ڕەها نییە لە نێوان دیموکراسی و پێشکەوتنی ئابووریدا (بڕوانە؛ پەی ١٩٦٦؛ میکینلەی و کۆوان ١٩٧٥؛ کۆلی ١٩٨٦؛ مارش ١٩٨٨).

لە سەرەتادا بۆچوونەکان گەشبینتربوون لەمەڕ فۆڕمی ئابووری بەمۆدێرنەکردن وەک پێشمەرجە بۆ بنیاتنانی دیموکراسی سیاسی (بڕوانە؛ لیپزت ١٩٥٩). بەڵام ئەو گەشبینییە هەر لەبەراییەوە ڕەخنەی لێگیرا لەسەر ئەو بنەمایەی کە هەڵەیە وا بیر ببرێ  کە ئەو گۆڕانکارییانەی بەهۆی پێشکەوتنی ئابووری هاتوونەتەکایەوە، بەشێوەیەکی پێویست، لە بەرژەوەندی دیموکراسیدا دەبن. لەبەرانبەریدا، ئەو بۆچوونە پشتڕاستکرایەوە کە دەگونجێ دیموکراسی بێتەئاراوە بە ئامادەبوونی کۆمەڵێک دامەزراوەی سیاسی کە توانای ئاڕاستەکردن و وەڵامگۆیی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیی و ئابوورییەکانیان هەیە (بڕوانە؛ هانتینگتۆن ١٩٦٨). هەرچەندە ئەم جۆرە لە ڕەخنە، ئاڕاستەی سەرنجی گۆڕێ لە هۆکاری ئابوورییەوە بۆ دامەزراوەی سیاسی، بەڵام هەر لەگەڵ گریمانەی تیۆری بەمۆدێرنەکردن هاوڕابوو، بەتایبەت ئەوەی کە، پێشکەوتنی ئابووری سەر دەکێشێ بۆ گۆڕانکاری ڕیشەیی کۆمەڵایەتی. لە سەرەتای ساڵانی ١٩٩٠، بۆ وێنە، پێشنیازی

ئەوە دەكرا كە سندوقی دراوی نێودەوڵەتی (ئای ئێم ئێف)و بانكی نێودەوڵەتی، دەبێ بەدیموكراسیكردنی سیاسیی و ئابووری ئازاد بكەنە پێشمەرجەی هاوكاریی و پشتیوانییە داراییەكانیان (هانتینگتۆن ١٩٩١:١٧).

لە ساڵانی ١٩٧٠دا، گومانێكی زۆر لە گەشەكردندا بوو لەمەڕ بەمۆدێرنەكردن، بەتایبەت لەلایەن ئەوانەوە كە سەروكاریان لەگەڵ ڕەهەندە ئابوورییەكەیدا هەبوو. چەندین توێژینەوەی جیاجیا لە وڵاتانی ئەمریكای لاتین (بۆ وێنە، فرانك ١٩٧٠؛ كاردۆسۆ و ئێنزۆ ١٩٧٩)، ئەوەیان دەرخست كە ئابووری نێودەوڵەتی ببوو بە هۆكار بۆئەوەی زۆرێك لە وڵاتان ببنە وڵاتانی پشتبەستوو و لە ئاستێكی نزمی ئابووریدا بمێننەوە. ئەم دیاردەیە بەتیۆری پشتپێبەستن ناسراوە، پوختەی ئەم بیرۆكەیە ئەوەیە، وڵاتانی دواكەوتوو (كەم پێشكەتوو) چەند تایبەتمەندییەكی خۆیان هەیە و فۆڕمی بەرایی وڵاتانی پێشكەوتوو (ڕۆژئاوا) نین. واتە، ئەم تیۆریە ئەو بۆچوونەی ڕەتكردەوە كە تەنها یەك ڕێگەی هەیە بۆ پێشكەوتن، ئەویش ڕێگەی وڵاتانی پێشكەوتووی ڕۆژئاوایە. هەر لەسەر ئەو باسە، بە سەرنج خستنەسەر باری ئابووری، چەند توێژینەوەیەكی دی پیشانیاندا ئەو پێشمەرجانەی پێشكەوتن كە بەسەر چەندین وڵاتی كەم پێشكەوتوودا سەپێنرابوون دەرەنجامەكەیان دیموكراسی نەبوو، بەڵكو دەرەنجامەكەیان سەرهەڵدانی چەندین جۆری سیستەمی خۆسەپێن بوو (بڕوانە، ئۆودینێل ١٩٧٣).

توێژینەوەیەكی شیكاریی ئامار بۆ حەڤدە وڵاتی ئەمریكای لاتین، بە هەڵسەنگاندنێكی چڕ بۆ گریمانەی پێشكەوتنی ئابووری دەریخستووە كە پەیوەندییەكی ڕاستەوانە و ئەرێنی نییە لە نێوان پێشكەوتنی ئابووری و دیموكراسی – دەرەنجامەكان گریمانەكەیان پشتڕاست نەكردەوە و ئەمەش بانگەشەی تیۆری بەمۆدێرنەكردنی لە ئەمریكای لایتنی بەڕاست نەگەڕاند (بڕاونە، لاندمان ١٩٩٩). توێژینەوەیەكی تازەتر ئەوە پێشاندەدا كە پەیوەندی نێوان پێشكەوتنی ئابووری و دیموكراسی، بە بەڵگەی ئامار، ئەوە دەچەسپێنێ كە پێشكەوتنی ئابووری گاریگەری ئەرێنی هەیە لەسەر كارایی دیموكراسی، بەڵام، ئەو كاریگەرییانە دەگۆڕێن و جیاوازن لە شونێكەوە بۆ شوێنێكی دی (فۆوێركەر و لاندمان ٢٠٠٤). واتە پەیوەندی نەبووە لە نێوان پێشكەوتنی ئابووری و سەرهەڵدانی دیموكراسی، ئەو پەیوەندیی و كاریگەرییە ئەرێنییە تەنها بۆ وڵاتانی دیموكراتیك ڕاست بووە – ئابووریی و بازاڕیان هاوكار بووە بۆ فۆڕمی سیاسییان.

بەوپێیە، ئەو بەڵگەیەش خراوەتە ڕوو كە فۆڕمە سەرەتاییەكانی تیۆری بەمۆدێرنەكردن، ناتوانن جیاكاری بكەن لە نێوان بەردەوامی دیموكراسی (بەهێزكردنی)

و بنیاتنانی دیموکراسی (بەدیموکراسی کردن) (پشوارسکی ١٩٩٧). ئەم ڕەخنەیە پیشانیدا کە پێشکەوتنی ئابووری، ڕۆڵێکی گرنگی دیوە لەباری یەکەمدا، بەڵام ئەو ڕۆڵەی نەبووە لەباری دووەمدا – دیموکراسی بەهێزکردووە لەو شوێنەی کە هەبووە، بەڵام نەبووەتە هۆی سەرهەڵدانی دیموکراسی لەو شوێنانەی کە نەبووە. ئەمە ئەوەی گەیاند کە ئەگەر بێتو دیموکراسی بچێتە ناو وڵاتێکەوە کە باری ئابووری باش بێ، ئەوا بەردەوامی دەبێ. بەواتایەکی دی، ئەگەر بێتو وڵاتێکی دەوڵەمەند بە دیموکراسی کرا ئەگەری ئەوە کەمترە بگەڕێتەوە باری پێشووی – ببێتەوە بە نادیموکراتیک. پەیوەست بەوەوە، تاقیکردنەوە هەنووکەییەکانی گریمانەی بەمۆدێرنەکرن، بە بەڵگەی تازە، دەریدەخەن کە ئەم بۆچوونە ڕێژەیەک لە دروستی تێدایە (بۆ وێنە، ێینگڵهارت و وێلزێل ٢٠٠٥؛ ئێپستین ٢٠٠٦).

> **یەک لەو بۆچوونانەی کە چەسپاندنی دیموکراسیی لە عێراقدا پێ ئاستەمە، بەو ئەندازەیەی کە بە تیۆری بەمۆدێرنەکردنەوە پەیوەستە، ئەوەیە کە عێراق وڵاتێکی پشتبەستوو بە نەوتە.**

لە باسی بە ئەرێنی ڕاستەوانە گۆڕین لەگەڵ بەردەوامی دیموکراسیدا، ئەو ڕایەش هەیە کە، تێکڕای داهاتی بەرهەمی نێوخۆ گرنگترین پێوەرە کە دەبێ لەبەرچاو بگیرێ. ئەگەری مانەوەی دیموکراسی و زیادبوونی داهاتی بەرهەمی نێوخۆ ڕاستەوانە دەگۆڕن، ئەم ئەگەرە زیاد دەکات تا دەگاتە ئاستێک کە هیچ دیموکراسییەک تائێستا نەگۆڕاوە بۆ سیستەمێکی نادیموکراسی لە وڵاتێکدا کە داهاتی بەرهەمی نێوخۆ بۆ هەرتاکێک زیاتر بووە لە ٦٠٥٥ دۆلاری ئەمریکی (پشوارسکی ١٩٩٧؛ ٢٠٠٤). لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو ئەو توێژینەوانەی ئەوە دەگەیەنن کە پێشکەوتنی ئابووری یارمەتی مانەوەی دیموکراسی دەدا (بۆ وێنە، لیپزت ١٩٥٩ ؛ پشۆارسکی ٢٠٠٤ ؛ ئینگڵهارت و وێزێل ٢٠٠٥ ؛ ئێپستین ٢٠٠٦ ؛ پیرینبووم ٢٠٠٨)، نمونەی ئەو وڵاتانەن کە هاوڵاتیان تێیاندا بەشدارن لە بەرهەمێنانی کۆی داهاتی بەرهەمی نێوخۆ. واتە توێژینەوەکان ئەو وڵاتانە ناگرنەوە کە سامانی نیشتمانیان زۆرە و سیستەمە ڕامیارییەکانیان نادیموکراتیکن، بۆ نمونە، کە تێیاندا نەوت

سەرەکیترین سەرچاوەی وەبەرهێنانی سامانی نیشتمانییە. ئەمە بەومانایەی، نەوت ئەو کاڵایەیە کە دەگونجێ بۆ سەرهەڵدانی دیموکراسی ببێتە لەمپەر، چونکە لە وڵاتانی نەوتیدا سامانی نیشتمانی پێچەوانە دەگۆڕێ لەگەڵ دیموکراسی، نمونەش؛ وڵاتە نەوتییەکانی کەنداو – تا داهاتی نەوت زۆرتربێ، ئەگەری دیموکراسی کەمتر.

**باسی عێراق**

ژمارەیەک توێژینەوەی زۆر شیکردنەوەیان بۆ سامانی نەوتی عێراق کردووە بە لێکەوت لەگەڵ بەردەوامی سیستەمە سیاسییەکەی. نوسینەکان کۆمەڵێک باس لەخۆدەگرن، لەوانە، بەتایبەت کێشەی نێوان نەوت و دارایی بەلێکەوت لەگەڵ بنیاتنانی دیموکراسی و، کاریگەریی نەوت لەسەر گوزەری عێراق بەرەو زیاتر بەدیموکراسی بوون (بۆ وێنە ؛ بیردسال و سوبرامەنیان ٢٠٠٤ ؛ مەهدی ٢٠٠٧ ؛ ویدی ٢٠٠٧ ؛ بیلون ٢٠٠٨ ؛ موتید ٢٠١٢ ؛ ئەلبەشیر و ئەلشیباهی ٢٠١٣). ئەو توێژینەوانە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە نەوتی عێراق نەبۆتە هۆی بەربەست، بەڵکو هاوکاربووە بۆ ئابووری عێراق و سیستەمە ڕامیارییەکەی. بەتەماشایەک بۆ داهاتوو، بەپێی ئامارەکانی ساڵانی ٢٠١٣-٢٠١٧ داهاتەکانی نەوت دەتوانن کەرتی نەوتی فراوان بکەن و ئەمەش دەتوانێ سامانی نیشتمانی بەڕێژەی لە ٩٪ زیاد بکات لە ماوەی چوارساڵدا (یلیس ٢٠١٢).

لە عێراقدا، نەوت کاڵایەکی سیاسییە و کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر سیستەمی سیاسی. زۆرێک لەوانەی کە بەڵگە دێننەوە بۆ شکستی دیموکراسی لە عێراق ئاماژە بۆ باری ناهاوسەنگی ئابووریی عێراق دەکەن – کە نەوت بۆتە سەرچاوەیەکی نەهامەتی. یەک لەو بۆچوونانەی کە چەسپاندنی دیموکراسیی لە عێراقدا پێ ئاستەمە، بەو ئەندازەیەی کە بە تیۆری بەمۆدێرنەکردنەوە پەیوەستە، ئەوەیە کە عێراق وڵاتێکی پشتبەستوو بە نەوتە. ناوەڕۆکی ئەو بەڵگەیە ئەوەیە کە بەشێوەیەکی سەرەکی متمانە خستنەسەر نەوت بۆ بەرهەمهێنانی سامان، وەک سەرچاوەی سەرەکی سامانی نیشتمانی و داهاتی بەرهەمی نێوخۆ، لە بەرژەوەندی دیموکراسیدا نییە (ڕۆسێر ٢٠٠٦؛ ڕۆس ٢٠٠١)؛ چونکە، لەنێو بیست و سێ وڵات کە داهاتیان بەشێوەیەکی سەرەکی لە ڕێی فرۆشتنی نەوت و گازەوەیە، هیچیان دیموکراتیک نین (دیامۆند ٢٠١٠). یەکێک لە گەورەترین ترسەکان لە عێراقی دوای جەنگ ئەگەری بوون بە وڵاتێکی نەوتی بوو (بڕوانە، لاوسۆن ٢٠٠٣)، کە تێیدا داهاتەکانی نەوت ڕاستەوخۆ دەچنەوە حکومەتی نیشتمانی، دامەزراوەیەکی فەرمی کە بەڕێژەیەکی بەرچاو بە گەندەڵییەوە گیرۆدەیە.

عێراق وڵاتێکی پشتبەستوو بەنەوتە – کرێیە وڵاتە. تیۆری کرێییە وڵات، ئەوە

دەگەیەنێ کە لە وڵاتێکی پشتبەستوو بە نەوتدا، دەوڵەت پێویستی بە باج وەرگرتن نییە لە هاوڵاتیانی، چونکە سەرچاوەی داهاتی لە دەرەوەیە (مەهدەڤی ١٩٧٠؛ بێبلاوی و لوچیانی ١٩٨٧). هێمای جیاکەرەوەی کرێیە وڵات ئەوەیە کە کرێ لە دەرەوەی وڵاتەوە دێ و ڕاستەوخۆ دەچێتە دەستی دەوڵەت (لوچیانی ٢٠١٣:٩١). بۆیە، کرێی نەوت دەکرێ بەشداری سیاسی، ویستی نوێنەرایەتی سیاسی و تەنانەت لێپێچینەوەی سیاسیش نەهێڵێت، چونکە ئەوانەی لە دەسەڵاتدان، نەوت دەفرۆشن و ڕەوایەتی دەکڕن، وەک لە وێنەی وڵاتانی کەنداودا ئەمە بەڕوونی بەرجەستەبووە.

عێراق وەک وڵاتێکی دەوڵەمەند بە نەوت، تا ئاستێکی دیاریکراو، توانیویەتی پەیکەرەی وەبەرهێنای نەوتی خۆی سەرکەوتووانە دروستبکاتەوە. هەناردەی ڕۆژانەی نەوت هەڵکشا لە ١.٨ ملیۆن بەرمیل لە ڕۆژێکدا لە ٢٠٠٥ بۆ پێوانەکردنی ٣.٨ ملیۆن بەرمیل لە ڕۆژێکدا لە ٢٠١٥. لە ساڵی ٢٠٠٥ەوە، عێراق چووەتە نێو قۆناغێکی جیاوازی گەشەی ئابوورییەوە، هەرچەندە ئابووری عێراق پشتی بە نەوت بەستووە، بەڵام لە ساڵی ٢٠٠٤ بۆ ٢٠١١ بەشداری نەوت بۆ تێکرای داهاتی بەرهەمی نێوخۆ لە ٧٠٪وە دابەزیوە بۆ لە ٤٣٪؛ ئەمەش بەو مانایەی، نەوت هۆکارێکی سەرەکی بووە لە بنیاتنانەوەی کەرتەکانی دی پەیکەرەی ئابووری.

لە ساڵی ٢٠١٥دا، داهاتی بەرهەمی نێوخۆی عێراق، بەهاکەی ١٦٨.٦١ بلیۆن دۆلاری ئەمریکی بوو. سەرباری لاوازیی باری ئاسایش، ئابووری عێراق بەشێوەیەکی بەرچاو گەشاوەتەوە. وەبەرهێنانی دەرەکی، پرۆژەی نیشتەجێبوون، بازرگانی و لە هەندێک شوێنی وڵات تەنانەت فراوانکردنی ڕووبەری کشتوکاڵی، هەموو ئەمانە بوونە هۆکار بۆ بەرزبوونەوەی کۆی داهاتی بەرهەمی نێوخۆ. بەجۆرێک کە داهاتی تاک لە ساڵی ٢٠٠٥ (بەدابەشکردنی کۆی داهاتی نێوخۆی وڵات بەسەر ژمارەی دانیشتواندا) ٣٨٥٦.٣ دۆلاری ئەمریکی، لە ساڵی ٢٠١٥ دا گەیشتە ٤٩٦٣.١ دۆلاری ئەمریکی. لە ئەنجامی ئەوەدا هەژاری کەمی کردو، لە ٥٤٪ دابەزی بۆ لە ١٩٪، بەپێی پێوانەی بانکی نێودەوڵەتی بۆ ڕێژەی دانیشتوان ئەوانەی کە لەسەر کەمتر لە یەک دۆلار دەژین لە ڕۆژێکدا. سامانی نیشتمانی عێراق گەشەی کردووە و، هەندێک بواری ئابووری وڵات پێشکەوتنیان بەخۆیانەوە دیووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، عێراق نە وڵاتێکی ئازادە و، نە سیستەمە سیاسییەکەی دەگاتە کەمترین پێوەرەکانی دیموکراسی (بڕوانە، ئیندێکسی فریدۆم و دیمۆکراتیک ئیندێکس). بەوپێیە، لە عێراقدا گەشەی سامانی نیشتمانی و زیادبوونی کۆی داهاتی بەرهەمی نێوخۆ لەگەڵ چەسپاندنی دیموکراسی، بەشێویەکی ئەرێنی ڕاستەوانە ناگۆڕن.

کۆتایی: ئەگەر ئەوە پەسند بکرێ کە زیادبوونی کۆی داهاتی بەرهەمی نێوخۆ گرنگترین هۆکارە بۆ زامنیی سەقامگیری سیستەمی سیاسیی و، ئەوەش پەسند بکرێ کە لە کرێیە

وڵاتدا نەوت بە بایەخترین سەرچاوەیە لە دروستکردنی داهاتی بەرهەمی نێوخۆ؛ کەواتە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە نەوت گرنگترین هۆکارە بۆ بەردەوامی سیستەمی سیاسی، جا ئەگەر ئەو سیستەمە دیموکراتیک بێ یا خۆسەپێن. ئەم ئەنجامگیرییە بۆ هەردوو جۆری سیستەمی سیاسی ڕاستە و بەسەر هەردوکیاندا دەچەسپێ. بۆ وێنە، سەبارەت بە نەوت، ئەو سامانەی کە لە نەوتەوە دەسکەوتووە بۆتە هۆکاری مانەوەی سیسەتەمە نادیموکراتیکەکان لە وڵاتانی کەنداودا. وەک پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، ئەو وڵاتانەی کە دیموکراتیک نین داهاتە نەوتییەکانیان گوزەریان بەرەو دیموکراسی دەئاڵقێنێ، چونکە ئەو سامانە کە لە نەوتەوە هاتووە سەرچاوەکەی دەرەکییە و پەیکەرەی دەوڵەت بەهێز دەکات و سیستەمی سیاسی کرێیە وڵات دەهێڵێتەوە.

هەر چوار هەڵبژاردنە نیشتمانییە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق، هێشتا ئەو ترسەیان نەڕەواندۆتەوە لە ئەگەری ئەوە کە سەرکردە عێراقییەکان ڕەوایەتی بکڕن، لە ڕێگەی فرۆشتنی نەوتەوە. ئەمە ئەگەرێکی بەهێزە لە نێو سێ پێکهاتە سەرەکییە نەتەوەیی و مەزهەبییەکەی عێراق بۆ نوێنەرایەتیکردن، بەو مانایەی، ئەو پێکهاتانەی کە دەستیان بە نەوت ڕاگەیشتووە (کورد و شیعە) چاکتر دەتوانن بانگەشەی هەڵبژاردنەکان بەڕێوەبەرن بە بەراورد لەگەڵ پێکهاتەکانی دی (سوننە). نەوتی عێراق پێویستی بۆ بەشداری سیاسی و نوێنەرایەتی کردن کەم نەکردۆتەوە، بەڵام لەهەمانکاتدا هاوکاری گوزەری زیاتر بەرەو دیموکراسیش نەبووە. بەڵێ سامان ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە کاریگەری کردنەسەر باری ڕامیاریی، لە عێراقدا لە بەرژەوەندی مانەوەی سیستەمە سیاسییەکەیدایە، کە لە ئێستادا فۆرمێکە لە دیموکراسیی ئاڵقاوە کە زۆر بنەمای نادیموکراسی لەخۆدەگرێ.

هەڵچنین لەسەر ئەوەی کە باسکرا تیۆری بە مۆدێرنەکردن لە عێراقدا ڕاست نایەتەوە. وڵاتەکە دەوڵەمەندە، بەڵام بەرەو بە دیموکراسیبوونی زیاتر نەڕۆیشتووە، ئەمەش پێچەوانەی گریمانە سەرەکییەکەی بەمۆدێرنەکردنە. لەگەڵ ئەوەشدا، عێراق وڵاتێکی پشتبەستوو بە نەوتە و وادەردەکەوێ پرۆسەی بەرجەستەبوونی دیموکراسی ئاسان نەبێ. پێشکەوتنی ئابووری دەتوانێ جۆرێک لە فۆرمی دیموکراسی لە عێراقدا بەرهەم بێنێ و بە بارێکدا ئەمە چاوەڕوانکراوە و ئەگەرە، بەتایبەت بەلەبەرچاوگرتنی هەڵبژاردنەکان، پەرلەمان و فیدرالیزم. بەڵام لەهەمانکاتدا، هۆکارێکی دیکە هەیە، ئەویش گرنگی و ناوەندێتی ڕۆڵی نەوتە وەک کاڵایەکی ئابووری-ڕامیاری، کە چەسپاندنی دیموکراسی دەکاتە ئەگەرێکی دوور.

# سەرچاوەکان


Al-Basri, F. K. and Al-Sebahi, M. (2013). The Political Economy of Iraq: Will Oil Burn Out Democracy?

Almond, G. (1956) ‘Comparative Political System The Journal of Politics, 18(3), p. 391-409.

Diamond, L. (1992) ‘Economic Development and Democracy Reconsidered, in Marks, G. and Diamond, L. (eds) Reexamining Democracy: essasys in Honor of Symour Martin Lipset. Newbury Park, CA: Sage.

Diamond, L. (1994) ‘Political Culture and Democracy in Developing Countries, Canadian Journal of Development Studies, (15), pp. 474-474.

Diamond, L. (1994) ‘Toward democratic consolidation. Journal of Democracy. 5(3) pp. 15+-

Diamond, L. (200) ‘What Went Wrong and Right in Iraq?, in Fukuyama, F. (ed.) Nation-Building: Beyond Afghanistan and Iraq. Maryland: Johns Hopkins University Press, pp. 173–195.

Diamond, L. (2004) ‘Transition to Democracy in Iraq?, Brown Journal of World Affairs, 11(1), pp. 45–53.

Diamond, L. (2005) ‘Lessons from Iraq, Journal of Democracy, 16(1), pp. 9-23.

Diamond, L. (2005) Squandered Victory: The Amecrican Occupation and the Bungled effort to Bring Democracy to Iraq. New York: Times books.

Diamond, L. (2005), Developing Democracy: Toward Consolidation. London: Johns Hopkins University Press.

Diamond, L. (2008) The Spirit of Democracy: the Struggle to Build Free Societies throughout the World. New York: Times books.

Foweraker J. and Landman, T (2002) ‹Constitutional Design and Democratic Performance,› Democratization, 9: 43-66.

Foweraker, J and Landman, T (2004) ‹Economic Development and Democracy Revisited: Why Dependency Theory Is Not Yet Dead›, Democratization, 11: 1-20.

Huntington, P. S. (1968) Political Order in Changing Societies. The Henry L. Stimson Lectures Series: Yale University press.

Huntington, P. S. (1991) The Third Wave: Democratisation in the Late Twentieth Century. Norman: University of Oklahoma Press.

Iles, T. (2012) ‘Iraq, Country Report. Iraq, (11), pp. 1–25.

Inglehart, R. (2000) ‘Culture and Democracy, in Harrison, L. E. & Huntington, S. (eds.) Culture Matters: How Values Shape Human Progress. New York: Basic Books.

Inglehart, R. and Baker, E. W. (2000) ‘Modernisation, Cultural Change, and the Persistence of Traditional Values. American Sociological Review. (65): pp. 19-51.

Kadivar, M. (1997) Theories of State in Shia Jurisprudence (in Persian). Tehran: Ney.

Kaiser, A. (1997) ‘Types of Democracy: From Classical to new Institutionalism, Journal of Theoretical Politics. 9(4): pp. 419-44.

Lawson, C. (2003) ‘How Best to Build Democracy: Laying a Foundation for the New Iraq, Foreign Affairs, 82(4), pp. 206-209.

Lawson, C. (2013) Iraq, 10 years on: Nation-building had been an act of folly before Iraq. So it proved again. Available at: http://www.independent.co.uk/voices/comment/

iraq-10-years-on-nation-building-had-been-an-act-of-folly-before-iraq-so-it-proved-again-8519512.html [Accessed: 23 August 2014].
Lawson, S. (1993) 'Conceptual Issues in Comparative Study of Regime Change and Democratisation. Comparative Politics, 25(2): pp. 183-205.
Lipset, M. S. (1959) ‹Some Social Requisites of Democracy: Economic Development and Political Development›, American Political Science Review, (53), pp. 69-105.
Lipset, M. S. (1981) Political Man: The Social Bases of Politics. Baltimore: The Johns Hopkins University Press.
Lipset, M. S. (1993) 'Reflection on Capitalism, Socialism and Democracy, Journal of Democracy, 4(2), pp. 43-45.
Lipset, M. S. (1994), 'The Social Requisites of Democracy Revised, The American Sociological Review, 59(2), p. 17.
Lipset, M. S. (1999) 'The Social Requisites of Democracy Revisited. American Sociological Review, 59 (1-22), p. 16.
Mahdi, K. (2007) 'Iraqs Oil Law: Parsing the Fine Print, World Policy Journal, 24(2), pp. 11–23.
Mahdi, K. (2007) 'Neoliberalism, Conflict and An Oil Economy: The Case Of Iraq, Arab Studies Quarterly, 29(1), p. 1-20.
Marsh, R. M. (1988) 'Sociological Explanations of Economic Growth, Studies in Comparative International Development, (23), pp. 41-76.
McKinlay, R. D. and Cohan, A. S. (1975) 'A Comparative Analysis of the Political and Economic Performance of Military and Civilian Regimes: A Cross-National Aggregate Study, Comparative Politics, (8), pp.1-30.
Muttitt, G. (2012) Fuel on the Fire: Oil and Politics in Occupied Iraq. London: CPI Group.
ODonnell, G. (1988) Bureaucratic Authoritarianism: Argentina, 1966-1973, in Comparative Perspective. Berkeley: University of California Press.
ODonnell, G. and Schmitter, P. C. (1986) Transitions from Authoritarian Rule: Tentative Conclusions about Uncertain Democracies. United States: Johns Hopkins University Press.
ODonnell, G. Schmitter, P. and Whitehead, L. Eds. (1986) Transitions from Authoritarian Rule: Latin America. Baltimore, MD: Johns Hopkins University Press.
OLeary, B. (2012) 'The Federalization of Iraq and the Break-up of Sudan, Government and Opposition, 47(4), pp. 481–516.
Przeworksi, A. (1991) Democracy and the Market. Cambridge: Cambridge University Press.
Przeworski, A. (1999) 'Minimalist Conception of Democracy: A Defence. In ed. Shapiro, I. and Hacker-Cordon, C. Democracys Value. Cambridge: Cambridge University Press.
Przeworski, A. (2003) 'Minimalist Conception of Democracy: A Defense in Dahl, R., Shapiro, I. & Cheibub, A. J. (eds.) The Democracy Sourcebook. London: The MIT Press.
Przeworski, A., Cherub, A. J. and Liming, F. (1998) 'Culture and Democracy. World Culture Report: Culture, Creativity and Markets. Paris: Unesco Publishing.
Webber, M. (1919) Politics as Vocation. Available at: http://anthropos-lab.net/wp/wp-content/uploads/2011/12/Weber-Politics-as-a-Vocation.pdf

گوڵنار

**دیداری گرووپی گوڵنار لەگەڵ زۆر بەڕێز پرۆفیسۆر عەلی قەرەداغی**

**ئەمینداری گشتی یەکێتی جیهانیی زانایانی موسڵمان و سەرۆکی ڕێکخراوی ڕابیتەی مرۆیی**

# لە ئابووریی ئیسلامییدا

## بە هیچ شێوەیەك دروست نییە

## دەسەڵاتداران بازرگانی بکەن



**گوڵنار: لە کاتێکدا جیهان بە دەست قەیران و کێشەی ئابووری قووڵەوە دەناڵێنێت و تا دێت جیاوازیی نێوان چینەکان فراوانتر و قووڵتر دەبێت، سیستەمی سەرمایەدارییش تا دێت سەرکێشتر و پاوانخوازتر دەبێت،  ئێمە دەپرسین: ئەنجامی ئەم بارودۆخە و بەردەوامیی ئەم ڕەوشە بە کوێ دەگات و چ سەرەنجامێکی دەبێت؟**

دکتۆر عەلی قەرەداغی: بسم الله الرحمن الرحيم، لە واقیعدا ئێستا خەڵک و زۆربەی نووسەرەکان و خاوەن فیکرەکان لە ئابوورییدا بە شێوەیەکی گشتیی، تەنانەت لە ئابووریی سەرمایەدارییشدا، بڕوایان وایە کە ئەم سیستەمی سەرمایەدارییە، توانای نییە کە کێشەی جیهانی نوێ چارەسەر بکات. پێشتر دوو سیستەم هەبوون، سیستەمی سەرمایەداریی و سیستەمی شیوعیی و ئیشتراکیی یەکێتیی سۆڤیەت، کە ساڵی ١٩٩١ دووەمیان ڕووخا، تەنانەت یەکێتیی سۆڤیەتیش لەگەڵ سیستەمەکە لەناو چوو، دواتریش سیستەمی سەرمایەداریی چەندین قەیرانی گەورەی تووش بوو، یەکێک لەوانە ساڵی ١٩٢٩ کە پێی دەوترێت (كساد العظيم – قەیرانە گەورەکە) کە تووشی بێ بازاڕییەکی گەورە بوو، کە تا ساڵی ١٩٣٤ بەردەوام بوو، کە سەرمایەداریی نەیدەتوانی چارەسەری زۆر شت بکات لەبەر چەند هۆکارێک، گەورەترین هۆکار ئەوە بوو کە تەنانەت وەک فیکرێکی سەرمایەداریی کراوەیە لەسەر ڕا و پێشنیارەکانی، بە پێچەوانەی ئیشتراکی کە خۆی داخستبوو، نەیتوانی گەشە بکات، ئەوەبوو ڕووخا.

سەرمایەداریی لە هەموو قۆناغێکدا کە تووشی گرفتی گەورە دەبێت، سوو لە سیستەمەکانی تر وەردەگرێت و فیکریان لێ وەردەگرێت، یان لە موفەکیرەکانی ترەوە. لە سیستەمی ئیسلامیی و ئیشتراکیی سوو وەردەگرێت و دەتوانێت جارێکی تر هەستێتەوە، لەو قەیرانە گەورەی کە پێشتر باسم کرد لە نزیکی ئەو ئەفکارانەی فەیلەسووفی ناسراو کینز کە چەند شتێکی پێشکەش کردن، تەقریبەن ١٠ چارەسەری بۆ دانان، بە گشتی نزیکی ٥٠ چارەسەری بۆ دانان، کە ٤٠یان لاوەکی بوون، کە تەماشای دەکەیت زۆربەیان لە بەرژەوەندیی ئابووری ئیسلامییە.

یەکێک لەوانە کۆت و لەمپەر خراوەتە سەر موزارەبات و قۆرخکاریی و ئازادیی سەرمایەداریی بۆ مامەڵە لەگەڵ کرێکاران، کە ئەمانە بەشێکن و بنەڕەتین لە ئابووریی ئیسلامییدا، جا لەبەر ئەو کرانەوەیەی هەیەتی، دەتوانێت بژی.

هۆکاری دووەمیش ئەوەیە کە ئێستە سەرمایەداریی بەدیلێکی نییە، تەنانەت ڕووسیای ئێستا لەسەر سەرمایەداریی دەڕوات، چین لەسەدا ٧٠ی لەسەر سەرمایەدارییە، کە ئەگەر بەدیلێکی بەهێز هەبووایە، وەک ئێمە دەڵێین بەدیلی ئیسلامیی، یان ئابوورییەکان دەڵێن: بەدیلی سێهەم، کە نە شیوعیی بێت و نە سەرمایەداریی بێت، کە نەک هەر من زۆرێک پسپۆڕی ئابووریی دیکەش پێیانوایە سەرمایەداریی بە تەواویی کز دەبوو.

من دەتوانم بە زانست و تەحەدداش بیڵێم کە ئەگەر بەراوردی بکەیت، سەرمایەداریی ئێستا بە بەراورد بە سەرەتای دەرکەوتنی سەرمایەداریی، کە پێیان دەگوت سەرمایەداریی ئازاد، زیاتر لە سەدا ٧٠ی گۆڕاوە، لە ڕووی بنەما و چارەسەر و سیاسەتەوە. لەبەر ئەوە زۆربەی زانایانی ئابووریی لەگەڵ ئەوەن ئابووریی لەسەر بنەمای عەدالەت بێت، چونکە سەرمایەداریی عەدالەتی ڕاستەقینەی تێدا نییە بەرانبەر هەژاران، هەرچەند ئێستا باشترە لە جاران، ئابووریی ئیشتراکییش عەدالەتی ڕاستەقینەی تێدا نییە بەرانبەر دەوڵەمەند و خاوەنماڵ، کە هەردووکیان ستەمە. ئەوەی کە چارەسەری ئەمە بکات، دەبێت زۆر دیراسەکراو بێت و دەوڵەتی بەهێز تەبەننی بکات. ئێمە چەند هەوڵ بدەین لە ڕووی فیکرییەوە زانستی ئابوورییمان بەهێز بکەین، دەبێت دەوڵەتی بەهێزت لەگەڵدا بێت بۆ پیادەکردنی. لەبەر ئەوە وادەزانم جیهان بەرەو ئابووریی دەڕوات، ئێمە بڕیار لەسەر واقیع دەدەین، کە چەند بنەمایەکی سەرەکیی هەیە کە ئەگەر تێیدا بێت و گونجاو بێت، دەتوانین بڵێین ئەو ئابووریی و زانست و سیستەمە قەبووڵکراوە و خزمەتی مرۆڤایەتیی دەکات.

بەڵام کێشەی ئێستای سەرمایەداریی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ململانێیەی هەیە، تەنانەت یاسای پێشکەشکردن و داواکردن، لە یاسای سەرمایەدارییدا ئەگەر ئازادی ڕەها بدەیت بە هەردوو لا، بێگومان خاوەن کارگە و خاوەن ماڵ دەسەڵاتی زیاترە خاوەنی کار و خاوەنی فیکر، ئێمە پشتیوان بە خوا هیوامان وایە ئابووریی بەرەو ئابوورییەکی باش بڕوات.

کە جەنگی جیهانی دووەم تەواو بوو، زیاتر لە ٤٠ وڵات کە وڵاتانی هاوپەیمان بوون و لە شەڕەکە سەرکەوتوو بوون لە ئەمریکا کۆبوونەوە، ئەوەی کە سوودی لە سیستەمی نەقدی وەرگرت لە ساڵی ١٩٤٤، هەر سەرمایەداریی بوو، بە تایبەت ئەمریکا و وڵاتانی سەرمایەدار، کە ئەگەر ئەم دەوڵەتانە تۆزێک دادگەریی و مرۆڤایەتییان هەبێت، وا دەزانم بەرەو ئابووریی سێیەم دەڕۆین، کە تا ئەندازەیەک دەتوانێت دادگەریی جێبەجێ بکات.

**گوڵنار: ئایا سیستەمی سەرمایەداریی لە هەناوی خۆیدا هەڵگری دژیەکی و کێشەی قووڵ نییە کە ئاوا لە واقیعدا بەرجەستە دەبێت؟ بە تایبەت کە بەڕێزت وتت: سەرمایەداریی لە چاو پێشتری خۆیدا لە سەدا ٧٠ی گۆڕاوە؟ ئەم گۆڕانە بەرەو کرانەوە و نەمانی جیاوازییە چینایەتییەکان ڕۆیشتووە یان زیاتر بەرەو چاوچنۆکیی و تەماعبازیی چووە؟**

دکتۆر عەلی قەرەداغی: زۆربەی گۆڕانەکان بۆ خزمەتی ئابووریی سەرمایەدارییە کە چۆن بتوانرێت بە هەر شێوەیەک بێت، چاک بێت یان خراپ، ئامانجی دەوڵەتی سەرمایەداریی ئەوەیە کە چۆن ئابووریی بەهێز بکرێت، ئەوان جاران دەیانوت (ئابووریی و سیاسەت دووڕووی دراوێکن) بەو مانایەی کە ئەگەر ئابوورییت بەهێز

بوو، سیاسەتیشت بەهێزە، بە پێچەوانەشەوە. بەڵام دوای ڕووخانی یەکێتیی سوڤیەت، خۆم گوێم لە جۆرج بۆشی باوک بوو لە ساڵی ١٩٩١دا وتی: «ئێمە دەڵێین هەموو شتێک لە پێناوی بەهێزبوونی ئابووریدایە» کە ئێستاش جۆبایدن دەڵێت: چین وا نەزانێت دەبێتە دەوڵەتی یەکەم، ئێمە بە هەموو کۆششی خۆمان هەوڵ دەدەین لە پلەی یەکەمدا بین و بمێنینەوە»

تەنانەت ئەم ململانێیە بۆ زیاتر هەیمەنە و بەهێزکردنی سەرمایەدارییە، بەڵام لەژێر سێبەری ئەم گۆڕانکارییەش چەند شتێکی باش هەیە، جاران لە سەرمایەداریی ئازاددا دەرفەت نەبوو نرخدانان هەبێت، دوای ئەوەی کرێکاران خۆپیشاندانی زۆریان کرد، ئەوە بوو سەندیکاکانی کرێکاران دامەزران، دواتریش هەر بەهۆی بێزاریی خەڵکەوە نرخدانان کرا، بۆ ئەوەی سنوورێک بۆ تەماعی سەرمایەداریی دابنرێت، جگە لەوەش کرێی کرێکار و ئەوانە هەمووی گۆڕانکارییە لەسەر سەرمایەداریی و بە زۆر پێیان کراوە و خەڵک تا ڕادەیەک سوودمەند بوون، بەڵام زۆربەی سوودەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەرمایەداریی خۆی، کە چۆن هەیمەنەی هەبێت لەسەر جیهان.

**گوڵنار: هەم سەرمایەداریی و هەم ئیشتراکییەت بەرهەمی فیکری مرۆڤن، جەنابیشت باست لەوە کرد هەم ئیشتراکییەت زوڵمە لە دەوڵەمەند، هەم سەرمایەداریی زوڵمە لە هەژار، کاتی ئەوە نەهاتووە ئەو مرۆڤانەی کوشتەی دەستی ئەم دوو سیستەمەن، بە دوای ئەڵتەرناتیڤێکی تردا بگەڕێن لە جیاتی سەرمایەداریی بۆ سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی داهات لەسەر بنەمای دادگەریی؟ وە ئیسلام لە کوێی ئەم هاوکێشەیەدا دەبێت، بە تایبەت کە زۆربەی موفەکیرەکان دەڵێن: «گەورەیی و هۆکاری مانەوەی ئیسلام، لە شمولییەت و گشتگیرییەکەیدایە کە خودا دایناوە، نەک مرۆڤ» ئایا ئیسلام دەتوانێت ببێتە ئەم ئەلتەرناتیڤە بە ڕەحمەی کە هاوسەنگ بێت لە نێوان زوڵمی ئیشتراکییەت و سەرمایەدارییدا؟**

دکتۆر عەلی قەرەداغی: لە واقیعدا نەک ئێمەی خاوەن فیکری ئیسلامیی ئەمە بڵێین، ئەگەر موتابەعە بکەن لە قەیرانی ٢٠٠٨ زۆربەی ئابووریناسان و تەنانەت سیاسییەکانیش وتیان:» ئەم قەیرانە، قەیرانێکی ئەخلاقیی و ئینسانییە» ئەو کاتە مێرکڵ و سارکۆزیش ئەو قسەیان کرد. دواتر چەند ئوستازێک کە خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ بوون لە ئابووریدا ئەوەیان وت، تەنانەت ئەو گۆڤارەی کە فەرمییە بۆ پاپای ڤاتیکان باسی ئەوەی کرد کە ئەم زوڵم و زۆرەی ئەم سیستەمانە دەگەڕێتەوە بۆ سەرمایەداریی، لەبەر ئەوە ئێمە هیوامان وایە ئابووریی ئیسلامیی کە بریتییە لە ئەخلاق، ببێتە جێی ئومێدی مرۆڤایەتی، هەروەها لەگەڵ ئایینەکانی دیکەش هاوبەشیمان زۆرە، لەبەر ئەوە پێشوازییان لێکرد و ئەوانیش وتیان: «ئێمە پێویستمان بەوەیە بگەڕێینەوە بۆ ئابوورییەکی ئەخلاقیی و

ئینسانیی و دادگەریی» بە حسابی ئەو گۆڤارە وتیان ئەو مەرجانە لە ئابووریی ئیسلامیدا هەن، هەروەها چەند زانایەکی گەورەی ئابوورییش باسی ئەمەیان کرد، بەڵام بێگومان پێویستە ئەم ئابوورییە خزمەت بکرێت و بکرێتە پرۆژە و بەرنامە، چونکە بەم شێوە گشتییە ڕۆژئاوا قەبووڵی ناکات.

ئێمە دوو ئابوورییمان ئەزموون کردووە وەک پێشتر باسمان کرد، هەردووکیان شکستیان هێنا، سەرمایەدارییش بۆیە جار جار دێتەوە، لەبەر ئەوەی کەسی دیکە نییە ببێتە جێگرەوەی، تا شکستی تەواوی پێ بهێنێت و مەیدانەکەی پێ چۆڵ بکات، سەرمایەدارییش لەو پێنج شەش بنامەیەی کە هەیەتی، ناتوانێت دەربچێت، کە یەکیان ئەوەیە ئازادییەکی بێ سنووری هەیە، کە ئێمە لەگەڵ ئازادیین، بەڵام بەو شێوەیە نا. زۆربەی یاساکانیش سەرمایەداریی دایاندەنێت کە دەرفەتی زۆر دەدات، لەبەر ئەوە قۆرخکاریی و ململانێ زۆر ئاشکرایە، هەرچەند وەک وتم بەهۆی دۆخەکە و خۆپیشاندانەکانەوە زۆر شت پەیدا بووە، کە یارمەتیدەرە بۆ سۆشیال، لەبەر ئەوە ئێمە وادەزانین ئەگەر موفەکیرین و ئابووریناسان و شەرعییەکان و زانایانی کۆمەڵایەتیی موسڵمانان دابنیشن دەتوانن بنەمای کرداریی زانستیی لە ئیسلامدا دابنێن، چونکە لە ئیسلامدا ئەوەندە هەیە کە سیستەمێکی زۆر جوانی ڕێکوپێکی تێدا دروست بکەن.

> **لە ئابووری ئیسلامیدا بە هیچ شێوەیەك دروست نییە دەسەلاتدار و خاوەن بڕیارەکان کار بکەن لە بازاڕدا و بازرگانی بکەن.**

نالێم ئێمە ئەو پرۆژەیەمان پێشکەشکردووە، بەڵام زانیارییە گرنگەکانی ئەو پرۆژەیەمان پێشکەش کردووە لە ساڵی ٢٠١٠ بۆ کۆنگرەیەکی لوتکەی ئابووریی عەرەبی، بەڵام بەداخەوە قەبووڵیان نەکرد، لەبەر ئەوەی لایەنی ئیسلامییە، بەڵام دەتوانین پرۆژەیەکی بێ کەموکوڕی دروست بکەین کە هەموو لایەنە باشەکانی سەرمایەداریی و ئیشتیراکییەتیشی تێدابێت.

پەتای کۆرۆناش لە ئێستادا ئاشکرایکرد کە سەرمایەداریی زۆر زۆر شکستخواردووە بۆ خزمەتی مرۆڤایەتیی، بۆ نموونە دەوڵەتێکی وەکو ئیتاڵیا کە حەوتەمین دەوڵەتە لە ئابووریی جیهاندا، بەڵام دوو هەزار قەرەوێڵەی هەبوو بۆ نەخۆش، بۆ نزیکەی ٥٠ ملیۆن

کەس، بەو ئابوورییەوە ئامادە نەبووە ملیارێک دۆلار تەرخان بکات بۆ نەخۆشخانە بۆ خەڵک بە گشتی. ئەمریکا بەو گەورەییەوە بە تایبەت لە سەردەمی ترەمپ ئاشکرا بوو کە زۆر شپرز بوو، کە داهاتی نیشتیمانی نزیکەی ١٣ ملیار دۆلارە، کە دەیسەلمێنێت ئابووری سەرمایەداریی ئەنانییە و خۆپەرستە بۆ خزمەتی ماڵ نەک خزمەتی مرۆڤ! ئادەم سمیس دەڵێت: «خۆشگوزەرانیی بۆ خزمەتی مرۆڤە» بەڵام لە ڕاستیدا خزمەتی خاوەنماڵ و سەرمایەدارە، ئەمەش زەبرێکی بەهێز بوو، تەنانەت دەوڵەتانی سەرمایەداریی هاوکارییکردنی یەکترییان نییە، کە وایکرد خەریک بوو ئیتاڵیا لە یەکێتیی ئەورووپا دەربچێت. ئەمانە هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەم سیستەمە ئەنانییە، وەک لە قورئاندا باسی کراوە وەکو فیکری قارون، (انما أوتيت على علم عندى) واتە: من خۆم دروستم کردووە و خۆم مافی ئەوەم هەیە بیخۆم، بۆچی بیدەم بەو هەژارانە!

**گوڵنار: زۆرجار دەگوترێت ئیسلام کۆمەڵێک بنەمایە لە دەروونی تاکەکانیدا، بۆیە جوگرافیایەک و شتێکی ماددی نییە بە شەڕەقۆچە سیاسیی و سەربازییەکان تێک بشکێنرێت و نەمێنێت، ئێستا دوای شکستی ئیشتراکیی و لاوازی سەرمایەدارییدا، سیستەمی ئابووریی ئیسلامیی بەبێ بوونی سیستەمێکی سیاسی و سەربازی، یا بەبێ بوونی دەوڵەتێک، دەتوانێت لە داهاتوودا ببێتە جێگرەوە؟**

دکتۆر عەلی قەرەداغی: لە ڕاستییدا ئابووریی پێکهاتووە لە چوار شتی بنەڕەتی:

یەکەم: زانست

دووەم: سیستەم

سێهەم: تیۆر

چوارەم: شیکاریی.

ئێمە وەک بەرنامە و کۆڵەکە هەموویمان لە قورئانی پیرۆز و سوننەتدا هەیە، ئێستاش زانایانی سەردەم ئەمانەیان دەرهێناوە، من کتێبێکم هەیە بە ناوی (حقيبة إقتصادية) کە ١٤ بەرگە، کە شەرحی ئەم چوار بەشە دەکات، بەڵام بۆ پراکتیزەکردنی پێویستت بە دەسەڵات و حکومەت هەیە، دەنا فیکرەکە بوونی هەیە. لە قەیرانی ٢٠٠٨ و ٢٠٠٩ و ٢٠١٠، بۆیە بانکی ئیسلامیی لەو قەیرانەدا زیانێکی وای نەکرد، ڕۆژئاوا ئەوەیان باشە موتەوازیعن، بۆیە ئەمە وایکرد سەرنجیان ڕابکێشێت بۆ ئەم ئابوورییە، من شەخسییەن پێشوازیم لە چەند وەفدێکی گەورە کرد، لەوانە ڕاوێژکارانی گەورە لە بەریتانیا لەسەر ئاستی مەکتەبی سەرۆکایەتیی وەزیران، پرسییان چۆن ئەم هەنگاوانەمان بگوازینەوە بۆ ڕۆژئاوا، ئێمەش ئامۆژگاریی خۆمان دا، لە چاوپێکەوتنی کریستیانا جۆرجیفا وەزیری ئابووریی ئەو کاتە، کە ئێستا سەرۆکی بانکی نێودەوڵەتییە کە دوو جار موقابەلەم کردووە، لە یەکێکیاندا کە خۆی داوای کردبوو، وتی: «ئابووریی ئیسلامیی چییە؟ ئێمە

چۆن دەتوانین جێبەجێی بکەین؟» لە ڕاستیدا تەماشامان کرد وەڵامەکانی ئێمە زۆر جێی باوەڕی بوو، تەنانەت جارێک یەکێک لە وڵاتە عەرەبییەکان حەزی نەدەکرد بە ڕیبا قەبووڵی بکات، ڕاوێژی بە من کرد کە پارەکە لە بانکی دەولییەوە بوو نزیکی چوار ملیار دۆلار بوو بۆ یارمەتیدانی ئەو وڵاتە، بەڵام دەتانەوێت ئەو پارەیە چی لێ بکەن؟ وتیان بۆ شەمەندەفەر، وتم من پرۆژەیەکتان بۆ پێشکەش دەکەم، دام بە سەرۆکایەتی ئەو وڵاتە، کرستیان لاداریش پرۆژەکەی قەبووڵ کرد، وتی ئەمە باشترین پرۆژەیە بۆ ئێمە، وتی ئێمە نامانەوێت پارەکەتان بدەینێ، ئێمە دەمانەوێت پارەکەتان بۆ بکرین، دوایی قازانجی خۆشمان وەربگرین، جا لەبەر ئەوە ئێستا ئابووریی ئیسلامیی هەیە و جێبەجێکردنەکەشی هەیە، بەڵام تۆ بتەوێت بیکەیت بە سیستەم و کاری بۆ بکەیت بە تایبەت لە بواری سیاسەی نەقدیی و ئابووریی و دارایی، ئەمانە هەمووی بە دەست دەوڵەتە و بە دەوڵەت دەکرێت. گەورەیی ئیسلام خۆی هەیە، بەڵام جێبەجێکردنەکەی و چالاککردنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەوڵەت.

**گوڵنار: تا چەند چەمکی بازاڕی ئازاد و ئەوەی پێی دەوترێت کەرتی تایبەت و لاوازکردنی ڕۆڵی دەوڵەت لە چاودێریی و خۆتێهەڵقورتاندنی لە بازاڕ بووەتە هۆی ناعەدالەتی لە دابەشکردنی داهاتدا؟**

دکتۆر عەلی قەرەداغی: یەکێک لە ئیجابیاتی سەرمایەداریی ئەوەیە کە ئەوەی لە دەسەڵاتدایە دەبێت دوور بکەوێتەوە لە بەڕێوەبردنی تەنفیزی کۆمپانیاکان، تەنانەت ترەمپیش، هەرچەند زۆر پابەند نەبوو، بەڵام خۆی دوورخستەوە بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی تێکگیرانی بەرژەوەندییەکان. لە ئابووریی ئیسلامییدا بە هیچ شێوەیەک شەرعەن دروست نییە دەسەڵاتدار و خاوەن بڕیارەکان کار بکەن لە بازاڕدا و بازرگانی بکات. ئیبن خەلدون کە دامەزرێنەری زانستی ئابوورییە، دەڵێت: «ئەگەر خاوەن دەسەڵات چوونە ناو بازرگانییەوە، ئەوە بازرگانییەکەش دەفەوتێنن و خۆشیان گەندەڵ دەبن» وەک ئێستا لە زۆربەی وڵاتەکان دەیبینین، چونکە کەسێکی ئاسایی دەتوانێت ڕکابەریی سەرۆکوەزیران یان حیزبێکی گەورەی سیاسیی و وەزیرێک و تەنانەت پارێزگارێک بکات، موافەقەت بۆ ناکەن کە چی دەکەیت؟ بەڵگەش لەسەر ئەمە چییە؟ حەزرەتی ئەبوبەکر کە یەکەم ڕۆژ کرا بە خەلیفە، ڕۆژی دوایی شتی خۆی هەڵگرت بچێت بۆ بازاڕ، جەماعەتی هاوەڵان وەک ئەبوعوبەیدە و ئەوان وتیان ئەوە بۆ کوێ دەچیت؟ وتی ئەی چۆن بژیم؟ وتیان تۆ ئێستا دەبێت خۆت یەکلا بکەیتەوە بۆ کار و نابێت خەریکی ئەو شتانە بیت، بچیتە ناو بازاڕ، خەڵک شتەکان لە تۆ دەکرێ□ت و لە خەڵکی تری ناکرێت! ڕێگەیان لێگرت بە شێوەیەکی گشتیی، دواتر مووچەیان بۆ دانا، هەروەها حەزرەتی عومەر خۆیشی موتابەعەی ئومەراکانی دەکرد، ڕیوایەتیش هەیە وەک تەبەری دەڵێت هەر ئەمیرێکی دابنایە، دەیوت

بچۆ لای فڵان کەس کە پێی دەگوترا بەرپرسی بەیتولمال، بە لیست بینووسە کە چیت هەیە، من هەموو ساڵێک لێپێچینەوەت لەگەڵ دەکەم بزانم چەندێک زیادی کردووە؟ هەموو ساڵێک لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکردن، ئەگەر بە سرووشتیی زیادی بکردایە، نیوەی لێ وەردەگرت، کابراش دەیگوت بۆ لێم وەردەگریت؟ عومەریش دەیگوت خەڵکەکە بە هەر شێوەیەک بێت زانیویانە ئەو کەسابەتە پەیوەندیی بە تۆوە هەیە! ئەگەر بیشیزانیایە غەش و خیانەتێکی تێدایە، هەمووی لێ وەردەگرت! لەبەر ئەوە تەدەخولی خاوەندەسەڵات بۆ بازرگانیی، کێشەیەکی زۆر گەورەیە لە ئابووریی ئیسلامیی و ئابووریی سەرمایەدارییدا، لەبەر ئەوەشە کە ئابووریی سەرمایەداریی تا ڕادەیەک سەرکەوتووە. ئەو قسەیەی ئیبن خەلدون ڕەنگیدایەوە لەم سەردەمەدا، کە نزیکەی ٦٠٠ ساڵ پێش ئێستا ئەو قسەیەی کردووە.

**گوڵنار: ئایا ڕۆڵی کەرتی تایبەت زیاد لە قەبارەی خۆی نابێتە هۆی قۆرخکاریی زیاتر تا ڕادەی چەوسانەوەی تاکەکان؟**

دکتۆر عەلی قەرەداغی: لە ئابووریی سەرمایەدارییدا، کەرتی تایبەت ئەساسە، دەوڵەتیش هیچ ڕۆڵێکی نییە، لە ئێستاشدا لە سیستەمی ئیشتراکییەتی کردەییدا، کەرتی تایبەت هیچ ڕۆڵی نییە و هەمووی پەیوەندیی بە دەوڵەتەوە هەیە، کە خاوەنی پرۆژە و پلان و دابەشکردن و ئاڵوگۆڕ و هەموو شتێکە، لە ئیسلامدا ڕ□ەوشەکە نێوەندگیر و هاوسەنگە، کەرتی تایبەتمان هەیە و ڕێزلێگیراوە، بەڵام کۆت و بەندی لەسەرە. هەرچیمان هەیە بۆ خزمەتی کۆمەڵگا و مرۆڤایەتییە، دەوڵەتیش موڵکیەتی خۆی هەیە، ئوممەتیش موڵکیەتی هەیە، واتە سێ موڵکیەتمان هەیە، (موڵکیەتی تاک، موڵکیەتی دەوڵەت، موڵکیەتی ئوممە بۆ داهاتی سرووشتی). داهاتی سرووشتیی موڵک نییە بۆ دەوڵەت، بۆ نموونە پترۆڵ، دەوڵەت ناتوانێت بیفرۆشێت، بیشیفرۆشێت بەتاڵە، دەبێت تەسەروفی تێدا بکات شەرعییەن بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەک بێت، تەسەروفەکەی پەیوەست بێت بە کاتێکەوە، بۆ ساڵێک و دوو ساڵ و سێ ساڵ، ناتوانێت بیرە نەوتەکان بفرۆشێت، لە ئیسلامدا ڕۆڵی دەوڵەت ئاڕاستەکردن و یاسادانانە، نابێت بە شێوەیەک بێت ڕێگە لە کاری خەڵک بگرێت.

**گوڵنار: ڕووکردنە بازاڕی پشکەکان و ئاڵوگۆڕی دراو و قەواڵە داراییەکان، چ زیانێکی بە ئابووریی ڕاستەقینە و کۆی بەرهەمی ناوخۆیی گەیاندووە؟**

دکتۆر عەلی قەرەداغی: بێگومان یەکێک لە بنەماکانی ئابووریی، جێگیربوونی دراوە، لە هەموو ئابوورییەکانی (سەرمایەداریی، ئیشتیراکیی، ئیسلامیی)، چونکە دراو بریتییە لەوەی پێوەری هەبێت و هاوسەنگ بێت، جا ئەگەر پێوەرەکە خۆی کێشەی هەبێت، دەبێتە کێشەیەکی زۆر زۆر گەورە، لە قورئاندا حەزرەتی شوعەیب کە پێغەمبەرێکی ئابوورییە

و ئێستا من خەریکم کتێبێکی لەو بوارە لەسەر دەنووسم، باسی ئەمەی زۆر کردووە، لە قورئانی پیرۆزدا تەدەخولکردن و دەستکارییکردنی لە دراو بە گەندەڵی داناوە: (ولا تبخس الناس أشياوهم)، (ولا تأسوا فی الآرچ مفسدين). زانایان دەڵێن: (تبخس الناس أشياوهم أی نقودهم) وەکو هەڵاوسان، (ولا تأسوا فی الآرچ مفسدين) ئیعتباری کردووە بەوەی ئەوانەی کار دەکەن لەو بوارە فەسادێکی گەورە دەکەن، بۆ نمونە لوبنان، ئەو خەڵکە قورپەسەرە خاوەنی ماڵ و دراو بوون، کاتێکیان زانی هیچ قیمەتی نەما، بۆ نمونە تۆ ملیارێک لیرەت هەیە، لیرە ١٥٠٠ دۆلارێک بوو، کاتێکت زانی ١٣ هەزار بۆ ١٤ هەزار بەرانبەری دۆلارە و دۆلاریشی پێ ناکڕدرێت، تۆ ٢٠ ملیار لیرەت هەیە و خاوەنی هیچیش نیت، ئەمە فەسادێکی زۆر گەورەیە.

به داخەوە من کاتی خۆیشی لە عێراقدا وتم بە زوڵم لەسەدا ٢٠ هێنایانە خوارەوە، مانای ئەوە بوو کە لە سەدا ٢٠ی سەروەتی هەموو ئینسانێک کەمی کرد، ئەوە تەنانەت پێی دەوترێت دزیی، ئێمەش پێی دەڵێین دزیی لە باخەڵ بەپێی ئابووریی ئیسلامیی، ئەوەش ئەوەیە کە تۆ هەڵاوسان دروست بکەیت، بۆ نمونە ئێستا کەسێک هەزار دیناری لایە، جاران هەزار دینار ٨٠ یا ٩٠ پێنس بوو، ئێستا ٥٠یە، واتە ٣٠ پێنسی لێ دزیویت، لەبەر ئەوە ئەمانە ڕۆڵی زۆرە، هەر وڵاتێک بیەوێت جێگیر بێت، یەکەم شت جێگیربوونی دراویەتی.

**گوڵنار: کەڵەکەبوونی قەرزی گشتیی و زیادبوونی بە شێوەیەکی پێوانەیی لە جیهاندا بە تایبەت ژێرکەوتن و هەرەسهێنانی کۆمەڵێک سیستەمی ئابووریی وڵاتان بە هۆی قەرزی دەرەکییەوە، بەرەو کوێ دەچێت و بەرەو کوێ هەنگاو هەڵدەهێنێتەوە؟**

دکتۆر عەلی قەرەداغی: بێگومان ئەمە لە ئابوورییدا شتێکی زۆر سلبییە، شوێنەواری زۆر زۆر خراپ دەبێت بۆ لایەنی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی، زۆربەی وڵاتانیش کە وڵاتانی دیکەیان داگیر دەکرد لە سەدەی ١٩، یەکێک لە بیانووەکان ئەوە بوو کە ئەوە بوو دەیانوت ئێمە قەرزمان داوە بە تونس یان مەغریب و ئەوان پارەکەیان نەگێڕاوەتەوە، دواتریش سیادەی دەوڵەت زۆر زۆر لاواز دەبێت، ئەگەر قەرزی لەسەر بێت، جگە لەوەش مەسەلەی تێچووی سوو کە جاری وا هەیە لە ماوەیەکی کەمدا قەرزەکە دەکاتە دووئەوەندە و زیاتر، کە دەبێتە فشارێک لەسەر گەل، چونکە بۆ ئاییندە تۆ هەرچی داهاتت هەیە هەر بەشی سووەکە دەکات، ئێستا هەندێک دەوڵەت هەیە هەرچی داهاتی لە سەرمایە دەمێنێتەوە دەیدات بە سوو، ساڵی دوو بۆ چوار ملیار کە هەر ئەوەندەش داهاتی هەیە، ئەمە کێشەیەکی زۆر گەورەیە، حکومەت کە بیەوێت ئاییندەی هەبێت قەرز ئەوەندە دەکات کە بتوانێت بە ئاسانی بیداتەوە، دواتریش دەبێت قەرزەکە بەرهەمهێن بێت، ئەگەر قەرزەکە بەکاربەر بێت، دەبێتە کێشەیەکی زۆر زۆر گەورە، ئەگەر بەرهەمهێن بێت

دەتوانێت پڕۆژەیەکی باشی پێ بکات. بۆ نموونە کارەبا، کە سی ساڵە تا ئێستا کارەبای ڕێک نەخستووە، من جارێک حسابم کرد ئەوەندەی پارە دراوە بە کەرتی تایبەت بۆ کارەبا، ٥٠ کارگەی پێ دەکرێدرا.

ئەمانە بەشێکن لە هەڵاوسان، کەواتە زیادبوونی قەرز کێشەیەکی زۆر گەورەیە، جاری وا هەیە دەگەڕێتەوە بۆ مەسەلەی گەندەڵی، تەنانەت لە قەرزەکەدا گەندەڵی هەیە، هۆکاری قەرزەکە گەندەڵی تیا هەیە، ئیتر گەندەڵیی لە گەندەڵییدا.

**گوڵنار: تا چەند ئەو چارەسەرانەی دامەزراوە ئابوورییەکانی جیهان پێشکەشی وڵاتانی هەژار و پەککەوتووی دەکەن دەبێتە هۆی هەستانەوە و باشبوونی ئەم ڕەوشە؟**

دکتۆر عەلی قەرەداغی: هەیە سوود لە قەرزی سندوقی دراوی نێودەوڵەتیی وەردەگرێت، خەرجی دەکات لە لایەنی گەشەپێدان و پیشەسازیی و کشتوکاڵیی و گەشتیاریی، لەم کاتەدا بێگومان کاریگەریی ئیجابیی دەبێت لەسەر کۆمەڵگە، بەڵام بەداخەوە زۆربەی ئەو قەرزانەی لە وڵاتانەوە دێت قەرزی بەکاربەرین، یان بۆ ڕێکخستنەوەی عەجزی میزانییە، کە هیچ دەورەیەکی ئابووریی دروست ناکات، لەبەر ئەوە دەبێتە کێشە. سندوقی دراوی نێودەوڵەتیی و وڵاتە گەورەکانیش کە قەرز دەدەن، مەرجی زۆریان هەیە، کە کاریگەریی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی هەیە، بۆ نموونە کە قەیرانی ساڵی ١٩٩٧ دروستبوو، کێشەی ئەوە دروستبوو کە شەش دەوڵەت زۆر پێشکەوتن، کە: (مالیزیا، ئەندەلوسیا، سەنگافورە و کۆریای باشوور) لەوان بوون، کە پێیان دەوترا پڵنگی بەهێز، بەڵام چەند سەرمایەدارێکی گەورە لەوانە، جۆرج سکوێرس، کە خاوەن داهاتێکی زۆری جولەکە بوو لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە موئامەرەیەکیان کرد لەسەر ئەم شەش دەوڵەتە و توانییان تا سنوورێک زیانێکی زۆریان پێ بگەیەنن، ئەوە بوو کە پشکی زۆری وڵاتەکانیان کڕی، دواتر پێشنیاریان کرد لەسەر یاسای خواست و خستنەڕوو، شتەکان شکا، بەهەر حاڵ، لەم کاتەدا سندوقی دراوی نێودەوڵەتیی عەرزی کرد بۆ چەند دەوڵەتێک، مالیزیا قەبووڵی نەکرد، کە سوپاس بۆ خوا لە سەردەمی جەنابی مامۆستا مەهاتیر موحەممەد زۆر زۆر پێشکەوت.

**گوڵنار: ئایا پێوێنی گەشەی ئابووری (مؤشر نمو الإقتصادی) تا چ ڕاددەیەک مانای خۆشگوزەرانیی ڕاستەقینەی هاوڵاتیان دەگەیەنێت؟**

دکتۆر عەلی قەرەداغی: گەشەی ئابووریی، واتە زیادبوونی ماڵ، هەرگیز بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کۆمەڵگە بەختەوەرە یان دەوڵەمەندە، بەڵکو مەبەست لێی ئەوەیە ئابووریی دەوڵەت زیادی کردووە، هەروەها ئابووریی گشتیی زیادی کردووە، جاری وا هەیە ئەم گەشەیە دەگەڕێتەوە بۆ داهاتی سەرمایەدارەکان کە زیادی کردووە. بۆ نموونە ئەم دەوڵەتە لە سەدا دوو ئابووریی زیادی کردووە، بەڵام چۆن زیادی کرد و کێ زیادی کردووە؟

زۆربەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرمایەدارەکان، یان دەوڵەت زەڕیبەی زۆری وەرگرتووە و پارەکەی زۆرتر بووە، ئەمە گەشەی ئابوورییە، لەبەر ئەوە لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٩١ و ١٩٩٢ موناقەشەی ئەم بابەتە کرا، وتیان نابێت ئێمە وەک نەتەوە یەکگرتووەکان گرنگی بە گەشەی ئابووریی بدەین، ئێمە گرنگی بدەین بە گەشەپێدانی ئابووریی، هاتن وتیان ئێمە لە ساڵی ١٩٤٥ەوە لە تەمەنی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە تا ساڵی ١٩٩٢ ملیارات دۆلارمان سەرفکردووە لەسەر جیهانی سێهەم و هیچ سوویشی نەبووە، تەماشایان کرد کە ئەوان گرنگییان داوە بە گەشەی ئابووریی، چەند کەسێک سوودیان لێ بینیوە، گرنگییان نەداوە بە گەشەپێدانی ئابووریی ناوخۆیی بۆ گۆمەڵگە، گەشەپێدانی ئابووریی کاریگەری هەیە بۆ ئەوەی ژێرخانی وڵاتەکە باشبێت و یاسای باش و بیمەی کۆمەڵایەتیی باش هەبێت، ئەمانە هەمووی پێیان دەگوترێت گەشەپێدانی ئابووریی.

**گوڵنار: لە تەوەری دووەمی گفتوگۆکەمان دێینە سەر سیستەمی ئابووریی ئیسلامیی، سیستەمی ئابووریی ئیسلامیی چییە و کامەیە و چۆن پێناسەی دەکەن؟ ڕواڵەت و بنەماکانی سیستەمی ئابووریی ئیسلامیی چین؟**

دکتۆر عەلی قەرەداغی: وەک ئاماژەم پێ دا، ئابووریی چوار بنەمای بنەڕ□ەتی هەیە, یەکەم: زانستی ئابووریی کە بریتییە لە مەبادیئی گشتیی بۆ ئیدارەی ماڵ و سەروەت، بۆ چ شتێکیش ئیدارەی دەکەیت؟ کە لە ئیسلامدا بۆ چوار شتە، کە لە سەرمایەدارییدا بۆ یەک شتە، ئەویش بەدەستهێنانی خۆشگوزەرانیی و هێزی دەوڵەتە، لە ئیسلامدا یەکەم بۆ بەدەستهێنانی عیمران و شارستانەت، دووەم بۆ خۆشگوزەرانیی مرۆڤ کە بەشێکی ئەساسییە، سێیەمیش بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریی مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتیی، لە ڕێی زەکات و مافەکانی دیکەوە، چوارەمیش بۆ پاداشتی ڕۆژی دوایی.

دوای ئەمانە، وەک زانست، دەگەڕێینەوە بۆ بابەتی سیستەم، کە بریتییە لە ئایدلۆژییایەک، ئایدلۆژییەتی ئابووریی، بریتییە لە خاوەندارێتیی، ئەمەش زۆر گرنگە کە ئایا جۆری خاوەندارێتیی ئازادە بۆ تاک بە گشتیی، جگە لە کۆت و بەندێکی بچوک، وەک سەرمایەداریی یان موڵکیەت ڕەتکراوەتەوە، وەک سیستەمی ئیشتراکیی، سیستەمی ئابووریی ئەو خاوەندارێتییە دیاری دەکات، کە بەستراوەتەوە بە ڕێوشوێنێکی کۆمەڵایەتیی، لە ئەنجامی ئەوەوە عەقیدە و ئەخلاق دەچێتە سەر ئەو بوارە، کە کاریگەری دەبێت لە شەش شتی بنەڕەتیدا، یەکەم لە تەمەلوک، دووەم لە بەرهەم، پاش ئەوە لە بەکارهێنان، دواتر لە ئاڵوگۆڕی دراوی نێودەوڵەتیی و دەرەکیی و ئەمانە، پێنجەم دابەشکردن، کە چۆن کاڵاکانی بەرهەمهێنان دابەش دەکەیت؟ ئەگەر سەرمایەدار بێت، قازانجی هەیە، ئەگەر زەوی بێت چۆنە؟ ئەگەر کار بێت چۆنە؟ دواتر

دەچێتە سەر دووبارە دابەشکردن کە ماڵەکە زۆر دەبێت دووبارە دابەشکردن هەیە، لە ڕێی زەکات و باج و تا دوایی، کە ئایدلۆژییەتی ئیسلامیی تەداخول دەکات لە هەموویدا کە ئاڕاستەی بکات بۆ ئەوەی لایەنی کۆمەڵایەتیی تێدا بەهێز بێت، بەشێکی بنەڕەتی لە تەکافول بە دەست بێت و کۆمەڵگەیەکی بەختەوەر پێک بێت، دواتر دەچینەوە سەر تیۆرەکانی ئابووریی، کە بریتییە لە گریمانە کە چۆن ئەو کێشەیە چارەسەر دەبێت، کە پێشنیاری خۆی دەکرێت، زۆربەی چارەسەرەکانیش لە ڕێگای شیکارکردنەوە دەکرێت، کە شیکارێکی ئابووریی دەکەیت بە شێوەیەکی ڕێکخراو، کە ئایینی بەرزی ئیسلام هەموو مەبادیئەکانی باس کردووە، زانایانی سەردەمیش بە وردەکارییەوە هەموویان باس کردووە، ئێمە سوپاس بۆ خوا لەو حەقیبە ئابوورییەدا کە چواردە موجەلەدە، هەموویمان خستووەتەڕوو بە وردەکارییەوە، جگە لە زیادکردنی پڕۆژە و بەرنامە و بەرهەمەکان، هەمووی باس کراوە.

> **ئێستا ئابووری ڕۆژئاوا خۆی دەڵێت سوو گرفتە، هۆکارە بۆ داڕمان، هەر کێشەیەك بێتە پێش سوو دەکەنە قوربانی، یان لایدەبەن یان کەمی دەکەنەوە**

**گوڵنار: ئایا چارەسەکە تەنیا بانگەشە و دروشمێکە کە موسڵمانان دەیانەوێت بڵێن ئێمەش هەین و دەتوانین چارەسەری ئەم دۆخە بکەین، بەڵام لەسەر زەمینەی واقیع و کردار شتێک نییە؟ ئایا چارەسەرەکە چارەسەرێکی قورئانییە یان ئیجتیهاد و قسەی زانایانە لە دوای چەرخی زێڕینی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)؟**

دکتۆر عەلی قەرەداغی: چارەسەرکردنەکە مەبادیئ و بنەماکانی قورئانیی و لە سوننەوەیە، جگە لە هەندێک تەفاسیل نەبێت، هەمووی ئیجتیهاداتە، بەڵام ئیجتیهاداتی پەیوەست بەو بنەمایانەوە، ئەو مەبادیئانە سەوابیتێکمان بۆ دروست دەکەن بۆ ئەوەی کە ڕێگەمان لێ ون نەبێت، قۆرخکار نەبین و ئەخلاقیاتمان هەبێت، بەڵام لایەنی ئیجتیهادییەکە کە بوارێکی زۆری هەیە نوێگەریی و سەردەمیبوونمان بۆ دروست دەکەن، واتە ئێمە لە ئیسلامدا هیچ ڕێگرییمان نییە کە سوودمەند بین لە هەموو بیرێکی سەرمایەداریی و ئیشتیراکیی کە بگونجێت و پێچەوانە نەبێت بۆ ئیسلام، ئەمە وات لێ دەکات کە فیکری خۆیشت و خەڵکی دیکەش وەربگریت، بەڵام نابێت لە ژێر

سایەی سیستەمەکە دەربچێت. لەبەر ئەوە ئابووریی ئیسلامیی مەبادیئە، ئیجتیهادات و موتەغەیراتە، لەبەر ئەوە قابیلیەتی جێبەجێکردنی زۆر مومکینە، بەڵام وەک وتم قابیلییەتی جێبەجێکردن پێویست بە کەسەکانە، بەهای بەرنامە و بیرەکان دواتر دەگەڕێتەوە بۆ کەسەکان، تەنانەت دامەزرێنەری یاسای فەڕەنسی کە لە ساڵی ١٨٠٠ بۆ ١٨٠٨ داینا، کە یەکەم یاسا بوو دوای یاسای ڕۆمانی، وتی من بەختەوەرم ئەم یاسایە دروست بووە، بەڵام خەفەتێکم هەیە، گرنگ ئەوەیە کێ جێبەجێی دەکات؟ تەنانەت وتی کەسێکی باشم بدەرێ، ئەگەر یاساکەش خراپ بێت، دەتوانێت دادگەریی جێبەجێ بکات، کەسێکی خراپم بدەرێ یاسایەکی عەدالەتیشی بدەیتێ، هەر تێکی دەدات، لەبەر ئەوە کەسی باش و خاوەنی فیکر و ڕەوشت زۆر زۆر گرنگە لە جێبەجێکردندا، کە ئەگەر ئێمە دامەزراوە و کەسمان دەست بکەوێت زۆر باش دەتوانێت جێبەجێی بکات، گەورەترین بەڵگەش ئەوەیە کە بانکی ئیسلامیی سەرکەوتوو بووە، ئێمە ساڵی ١٩٧٥ بە بانکێک دەستمان پێکرد، ئێستا زیاتر لە ٤٠٠ بۆ ٥٠٠ بانک هەیە، ١٠ هەزار لق هەیە، کە قەبارەی مەوجوداتی بانکی ئیسلامیی زیاترە لە دوو ترلیۆن و ٣٠٠ ملیار دۆلار، من ئاگادارم لە یەکەم بانکدا بووین، بە ٢٥ ملیۆن دۆلار دەستمان پێکرد، لە ماوەی ٤٠ ساڵدا کە زۆر نییە بۆ تەمەنی بانک، جێبەجێکردنەکەشی سەرکەوتووە، وا دەردەکەوێت شتەکانی دیکەشی سەرکەوتوو دەبێت.

**گوڵنار: دادگەریی و ئەخلاق، دوو بنەمای تەواو مرۆڤایەتییانەیە، لە ئابووریی ئیسلامییدا زۆرجار دابەشکردنی داهات و نەهێشتنی جیاوازییە چینایەتییەکان لەسەر ئەم دوو بنەمایەیە، ئەم دوو بنەمایە تا چەند لە بەرژەوەندیی پەیڕەوانی هەموو ئایین و نەتەوە و زمانێکدایە؟**

دکتۆر عەلی قەرەداغی: بێگومان ئەگەر ئێمە قورئانی پیرۆز بخوێنینەوە، هیچ شتێک نییە دوای ئیمان بە خوا و مەسەلەی عەقیدە گرنگی پێ دابێت، بە قەدەر دادگەریی، بە هیچ جۆرێک قورئانی پیرۆز ڕێگەت نادات جیاکاریی تێدا بکەیت، تەنانەت لەو کاتەدا (ولا یجرمنكم شنئن قوم على أن لا تعدلوا)، دادگەر بن نزیک دەبن لە تەقواوە، تەنانەت لە کاتێکدا کەسێک ئیعتدا دەکات و لە لوتکەی شەڕدا، لەو کاتەدا خوای گەورە فەرمان دەکات کە دەبێت تۆ دادگەر بیت بەرانبەر ئەوانەی کە ئازاریان داویت و دژی تۆن و تۆش ڕقت لێیانە، نابێت ئەو ڕقە ببێتە هۆی ئەوەی تۆ دادگەر نەبیت، هەروەها (وإذا حكمتم بين الناس أن تحكموا بالعدل) (إن الله نعم ما يعچكم به) تەماشای ئەو ئایەتە پیرۆزانە بکە، بەڕاستی ئینسان کە دەیخوێنێتەوە زۆر زۆر دەوەستێت لەگەڵیدا، کە بۆچی ئەوەندە گرنگی پێدراوە، زانایان دەڵێن هەرچی بنەما هەیە جێگەی هەڵاوێردنە، جگە لە بنەمای دادگەریی، تەنانەت ئەوە نوێژە، جەمع دەکرێت، قەسر دەکرێت، ئەگەر ناتوانیت، بە پێوە دادەنیشیت، یان

ڕۆژوو ناتوانیت بەڕۆژوو بیت، ئەگەر بتوانیت دەیگریتەوە، ئەگەر نەتتوانی کەفارەت دەدەیت، هەمووی هەڵاوێردنە (ئیستسنا)، بەڵام دادگەریی لە هیچ شوێنێکدا بواری تیا نییە.

لە سەردەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر بێت) ڕووداوێک بوو، کۆمەڵێک جوولەکەیەکیان تۆمەتبارکرد کە درعێکی دزیوە، کە خستبوویانە ماڵی جوولەکەکەوە، جوولەکە فەقیرەکەش تووش بوو، ئەوانیش هەموو کەس و عەشیرەت هاتنە خزمەت پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)، قسەی زل و ئەملا و ئەولایان دەکرد، لە کاتێکدا خۆیان تۆمەتبار بوون، وتیان وەرن بمانپشکنن، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) خەڵکی نارد، لە ماڵی ئەوان نەبوو، لە ماڵی جوولەکەکە بوو، کەچی خوای گەورە ١٢ ئایەتی لە سوورەتی (نیساو) هێنا (ولا تكن للخائنين خصيما..) واتە بۆ ئەو کەسانەی کە وا خیانەت دەکەن یارمەتیدەر مەبە و بەرگرییان لێ مەکە، دواتر ئەو ڕاستییە ئاشکرا بوو کە ئەو جوولەکەیە بێ تاوانە و ئەمانە تۆمەتبارن، لەبەر ئەوە لە ئایینی بەرزی ئیسلامدا هیچ جیاوازییەک نییە لەبەر خاتری دین لە مەسەلەی ماف، عەدالەت میزانەکەی تەتبیقە بەبێ تەفریقە، بەبێ جیاوازیی، دادگەرییش لە ئابووریيدا یەکێکە لەو بنەمایانەی جێبەجێ دەکرێت، هەروەها بنەمای ئەخلاق و بەها و ڕەوشت، کە بریتییە لە ڕاستگۆیی و وەفا و پابەندبوون بە بەڵێن و چاکەکاریی و سۆز و ئەمانە، کە نزیکەی (٥٠ بۆ ٦٠) بەهای بنەڕەتین، کە هەموویان ڕۆڵیان هەیە لە ئابووریدا.

**گوڵنار: تێڕوانینی مەقاسیدی شەریعە بۆ بوارەکانی (قەرزدان، سووخۆریی، زەکات، قۆرخکاریی، بەیتولمال و قازانج) چییە؟**

دکتۆر عەلی قەرەداغی: مەقاسیدی شەریعە فیعلەن ئەوەیە کە ئیسلام باسی سوو دەکات و حەرامی کردووە، بە تایبەت لەو ئایەتانەی لە سوورەتی پیرۆزی بەقەرەدایە، تەماشا دەکەیت ئەو ئایەتەی دەفەرموێت (أحل الله بيع وحرم الربا) لە زیاتر لە ٣٠ ئایەت باسی دوو شت دەکات، یەکەم سەدەقە و خێر و واجبی مالی، وەک زەکات و ئەوانە کە دەبێت بدرێت، دووەمیش مەسەلەی قەرزی حەسەن و دواتریش ئەخلاقیاتی قەرز، واتای وایە ئەم سیستەمە یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی سووخۆریی نەبێت، حەرامکردنی سوویش بەڕاستی دەگەڕێتەوە بۆ چەند شتێکی بنەڕەتیی، کە ئێستا بە پێی زانستی تازەی ئابووریی چەسپاوە کە سوو دەبێتە هۆی کێشەی ئابووریی و کێشەی ئینتیما بۆ وڵات، بە بەڵگەی ئەوەی هەر کاتێک قەیرانێکی ئابووریی دروست بوو یەکسەر وڵاتەکان سوو دەکەنە سفر، جاری وا هەیە کەمتریش، بۆ نمونە ئەمریکا لە دوای ٢٠٠٨ ئەمریکا سووی کرد بە ٠،٢٥ کە کەمترە لە تێچووەکەشی، لە ئێستاشدا هەر لەسەر ئەوەیە، کاتی خۆیشی کینز کە پرۆژەکەی پێشکەشکرد بۆ ئەمریکا لە ساڵی ١٩٢٩ وتی یەکێک لە مەرجەکان ئەوەیە کە سوو سفر بێت، هەروەها باجیش زۆر نەبێت، کە دیاریی کرد

لە دوو یان شتێک زیاتر، بەهەر حاڵ، ئەمە چەسپاوە، چونکە سوو بریتییە لە عیبئێکی مالی، کە دەکەوێتە سەر شتەکان، بۆ نمونە دەچێتە سەر بەرهەمەکە، کە ئێستا یەکێک لە کێشە گەورەکانی ئابووریی، سووە. بە پێچەوانەی بەشداریکردنەوە، کە ئەگەر قازانجت کرد یان زەرەرت کرد، بەشداری تیایدا واتە، جووڵەیەک کراوە، بەڵام لەوی دیکەدا نەقد بە نەقدە، کە نە کڕیار هەیە نە فرۆشیار هەیە، نە گوێزەرەوە هەیە، نە بەرهەمهێن هەیە، کە ئیسلام ویستوویەتی ئەمە لابەرێت، جگە لەوەش زوڵمە، خوای گەورە کاتێک وەڵامی کافرەکانی دایەوە، فەرمووی (الذین یأکلون الربا، لا یقومون إلا کما یقومون الذی یتخبتم الشیطان... وحرم الربا)، دوو وەڵامی دانەوە، وەڵامێکیان ئیسلامیی کە ئەمە خوا حەڵاڵی کردووە، ئەویشی حەرام کردووە، بەڵام جوابێکی ئابوورییشی دانەوە دواتر کە فەرمووی (لا تظلمون و لا تظلمون)، کە فەرمووی سوو زوڵمە، زوڵمێکی فەردیش نەبێت، زوڵمێکی کۆمەڵایەتییە، چونکە کۆمەڵگە لاواز دەبێت و تووشی کێشەی ئابووریی دەبێت بە هۆی ئەم سووەوە، زوڵمێکی کۆمەڵایەتییە چونکە ئەوەی کە سووەکە دەدات هەمیشە قازانج دەکات، ئەوی تر قوڕ بەسەرە لەوانەیە قازانج بکات، لەوانەشە قازانج نەکات، لەبەر ئەوە زانایەکی گەورەی ئەڵمانی لە ساڵی ١٩٠٨ کتێبێکی گەورەی داناوە کە برایان بەشێکی زۆریان بۆ وەرگێڕاوم، لەوکاتەدا کۆمپیوتەر نەبوو، کابرا خۆی زانای بیرکارییە، کە ناوی شەختە، ١٥٠٠ موعادەلەی هێناوە، لەم ژمارەیە سەلماندوویەتی کە ئەگەر جیهان لەسەر سوو بڕوات بۆ دوای ٢٠٠ ساڵ زۆربەی پارەی جیهان دەچێتە دەست ئەوانەی کە سوویان کردووە، دەڵێت چونکە ئەوە کە سوو دەکات هەمیشە قازانج دەکات و ئەوەی قەرزەکەی کردووە زۆربەی زەرەر دەکات، کە ئێستا زیاتر لە سەد ساڵی ڕۆیشتووە، ئێستا گۆڤارێکی سویسریی کە گۆڤارێکی ئابووریی زۆر زۆر گەورەیە دەڵێت کەمتر لە دوو هەزار کۆمپانیا و کەس موڵکیەتیان زیاترە لە سەدا پەنجای هەموو جیهان، واتە دوو هەزار کەس لەسەر لە سەدا ٥١ی ئەم سەروەتە دەژین، حەوت ملیار کەسیش لەسەر لەسەدا ٤٩ی سەروەتی جیهان دەژین.

بە پێچەوانەشەوە کە لە سەردەمی ئۆباما خۆپیشاندان دەستی پێکرد، وەک لاساییکردنەوەی بەهاری عەرەبی، وتیان لەسەدا یەکی ئەمریکا لەسەر لەسەدا ٩٩ی داهاتی ئەمریکا دەژین، لەبەر ئەوە زوڵمە و لایەنێکی نائەخلاقییە و قۆرخکارییە بۆ ئەو کەسانە، لەبەر ئەوە خوای گەورە حەرامی کردووە.

**گوڵنار: ئایا بواری خۆگونجاندن و ئیجتیهاد و تازەگەریی لە تێڕوانینی ئێمەی ئوممەتی ئیسلامیی بۆ مەسەلەی سوو نییە و ناکرێت؟ کاتێک کە ئەم هەموو دواکەوتوویی و نەبوونیی و هەژارییەی لە وڵاتانی جیهانی سێهەم بە تایبەت وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و وڵاتانی ئیسلامیی دەبینین ئاسمان و ڕێسمانمان جیاوازە لەگەڵ ئەو وڵاتانەی کە**

**سیستەمی بانکی و سووخۆرییان هەیە، ئابووریی ئیسلامیی و ئێوەش وەک زانایەک، بە موتڵەقی ئەمە ڕەتدەکەنەوە یان دەریچەیەک هەیە جۆرێک لە خۆگونجاندن لەسەر ئاستی تاک یان دەوڵەت بێنێتە کایەوە بەرامبەر بە سوو؟**

دکتۆر عەلی قەرەداغی: بە دانپێدانانی زۆربەی زانایانی ئابووریی و موحەلیلەکان، ئەم جیهانی سێهەمەی خۆمان کە کێشەی ئابووریی هەیە ناگەڕێتەوە بۆ مەسەلەی ئەوەی سووی تێدا نییە و بانکی تێدا نییە، بە پێچەوانەوە بانکەکان لەم وڵاتانە کاری خۆیان دەکەن، کێشەکە دەگەڕێتەوە بۆ دوو شت، یەکەم گەندەڵییەکی زۆر زۆر، کە ئەمە جیهانی سێهەمی وێران کردووە، تەنانەت زۆرێک لە ڕاپۆرتە جیهانییەکان دەڵێن هەندێک دەوڵەت ڕێژەی گەندەڵی تێیدا لەسەدا ٨٠یە، کە دەچێتە گیرفانی گەندەڵەکان، لەسەدا ٢٠ دەچێتە گیرفانی گەل.

> **گۆڤارێکی سویسری کە گۆڤارێکی ئابووری زۆر زۆر گەورەیە دەڵێت: کەمتر لە دوو هەزار کۆمپانیا و کەس موڵکییەتیان زیاترە لە 50٪ی هەموو جیهان.**

دووەم هۆکار نەبوونی بەڕێوەبردنی باشە، بەڕێوەبردنێکی ئابوویری، ڕۆژئاوا بە چی پێش کەوتووە؟ خۆ بە سوو پێش نەکەوتووە، بەڵکو بە نیزام و سیستەمێکی بەهێز، کە دەتوانێت لێپێچینەوە لە هەموو کەسێک بکات، بۆ نمونە سەرۆکی فەرەنسا دوای ١٩ ساڵ دادگایی کرا و سزایان دا، هەروەها سارکۆزی دوای ١٢ ساڵ دادگایی کرا و سزا درا، ڕزگاریان نابێت و دەترسن، ئەم یاسایانە لە زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێهەم نییە، لەبەر ئەوە دواکەوتوون.

ئێمە دەڵێین بانک پێویستییە، ئێستا ئەم بانکە ئیسلامییانە دەوری بانکی ڕیبەوی دەبینن، لەبەر ئەوە بەدیلمان هەیە، ئیجتیهادات لەوەیە کە بەدیل و جێگرەوەمان هەیە، بێگومان ئێمە ڕێ لە ئیجتیهاد ناگرین، ئەگەر ئەسڵی فیکرەی سووش مەجالی ئیجتیهادی تێدا هەبێت، هیچ ڕێگر نییە، فەرموو کەسێک ئیجتهادێک بێنێت، با تێک نەگیرێت لەگەڵ بنەماکانی ئیسلام و ئابوورییشدا، ئێستا ئابووریی ڕۆژئاوا خۆی دەڵێت سوو گرفتە، هۆکارە بۆ داڕمان، هەر کێشەیەک بێتە پێش سوو دەکەنە قوربانیی، یان لایدەبەن یان

کەمی دەکەنەوە، لە زۆر وڵاتدا، بۆ نمونە یابان سووی تێدا نییە، جاری وا هەیە تۆ ئەگەر پارەت هەبێت، دەبێت پارەشیان بدەیتێ بۆت بپارێزن.

**گوڵنار: دید و تێڕوانینە ئابوورییەکانی پیاوانێکی وەکو کاک ناسری سوبحانی و کاک ئەحمەدی موفتیزادە کە خەڵکی وڵاتی خۆمانن چۆن هەڵدەسەنگێنن؟ کە جۆرێک لە کرانەوەیان تێدایە بە ڕووی سیستەمی بانک و ئابووریدا؟ کە کاک ناسر کتێبێکی هەیە بە ناوی سیستەمی ئابووریی ئیسلامیی، کاک ئەحمەدیش بە دەوری ویژدان و ئەخلاقدا دەگەڕێت لە ناو ئابووریی و نەهێشتنی جیاوازییە چینایەتییەکان و دابەشنەکردنی کۆمەڵگە بەسەر ئاغا و ژێردەستە و خەڵکی هەژاردا؟**

دکتۆر عەلی قەرەداغی: وا دەزانم هەردوو ئەو مامۆستا بەڕێزانە خاوەنی فیکرێکی زۆر زۆر گەش و جوان بوون، جەنابی مامۆستا ئەحمەد وەکو مامۆستای کاک ناسریش بووە، پیاوێکی خاوەن زانست و فیکر و نوێگەر بووە، خۆزگە تەمەنی درێژتر بووایە و بواریشیان بدایە لە زینداندا، ئێمە زۆر پشتگیری ئەوە دەکەین کە جەنابی مامۆستا ئەحمەد فەرموویەتی دژی ئاغا و ئیستبداد و ئیستغلال و ئەمانە بووە کە لە کوردستان و وڵاتەکانی دیکەشدا بڵاوبووەتەوە، ئەمانە هەمووی دوورە لە ئیسلام، هیچ کەسێک نییە وەک ئیسلام لە بەرانبەری زوڵمدا بووەستێتەوە، ئیسلام زوڵمی کردووە بە هۆکاری هەموو خراپەیەک، تەنانەت شیرک، دەفەرموێت (إن الشرك لظم عچيم)، کە سەرچاوەی هەموو خراپەیەک دەگەڕێتەوە بۆ زوڵم، زوڵم لە حەقی خوا، یان زوڵم لە حەقی عیباد، بۆیە ئەو بۆچوونی مامۆستا ئەحمەدە من زۆر تەقدیری دەکەم، من پەیوەندیم زۆر هەبوو لەگەڵیدا، (خوا لێی خۆش بێت)، پیاوێکی زۆر موبارەک بوو، بەڵام ئیتر ئیجتیهادە، کە ئیجتیهادی هەرکەس بێت قابیلە بۆ ئەوەی گەشەی پێ بدرێت، نابێت ئێمە بووەستین لەسەر ئیجتیهادی کەسێک، ئێستا هەندێک قوتابی جەنابی مامۆستا ئەحمەد دەیانەوێت بووەستن لەسەر ئەو ئیجتیهادە، من وا دەزانم ئەوە هەڵەیە، ئەگەر ئەوان ئیقتیدا بە مامۆستا ئەحمەد دەکەن، چۆن مامۆستا ئەحمەد ئیجتیهادی کردووە با ئەوانیش ئیجتیهاد بکەن، ئەگەر ئینسان ئەهل بێت بۆ ئیجتیهاد و مەرجەکانی تێدا هەبێت، کراوەیە.

بە نسبەت مامۆستا ناسریشەوە برادەرێکی زۆر خۆشەویستمان بوو، بەشدار بوو لەگەڵماندا لە زۆر کار و شتی جوان، بە خزمەتی گەیشتین چەندجار لە ئێران، لە ئەستەنبوڵ، پیاوێکی موبارەک بوو، خاوەن فیکرێکی زۆر زۆر بەهێز بوو بەڕاستی، زۆر زیرەک بوو، من وای هەڵدەسەنگێنم زۆرێک لە بۆچوونەکانی زۆر جوانە، شتێکی زۆر پیرۆز و موبارەکە، هەروەها عومقێکی فیکریی و نوێگەریی تێدایە بەڕاستی، بەڵام لەهەمان کاتدا هەموومان ئینسانین، وەکو حەزرەتی مالیک دەفەرموێت (كل يؤخذ منه ويرد إلا صاحب هڎا القبر) کە ئەویش پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەر بێت).



ساری زەڵمی

# چارەسەر و ئاڵتەرناتیڤی ئابووری ئیسلامی بۆ ئەم بارودۆخەی ئێستای جیهان

گومانی تێدا نییە ئابووری کۆڵەکە و پایەی پێشکەوتنی هەموو گەلانی جیهانە و گرنگترین بنچینەی هەستانەوە و پێشکەوتنیانە لە هەموو سەردەمێکدا بەتایبەتی لەم سەردەمەی ئێستاماندا، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ئابووری بەهێز، ڕۆڵێکی بنچینەیی دەگێڕێت لە باڵادەستبوونی دەوڵەتان و هەژموونگەرایی هزریی و ڕامیاریی و سەربازییاندا، بێگومان ئایینی پیرۆزی ئیسلامیش خاوەنی ئابوورییەکی تایبەت بەخۆیەتی کە هەڵقوڵاوی شەریعەتی ئیسلام و یاساو ڕێساکانییەتی، یاسا ئابوورییەکانیشی دەگەڕێتەوە بۆ (قورئان و سوننەت)، ڕاستە دەقە شەرعییەکان لەمبارەیەوە زۆر بەرفراوان نین، بەڵام بواری ئیجتیهادی زانایان و حوکمە گۆڕاوەکان زۆر بەرفراوانن، لەمبارەیەوە د.عەلی قەرەداغی دەڵێت: (ئابووری ئیسلام هەڵقوڵاوی شەریعەتی ئیسلام و سەرچاوەکانیەتی، بنەما گشتی و یاسا و ڕێساکانی شەریعەتی ئیسلام بڕیاردەرە لەسەر ئابووری ئیسلامی، بەنموونە بنەمای عەدالەت، یەکسانی، خاوەندارێتی هاوسەنگ، بنەمای مافی هاوتای یەکتری، فیقهی میزان، بەستنەوەی گرێبەستەکان بە حەقیقەتەوە، گرێدانی چالاکییە ئابوورییەکان بە بەهاکانی عەقیدەوە، ڕەوشت، مرۆڤ دۆستی).

وەک ئاشکرایە جیهان لە ئێستادا بە قەیرانێکی گەورە و مەترسیداردا گوزەر دەکات بەتایبەت قەیرانی ئابووری، کە بێگومان وڵاتانی ئیسلامیش بەشێکن لە جیهان و کاریگەری ئەم قەیرانە زیاتر دەردەکەوێت لەناویاندا، لەبەرئەوەی وڵاتانی ئیسلامی وەک پێویست نەیانتوانیوە لەگەڵ کاروانی پێشکەوتنی جیهاندا بەردەوام بن و سود لەو سامانە گرنگانەی ژێر دەسەڵاتیان وەربگرن کە سودێکی زۆر و کاریگەریان هەیە بۆ بەرەوپێشبردنی ئابوورییەکەیان و دواتریش سەرجەم لایەنەکانی تری ژیانیان بەشێوەیەکی زانستی و بەپێی پرۆگرامێکی گونجاوی زانستییانە و سەردەمییانە کە بتوانین هاوشانی وڵاتانی پێشکەوتووی جیهان بڕۆن و لەم کاروانی پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆجیایە بەردەوام بن تا گەشەپێدان و وەبەرهێنانیان بگەیەننە لوتکە، بێگومان ئابوورییەکەیان پڕە لە کێشە و گرفت، لێرەدا مەبەستمان لە کێشە و گرفت ئەوەیە کە «نەیانتوانیوە وەک پێویست وەڵامی داواکاری خەڵک بدەنەوە و حەز و پێویستیەکانیان دابین بکەن»، کە بەپێی بۆچوونی زۆرینەی ئابووریناسانی جیهان، کێشەی ئابووری بریتییە لە ناتوانایی لە وەڵامدانەوەی پێداویستییەکانی خەڵکدا بەهۆی کەمی سەرچاوە ئابوورییەکانەوە.

ئەگەر چاوێک بە مێژووی ئیسلامدا بگێڕین چاومان بەو سەردەمە زێڕینە دەکەوێت کە چۆن ئیسلام توانی گەلانی ئیسلامی و خەڵکانی تریش کە ئیسلام نەبوون و نزیکبوون لە جوگرافیای ئیسلامەوە بەرەوپێش ببات و لە تاریکی و نەزانی، هەژاریی و دەستکورتی بیانپارێزێت و بەرەوپێشیان ببات و بەرەو شارستانیەت و خۆشگوزەرانی پەلکێشیان بکات، بێگومان ئەم بارودۆخە بە پشتبەستن بە بەرنامە و بنەما و یاساکانی ئەو سەردەمە بووە کە هەڵقوڵاوی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بوون، چونکە وەک پێشتر باسمان کرد ئابووری ئیسلام هەڵقوڵاوی شەریعەتی ئیسلام و یاسا و ڕێساکانییەتی، یاسا ئابوورییەکانی دەگەڕێتەوە بۆ (قورئان و سوننەت)، هەربۆیە ئەگەر بە وردی چاو بەم مێژووە پرشنگدارەدا بخشێنین هەست بە گرنگیدان و بایەخدان بەلایەنی ئابووری دەکەین کە بووەتە هۆکاری گەشەپێدان و ئاوەدانکاری لەو سەردەمەدا بەتایبەت لەو لایەنەوە کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی هەیە بە ماڵ و سامانی تاکەکانەوە کە خوای گەورە بە بنەمای ژیان ناوی بردووە بۆ کۆمەڵگا و، پێشکەوتنی کۆمەڵگای پەیوەست کردووە بەم بابەتەوە، لە قورئانی پیرۆزدا چەندین نمونەی درەوشاوە و جوانمان دەستدەکەوێت لەمبارەیەوە، بۆ نموونە جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە دەبێت خەرجکردن و بەکاربردن لە ئاستی دەسهات و بژێویدا بێت، وەک لە قورئانی پیرۆزدا خــوای گەورە دەفەرموێت: (لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَا آتَاهَا سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا (الطلاق، ٧)، واتە: ئەوەی دەوڵەمەندە با بەگوێرەی دەوڵەمەندییەکەی بەخشندەبێت، ئەوەیش کە کەمدەستە و هەژارە با لەوە ببەخشێت کە خوا پێی بەخشیووە،

چونکە خوا بە گوێرەی دارایی هەرکەسێک داوای بەخشین دەکات، دڵنیاش بن کە خوا دوای تەنگانە هەرزانی دەهێنێت، دوای ناخۆشی خۆشی دەهێنێت).

بەپێی ئەم ئاڕاستەکردنە قورئانییە هاوسەنگی بەدیدێت لە نێوان دەرامەت و پێداویستیدا ، ئەم ئایەتە ئاڕاستەمان دەکات بۆئەوەی نابێت مرۆڤ زیاتر لە دەستهاتی خۆی بەکارببات کە ببێت بەهۆی قەرزاربوونی، بێگومان لە ئێستا وڵاتانی پێشکەوتووی جیهان کار لەسەر ئەم بنەمایە دەکەن و بەم یاسایە کار دەکەن لەگەڵ هاوڵاتیانی خۆیاندا و بەپێی دەستهاتیان مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن و ڕێژەی باجیان لەسەر دیاری دەکەن، بەجۆرێک کە توانای پێدانی باجیان هەبێت و خۆیان نەدزنەوە لە باج، لە زانستی ئابووری ئێستاشدا خۆدزینەوە لە باج بە گەندەڵی ئابووری هەژمار دەکرێت و هۆکارە بۆ دواکەوتن و دواخستنی گەشەی ئابووری وڵات. هەروەها ئایینی ئیسلام باس لەوە دەکات کە دەبێت خەرجی بە جۆرێک بکرێت کە خزمەت بە مرۆڤایەتی بکات و ببێتە هۆکاری پاراستنی دەرامەتەکان و باش بەکارهێنانیان، هەروەها ڕێگری دەکات لەوەی لە شتی ناپێویستدا خەرجی بکرێت، یان لەکاری بێ فەرمانیدا یان زیادەڕۆیی لە خەرجکردنی ناپێویستدا، خەرجکردن دەبێت لە سنوری پێویستدا بێت بەبێ زیادەڕۆیی، وەک خوای گەورە دەفەرموێت: (وَآتِ ذَا الْقُرْبَىٰ حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا)، ( الإسراء ٢٦)، واتە: مافی خزم و خوێشان بەجێبهێنە و پەیوەندییەکان (لە چوارچێوەی شەرعدا چاودێری بکە)، هەروەها مافی هەژارانیش (بەیارمەتیدانیان بەگوێرەی توانا) ئەنجام بدە، هەروەها مافی ڕێبواریش (بەدەستگیرۆیی و ڕێنیشاندان) جێبەجێ بکە، دەستبڵاویش مەبە و ماڵ و سامانت بەفیڕۆ مەدە.

هەر لەمبارەیەوە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: **(كُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ)** ، ( الأعراف، ٣١). واتە: بخۆن و بخۆنەوە (لە ناز و نیعمەتەکان)، بەڵام زیادەڕەوی مەکەن، چونکە بەڕاستی خوا لە سنوور دەرچووان و زیادەڕەوانی خۆش ناوێت. لەم ئایەتە پیرۆزانەدا گەورەیی ئاینی ئیسلاممان بۆ دەردەکەوێت و ڕوون دەبێتەوە لە ئاڕاستەکارییەکانی و بنچینە ئابوورییەکانیدا بۆ چارەسەری گرفتە ئابوورییەکان.

بێگومان ئیسلام ئاینێکی واقیعیە و بۆ چارەسەرکردنی کێشە و گیروگرفتەکانی مرۆڤایەتی هاتووە، ئامانجی سەرەکی ئەوەیە بەختەوەری دونیایی و قیامەتی دابین بکات بۆ مرۆڤایەتی، بۆیە لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین بڵێین ئیسلام سەبارەت بە کێشە ئابوورییەکان خاوەنی چارەسەر و دیدی تایبەت بەخۆیەتی. لێرەدا باس لە یەکێک لە کێشە گەورە ئابوورییەکانی جیهان دەکەم کە لە ئێستادا جیهان بەگشتی و وڵاتانی ئیسلامیش لەنێویاندا گیرۆدەی ئەم کێشەیە بوون و بووەتە کێشەیەکی جیهانی و

سەرچاوەی زۆربەی کێشەکانی تریشە لە جیهاندا، بێگومان ئیسلام چارەسەری بۆی داناوە و بەوردی باسی لێوەکردووە کە ئەویش کێشەی گەندەڵییە بەگشتی و گەندەڵی ئابووری و بەرتیل وەک بەشێک لە گەندەڵی ئابووری، کە دەتوانین ئەم چارەسەرە بکەینە پێوەرێک بۆ سەرجەم کێشە ئابوورییەکانی تری جیهان و دڵنیابببینەوە لەوەی کە ئاینی ئیسلام چارەسەری تەواوی پێیە بۆ سەرجەم ئەو کێشانەی کە پەیوەستن بە ژیانی مرۆڤ و مرۆڤایەتییەوە.

**بەپێی بۆچوونی زۆرینەی ئابووریناسانی جیهان، کێشەی ئابووری بریتییە لە ناتوانایی لە وەڵامدانەوەی پێداویستییەکانی خەڵکدا بەهۆی کەمی سەرچاوە ئابوورییەکانەوە.**

وەک دەزانین گەندەڵی بەگشتی و گەندەڵی ئابووری بەتایبەتی بووەتە کێشەیەکی گەورە لە جیهاندا و زۆربەی وڵاتان گیرۆدەی بوون و چارەسەریان پێ ناکرێت، بەڵام ئیسلام ئەم کێشەیەی زۆر بەباشی چارەسەر کردووە، ئایینی ئیسلام ئەم کارەی بەتەواوی حەرام کراوە و ئەنجامدانی قەدەغەیە، قورئانی پیرۆز گرنگییەکی زۆریداوە بە چارەسەری گەندەڵی، خوای گەورە هەر بەناوی (گەندەڵی)یەوە ناوی هێناوە و جەنگێکی قورسی لە دژی ئەنجامدەرانی ڕاگەیاندووە، لەوبارەیەوە دەفەرموێت: **(يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ)**، (المائدة: ٣٣)، واتە: ئەنجامدەرانی گەندەڵی دژایەتی خودا و پێغەمبەرەکەی دەکەن.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا (٥٠ جار) وشەی گەندەڵی بەکارهێناوە و، زۆر بەتوندی ئیدانەی گەندەڵکاران دەکات، بەڵێنی ڕسوابوونیان دەدات لە دونیادا، هەروەها لە دواڕۆژیشدا بەڵێنی سزای سەختیان پێ دەدات، لەهەمانکاتدا وشەی گەندەڵی لە بەرامبەر چاکسازی باس دەکات، لەبەرئەوە تەنها ئەوەندە بەس نییە کە ئێمە باس لە گەندەڵی بکەین، بەڵکو دەبێت باس لە چاکسازی بکەین و گرنگی تەواوی پێ بدەین، بۆئەوەی سەرلەنوێ کۆمەڵگە بنیات بنێینەوە و دامەزراوەکان لەسەر بنەمای چاکسازی دروست بکەین، ئەگەر سەیری قورئانی پیرۆز بکەین چەمکی چاکسازیی و چاکەخوازی لە قورئاندا سێ ئەوەندە زیاتر لە وشەی گەندەڵی و گەندەڵکاران هاتووە، وشەی چاکسازیی و چاکەخوازی زیاتر لە ١٥٠ جار لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، چونکە ئەمە بابەتێکی گرنگە و بنچینەی دروستکردنی وڵات و میللەتە، هەروەها پایەکانی دروستکردنی شارستانیەتە،

بەشێویەک ئەگەر گەندەڵی هەبێت شارستانیەت نابێت. بەهاکانی هەرەس دەهێنێت ئەوکاتەش گەشەپێدان و پێشکەوتن و وەبەرهێنانی ڕاستەقینە ڕوونادات، بەڵکو هەژاریی و دواکەوتوویی و نەفامی و بێکاری بەرهەم دێت.

ئیمامی بوخاری (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمودەیەکی ڕیوایەت کردووە بۆمان، دەفەرموێت: پێغەمبەری خودا (د.خ) پیاوێکی بەناوی (ابن اللتبیه) نارد بۆ کۆکردنەوەی خێر و خێرات، کە گەڕایەوە کۆمەڵێک وشتر و مانگا و بزنی پێ بوو، وتی ئەمانە بە سەدەقە وەرمگرتووە، بۆ ئەم مەبەستەش هەندێکـی بۆخۆی دانا، لەکاتێکدا کە ئەم هەواڵە بە پێغەمبەری خوا گەیشت، زۆر توڕە بوو، چووە سەرمینبەر و خەڵکی کۆکردەوە و چاوەڕوانی ڕۆژی هەینی نەکرد، بەڵکو یەکسەر هاتە قسە و فەرمووی (ئایا دەبێت حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کە ئێمە کردومانە بە بەرپرسی کارێک و ئێستا هاتووە دەڵێت ئەمەیان بۆ ئێوە و ئەوەش بۆ خۆم، ئەگەر ئەو کەسە لە ماڵ باوکی یان دایکی دابنیشتایە کەس دەهات دیاری بۆ بهێنێت؟. سوێند بەو کەسەی گیانی محەمەدی بەدەستە(د.خ)، هەرکەسێک لە ئێوە شتێک لەوانە بۆخۆی هەڵبگرێت، دەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو شتە جائیتر وشتر بێت یان مانگا یان بزن یا هەرشتێکی تر دەبێت لەسەر ئەژنۆ بڕوا و ئەو شتە بچێتە سەرپشتی، پاشان دەستی بەرزکردەوە هەتا بنباڵی دەرکەوت و فەرمووی خوایەگیان بەشایەتبە من گەیاندم، سێ جار ئەمەی فەرموو. لەبەرئەوە زانایان فەرموویانە دیاریدان بە بەرپرسان بەرتیلە، وەرگرتنی دیاری لەلایەن بەرپرسەوە لە خەڵکی تر بۆ نموونە وەرگرتنی دیاری بەڕێوەبەر لە فەرمانبەرەکان یان هەرشتێک لە خوارەوە بۆ سەرەوە، لەبەرئەوەی بەهۆی بەرپرسیاریەوەیە، ئەمە جائیز نییە و لە ئاییني پیرۆزی ئیسلامدا قەدەغەکراوە و ئاینی پیرۆزی ئیسلام زۆر بەتوندی دژی ئەم تاوانە مەترسیدارە وەستاوە و لە چەندین شوێنی قورئانی پیرۆز و فەرموودەدا باسی کردووە، پێغەمبەری خودا (د.خ) دەفەرموێت: (لعن الله الراشية والمرتشية والرائش)، واتە: نەفرەتی خوا لە بەرتیلخۆر و بەرتیلدەر و ئەوانەش کە پەیوەندییەکە لە نێوانیاندا دروست دەکەن، لە قورئانی پیرۆزیشدا خـوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ وَتُدْلُوا بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا فَرِيقًا مِنْ أَمْوَالِ النَّاسِ بِالْإِثْمِ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ١٨٨﴾ (البقرە: ١٨٨)، واتە: (نەکەن ماڵ و دارایی یەکتر لە نێوانتاندا بخۆن (وەک: بەرتیل، سوو، داگیرکرن و فروفێڵ)، نەکەن هەندێکی بدەن بەکاربەدەستان بۆئەوەی ماڵی خەڵکی بخۆن لە ڕێگەی ناحەق و گوناهەوە، لەکاتێکدا کە خۆشتان دەزانن ئەو کارە ناڕەوایە. خوای گەورە نەفرەتی لە جولەکەکان کرد بەهۆی خواردنی سوو و بەرتیلەوە.

**سزای تاوانی گەندەڵی لە ئیسلامدا:**

قورئانی پیرۆز ڕاستەوخۆ فەرمان دەکات بەدورکەوتنەوە لە گەندەڵی وەک دەفەرمویێت: ﴿وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا﴾،)الأعراف: ٥٦(، واتە: خەڵکینە فەساد و گوناهو تاوان ئەنجام مەدەن لە زەویدا لەکاتێکدا چاکەکاری ڕەنگی گرتووە لە زەویدا و خەڵکی خەریکن خوی پێوە دەگرن. ئەم ڕێگرتنە نیشانەی مەترسی گەندەڵییە بەمانا فراوانەکەی، گەندەڵی هەموو ئەو هەڵسوکەوتە ناتەواوانە دەگرێتەوە کە دەبێتە هۆی زیانگەیاندن، واتە هەستنەکردنی بەرپرسیارێتی، ئەمەش لە شەرعیەتی ئیسلامدا پێی دەڵێن (الراعی)، وەک لەم فەرمودەدا باس کراوە (کلکم راع وکلکم مسؤول عن رعيتة).

هەر ناتەواویەک لەکاری سەرپەرشتیاریدا ئەگەر ئەو کەسە خەلیفە، یان سەرۆکی دەوڵەت، وەزیر، بەڕێوەبەرێک، بەرپرسی لقێک یان ناوچەیەک یان پیاوێک بێت لەماڵەوە، ئەمانە هەمووی لە ئیسلامدا پێیان دەڵێن بەرپرسیاری. گەندەڵی و چاکسازی هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە. ئەگەر ئەو گەندەڵییە ببێتە هۆی زیان یان ناتەواوی کە تووشی تاک یان کۆمەڵ یان کۆمەڵگە ببێت، ئەم زیانە ماددی یان مەعنەوی یان ئیداری یان دارایی، یان هەر شتێکی تر کە ببێتە هۆی ناتەواوی هەموو ئەو شتانە ئەو ئایەتە دەیانگرێتەوە کە باس لە مەترسی گەندەڵی دەکات. خوای گەورە باس لەوە دەکات کە سەختترین سزا بۆ گەندەڵکارانە و بە دوژمنێکی سەرسەخت ناوی دەبات و دەفەرمویێت: ﴿وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ ۗ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الْفَسَادَ﴾،)البقره: ٢٠٥(، واتە: هەرکاتێک ئەو جۆرە کەسە پشتی هەڵکرد و دەسەڵاتی پەیداکرد، هەوڵ و کۆشش دەدات لە زەویدا تا ئاشوب بەرپا بکات و خراپە بڕوێنێت و کشتوکاڵ لەناو ببات و پاکتاوکردنی ڕەگەزی ئەنجامبدات، بێگومان خودا فەساد و خراپە و تاوانی ناوێت.

لە ئایەتێکی تر خوای گەورە سەرچاوەی سەرەکی گەندەڵی دەگەڕێنێتەوە بۆ مرۆڤ، چونکە خوای گەورە زەوییەکی باشیداوە بە مرۆڤ و توانای باشی پێداوە هەتا بتوانێت بەرهەمی بهێنێ و گەشەی پێ بدات و سودی لێ وەربگرێت، بەڵام لەکاتێکدا کە ئەم مرۆڤە دێت بەپێچەوانەوە هەڵسوکەوت دەکات و ئەنجامێکی پێچەوانە دەدات بەدەستەوە ئەوا دەکەوێتە بەردەم ئەم ئایەتە پیرۆزە کە دەفەرمویێت: ﴿ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُمْ بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ )الروم: ٤١(. واتە: لەکاتێکدا کە گەندەڵی و خراپە هەموو زەویی و مرۆڤ و ئاژەڵ و دەریاکانیش دەگرێتەوە، ئەوکاتە خوای گەورە لێشاوێک لە سزای دنیاییان بۆ دەنێرێت بەهۆی ئەو کردارانەی کە کردوویانە، بۆئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ڕێبازی پاکی و خواناسی. ئەمەش ڕەحمەتی خوایە کە بەشێک لە سزاکانیان بۆ دەنێرێت، چونکە ئەگەر لەسەر کردەوەکانی مرۆڤ خوا سزای بناردایە ئەوا کەس لەسەر زەوی نەدەما، بەڵام خوا بە سۆز و بەزەیی خۆی بەشێک لە سزاکانیان بۆ دەنێرێت هەتا بگەڕێنەوە و داوای لێبوردن لە خوا بکەن،

بۆئەوەی ڕووبکەنە چاکەکاریی و چاکەخوازیی و کە دنیا و دوارۆژی خۆیانی پێ چاک بکەن.

بۆیە پێویستە بە هۆشیارییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم بابەتە بکەین، چونکە ئێمەی مسوڵمان قورئان و ئایینی پیرۆزی ئیسلام بە بەرنامەی خۆمان دەزانین و دەبێت پەیڕەوی ئاینەکەمان بین و خۆمان بەدوور بگرین لە هەموو کارێکی خراپ کە زیانی بۆ مرۆڤایەتی هەیە بەتایبەت گەندەڵی، چونکە بابەتی حەرام و حەڵاڵ گرنگە و هەر ئەمەشە مسوڵمان لە نامسوڵمان جیادەکاتەوە، بەتایبەت لە ئێستادا زۆربەی مسوڵمانان بەجۆرەها بۆچوون یان بە پاڵنەری ئارەزوو و حەز کەوتوونەتە بازنەی حەرامەوە، لە ئیسلامدا مرۆڤ جێنشینی خوایە و خوا بە ئەمانەت ئەو ماڵە دەخاتە بەردەستی، ئەویش دەبێت لە بوارێکدا بەکاری بهێنێت کە خوا پێی ڕازییە و خواش فەرمان دەکات کە لە بواری چاکە و هاوکاری هەژاران و نەداران و منداڵانی بێ باوک و پرۆژەی خێرخوازیدا خەرجی بکات.

ئەگەر ئەوەش ناکات با بە حەرام پەیدای نەکات و لە حەرام و گەندەڵی و خراپەکاریدا خەرجی نەکات، چونکە ئەگەر وابکات دەکەوێتە بەردەم هەڕەشەی خودا لە دنیا و لە دوارۆژدا. بۆیە دەتوانین بڵێین، ئابووری ئیسلامی زۆر گرنگە بۆ جیهان بەگشتی و بۆ هەرێمی کوردستان بەتایبەتی کە زۆربەی خەڵکەکەی مسوڵمانە، چونکە دەتوانین ئەم بابەتە بکەینە پاڵپشتێکی گەورە بۆ چاکسازی لە سیستمی ئابووریی و نەهێشتنی گەندەڵی لە جیهاندا، بۆیە حکومەت یان ئەو حیزب و لایەنانەی کە دەیانەوێت باس لە چاکسازی بکەن، نابێت ئاینی ئیسلام فەرامۆش بکەن، بەڵکو پێویستە ئیسلامیش وەک فاکتەرێکی گرنگ بەکاربهێنن، دەبێت مامۆستایانی ئاینی و بانگخوازەکان بەشداربن لەم پرۆسەیەدا، هەتا بە ئاڕاستەیەکی ئیجابی ئاینیش ببێتە پشتیوانێک بۆ چاکسازی و نەهێشتنی گەندەڵی، چونکە تەنها لە پابەندبوونی مسوڵمانان بە بازنەی حەرام و حەڵاڵ و تێگەیشتن لە فەرمان بە چاکە و ڕێگرتن لە خراپە، بەشێکی زۆر لە گەندەڵییەکان بنەبڕ دەبن و حکومەت دەکەوێتە سەر سکەی خۆی کە ببێتە ئامرازێک بۆ خزمەتکردنی خەڵک و گەشەپێدان و چاککردنی بار و گوزەرانی خەڵک بەتایبەتی لە وڵاتانی مسوڵماندا.

لەکۆتاییدا دەمەوێت ئاماژە بە بابەتێکی زۆر گرنگ بدەم کە لە ئێستادا ئابووری جیهان و وڵاتانی پێشکەوتووی جیهانی سەرقاڵ کردووە و گرنگییەکی تەواوی پێدەرێت لەلایەن وڵاتانی پێشکەوتووی جیهانەوە و بە فریادڕەسی کێشە ئابوورییەکان دادەنرێت، کە برتییە لە (سەرمایەی کۆمەڵایەتی). سەرمایەی کۆمەڵایەتی: بابەتێکی نوێ و فرەلایەنە کە چەند دەیەیەک لەمەوپێش لەچوارچێوەی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا سودی لێ بینرا، و دواتر لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی پێشوودا ئەم بابەتە لە زانستی ئابووریدا سودی لێ بینراو زۆر بەخێرایی گەشەی سەند و پێگەیەکی گرنگی لەناو زانستی ئابووریدا وەرگرت، لە ئێستادا سەرمایەی کۆمەڵایەتی ڕۆڵێکی گرنگتری هەیە لە سەرمایەی دارایی و مرۆییەکان

لە کۆمەڵگەدا، سەرمایەی کۆمەڵایەتی بریتییە لە: کۆمەڵێک پەیوەندی لە نێوان مرۆڤەکاندا کە هەستی هاوکاریی و متمانە و دڵنیایی دروست دەکات لە نێوان تاکەکاندا هەتا بتوانن پێکەوە چالاکی ئابووری ئەنجامبدەن، سەرمایەی کۆمەڵایەتی بەشێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کاریگەری هەیە لەسەر گەشەی ئابووری. بەبێ بوونی سەرمایەی کۆمەڵایەتی تەواوی سەرمایەکانی تر کاریگەرییان کەم دەبێتەوە و ناتوانن کاریگەری تەواویان هەبێت. بەپێی چەندین توێژینەوەی زانستی کە لەم بوارەدا ئەنجام دراون ئەو وڵاتانەی خاوەنی سەرمایەیەکی کۆمەڵایەتی باشن ئابوورییەکەیان لە گەشەکردندایە و هەمیشە لە پێشکەوتندان، گرنگی سەرمایەی کۆمەڵایەتی لە گەشەی ئابووریدا بە جۆرێکە کە ئەگەر ئەم سەرمایە نەبێت سەرمایەکانی تر گرنگییەکی ئەوتۆیان نامێنێت.

بەشێوەیەکی گشتی سەرمایەی کۆمەڵایەتی کاریگەری ئەرێنی هەیە لەسەر گەشەی ئابووری، بۆ نمونە کەرتی پەروەردە و خوێندن کە یەکێکە لە بنەماکانی سەرمایەی کۆمەڵایەتی، لەم ڕێگەیەوە کەسانی خاوەن بڕوانامە و خاوەن زانست دەتوانن لە ڕێگەی زانستەکەیانەوە کاریگەریان هەبێت لەسەر ئابووری وڵات و دواتریش گەشەی ئابووری وڵات خێراتر بکەن، یاخود دەتوانین بڵێین هەرچەندە هێزی کار خاوەنی زانست و زانیاری زیاتر بن و خاوەن بڕوانامەی زیاتر بن دەتوانن بڕی بەرهەمهێنان زیاتر بکەن و ئەمەش کاریگەری ڕاستەوخۆی دەبێت لەسەر گەشەی ئابووری. کەسانی خاوەن زانست دەتوانن لە ڕێگەی زانستەکەیانەوە نوێگەری بکەن لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا کە ئەمەش کاریگەری دەبێت لەسەر خێراکردنی گەشەی ئابووری.

سەبارەت بە سەرمایەی کۆمەڵایەتی چەندین توێژینەوە ئەنجامدراوە کە سەرجەمیان بەو دەرئەنجامە گەیشتوون کە سەرمایەی کۆمەڵایەتی هاوشێوەی سەرمایە مادییەکان دەتوانێت کاریگەری هەبێت لەسەر گەشەی ئابووری وڵات، لەمبارەیەوە  ئاماژە بە چەند توێژینەوەیەک دەدەین، چوپرا(١) (٢٠٠١) باوەڕی وایە کە سەرمایەی کۆمەڵایەتی ڕێگایەکی نوێی بۆ گەیشتن بە گەشەی ئابووری زیاد کرد، دیویدسون(٢) (٢٠٠٣) بەو دەرئەنجامە گەشتووە کە قۆرخکاری لە سیاسەتدا دەبێتە هۆکاری دروستبوونی گەندەڵی ئابووریی و ئەمەش دەبێتە هۆکاری ئەوەی یەکێک لە بنەماکانی سەرمایەی کۆمەڵایەتی لەناوبچێت کە بریتییە لە (متمانە)  و لەکۆتایشدا سەرمایەی کۆمەڵایەتی لاواز دەبێت و دەرەنجام دەبێتە هۆکاری لاوازبوونی گەشەی ئابووری، ساتو(٣) (٢٠٠٤)دەڵێت: متمانەی نێوان تاکەکان کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر گەشەی ئابووری. ودهاوس(٤) (٢٠٠٦) دەڵێت: وڵاتێک کە خاوەنی سەرمایەیەکی کۆمەڵایەتی باشن لەهەمانکاتدا خاوەنی گەشەیەکی ئابووری بەهێزن، گلدینیش(٢٠١٦)(٥)، دەڵێت: لە بیردۆزەی نوێی گەشەدا، سەرمایەی کۆمەڵایەتی وەک هۆکارێکی گرنگی گەشەی ئابووری دەردەکەوێت.

ئەوەی کە مەبەستم بوو لەم بابەتەدا باسی بکەم ئەوەبوو کە ئەم سەرمایە گرنگ و بەسودە ئابووریی و زانستییە چەند بنەمایەکی سەرەکی هەیە کە گرنگترینیان بریتین لە (متمانە، هاوکاری یان هەماهەنگی کردن لەکاردا، ئەخلاق لەکاردا) کە هەرسێکیان لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا گرنگییەکی زۆریان پێدراوە و بەرانبەر هەرکامێکیان پاداشتێک دانراوە لەلایەن خودای گەورەوە بۆ ئەنجامدەرانی، هەروەک خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ إِنْ تَأْمَنْهُ بِقِنْطَارٍ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ وَمِنْهُمْ مَنْ إِنْ تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَا يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ إِلَّا مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَائِمًا ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لَيْسَ عَلَيْنَا فِي الْأُمِّيِّينَ سَبِيلٌ وَيَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ٧٥ بَلَى مَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ وَاتَّقَى فَإِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ٧٦﴾ [آل عمران]. ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُمْ بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا٥٨﴾ [النساء]. ﴿ وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ٢[المائدة]. ﴿الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ٤١﴾ [الحج].

لەم ئایەتە پیرۆزانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەگشتیی و ئابووری ئیسلام بەتایبەتی کە هەڵقوڵاوی شەریعەتی ئیسلام و یاسا و ڕێساکانیەتی، چارەسەری تەواوی پێیە بۆ کێشەکانی ئێستای جیهان ئەگەر وەک خۆی کاری پێبکرێت و پشت بە سەرجەم بنەماکانی ببەسترێت، ئەگەر لە جیهاندا کار بە بەرنامەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بکرێت بەوجۆرەی کە خوای گەورە دیاریکردووە بێگومان زۆرێک لە کێشە جیهانییەکان چارەسەر دەکرێت وەک ئەو بابەتانەی کە لەسەرەوە باسمان لێوە کردن، هەروەها پێویستە گرنگی بدرێت بەو ڕێگەچارانەی کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام دیاریکردوون و هۆکارن بۆ بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی.

**پەراوێزەکان**

1- Chopra . 2- Davidsson. 3- Satu. 4- Woodhouse. 5- Goldin

**سەرچاوەکان**


١. د.عەلی قەرەداغی، دەروازەیەک بۆ ئابووری ئیسلام، و.ئەبوبەکر پێنجوێنی، بەرگی یەکەم، چ١، ٢٠١٥.

٢. ساری ئەبوبەکر محەمەد: چوارچێوەیەکی زانستی بۆ گەندەڵی ئابووری، چ١، ناوەندی سارا، ٢٠٢٠.



د. ئیبراهیم شێخ مەهدی

# کاریگەری دامەزراوە ئابوورییە جیهانییەکان لە بەرەوپێشبردنی ئابووری جیهانی دواکەوتوودا

## دەستپێک:

جیاوازی گەشە و بەرەوپێشچوونی ئابووری لە نێوان وڵاتە پێشکەوتووە ئابوورییەکان و وڵاتە دواکەوتووە ئابوورییەکاندا یەکێکە لەو بابەتە هەستیارانەی کە سەرنجی پسپۆڕانی بواری ئابووری و هۆکارەکانی ئەم جیاوازییە لەم بەرەوپێشچوونی ئابوورییەی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە، بەشێوەیەك پرسیاری جدی دروستکردووە، کە بۆچی وڵاتە دواکەوتووەکان نەیانتوانیوە بن بە وڵاتی پێشکەوتوو لەڕووی ئابوورییەوە هاوشێوەی وڵاتە پێشکەوتووەکان؟ لەکاتێکدا هەندێك لە وڵاتە دواکەوتووەکان خاوەنی سامانی سروشتی و داهاتێکی زۆرن بەراورد بە وڵاتە پێشکەوتووەکان لەڕووی ئابوورییەوە.

زۆرێک لە وڵاتە دواکەوتووەکان بۆ کەمکردنەوەی ئەم جیاوازییە زۆرە پەنایان بۆ سستەمە ئابوورییە نوێیەکە و وڵاتانی شوێنکەوتووی(ئابووری لیبراڵی) بردووە، لە بەرامبەردا چارەسەری وڵاتە پێشکەوتووەکان زیاتر پاشکۆیەتی بەم وڵاتانە بەخشیوە، لەڕێگەی بەرنامەی هاوکاری ئابووری و قەرزەوە، زۆرێک لە چارەسەرەکان قۆناغ بەندی بوون و حاڵەتی پاشکۆیەتیان تۆختر کردووەتەوە و گرفتەکانیان ئاڵۆزتر کردووە.

وڵاتە پێشکەوتووەکان، وڵاتە دواکەوتووەکانیان ناچارکردووە بە کەمکردنەوەی ڕۆڵی حکومەت و کردنەوەی بوار بۆ سەرمایەی ڕۆژئاوایی لە ڕێگەی بەهێزکردنی ڕۆڵی دامەزراوە داراییە نێودەوڵەتییەکان و بانکە خاوەن فرە ڕەگەزەکانیان، بەشێوەیەک وڵاتە دواکەوتووەکان لەڕووی سیاسییەوە سیاسەتی خۆکوژیان پەیڕەوکردووە لەپێناو مانەوەی ئابووریی و بەرگەگرتنی کێبەرکێی ئابووریدا، بگرە وڵاتانی باکوور کێشە ئابوورییە سەختەکانیان ڕەوانەی وڵاتانی باشوور کردووە و لەسەر حسابی ئەم وڵاتانە کێشەکانی خۆیان چارەسەر کردووە.

بەپێی ئەو گۆڕانکارییە گەورەیەی لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی لە ئابووری جیهانیدا ڕوویدا، وڵاتە زلهێز و براوەکانی شەڕ(دەوڵەمەند و پێشکەوتووەکان) نەخشەی ئابووری جیهانیان دووبارە داڕشتەوە، بەشێوەیەک هەر جەمسەرێکی ئابووری کۆنترۆڵی بوارێک و فەزایەکی ئابووری کرد، کە بووە هۆی دامەزراندنی کۆمەڵێک فەزای ئابووری کیشوەری زەبەلاح و لە بەرامبەردا کۆمەڵێک فەزای ئابووری پاشکۆ کە ئامانجی ئەم کۆمەڵەی کۆتایی کۆببووەوە لە چەسپاندنی مەرکەزیەتێکی ئابووری لە بەرژەوەندی وڵاتانی پێشکەوتوو. بەهاتنی قۆناغی جیهانگیری سستەمی ئابووری جیهان کەوتە بەردەم کۆمەڵە بەربەستێکی بێوێنە و ئاڵۆز بەتایبەت وڵاتانی دواکەوتوو، بەشێوەیەک جیهانگیری زیاتر بووە دەرخەری حەقیقەتی حاڵەتی دواکەوتوویی و پاشکۆیی ئەم وڵاتانە.

لە سایەی جیهانگیریدا ڕۆشنبیری بەکاربردن لە جیهانی دواکەوتوو گۆڕا بۆ هەمان شێوەی بەکاربردنی باو لە جیهانی پێشکەوتوو، بووە هۆی بەهەدەردانی سەرچاوە داراییەکانی ئەم وڵاتانە و گۆڕینی ساختەیی خواست بەتایبەت لای چینە زەنگینەکانی کۆمەڵگە، لەچوارچێوەی جیهانگیریدا نەوت بەهای جارانی نەما و نرخی دابەزی و بووە هۆی زیاتر سڕبوونی پیشەسازییە گوڕاوەکان(الصناعات التحويلية) لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا و پەیڕەوکردنی سیاسەتی خۆپارێزی بۆ ماوەی دوورودرێژ، سەرئەنجام بووە هۆی لەدەستدانی کێبەرکێ کردن و مانەوە لە هەمان حاڵەتی دواکەوتوییدا.

جیهانگیری بوو بەهۆی گرانبوونی بەهای خۆراکی هاوردەکراو و زیادبوونی بێکاری لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا، هەروەک چۆن بووە هۆی گواستنەوەی پیشەسازییە زۆر

ژینگە پیسکەرەکان بۆ وڵاتانی دواکەوتوو و لەنێوچوونی پەیوەندی لە نێوان کەرتەکانی ئابووری نیشتیمانیدا و زیاتر گەورەبوونی کۆمپانیا فرەڕەگەزییەکان و سوودبینیان لەو جیاوازییە گەورەیەی لە نێوان وڵاتانی پێشکەوتوو و دواکەوتوودا هەیە.

بەکورتی دەکرێت بڵێین، جیهانگیری ڕووبەری جیاوازی نێوان جیهانی دواکەوتوو و پێشکەوتووی فراوانتر کرد، دەست و توانای دنیای سەرمایەداری زیاتر کردەوە بۆ دەستبەسەراگرتنی ئابوورییە جیاوازەکانی جیهان و کردنی بە پاشکۆ و بەخۆیەوە بەستییەوە، جیهانگیری ڕۆڵی دەوڵەتانی لە جیهانی دواکەوتوودا کورتکردەوە لە ئیدارەدانی وڵاتەوە بۆ ئیدارەدانی قەیرانە ئابوورییەکان بە تەنها(١).

ئەم دەسپێکە کورتەی ئاماژەمان پێدا لە وڵاتانی دواکەوتوودا هانمان دەدات بۆ لیکۆڵینەوە لە هۆکار و بەرپرسیارێتی ئەم بارودۆخەی ئەم وڵاتانەی تێکەوتووە، بەتایبەت لە سایەی دامەزراوە ئابوورییە جیهانییەکاندا کە بەدرێژایی دەیان ساڵی ڕابردوو کاریان کردووە بۆ بەرەوپێشچوونی ئەم وڵاتانە لەڕووی ئابوورییەوە و بەبێ بوونی هیچ ئەنجامێکی بەرچاو.

**وڵاتە پێشکەوتوو و دواکەوتووەکان و گەشەی ئابووری:**

بەپێویستی دەزانم بەکورتی تیشکێک بخەینە سەر هەریەک لە چمکی دامەزراوە نەختینەیی و داراییە جیهانییەکان و وڵاتانی پێشکەوتوو و دواکەوتوو و گەشەی ئابووری بەمەبەستی بەرچاوڕوونی.

**یەکەم: دامەزراوە نەختینەیی و داراییە جیهانییەکان:** هەریەک لە دامەزراوەی نەختینەیی و دارایی جیهانی دوو پایەی سستەمی ئابووری نوێی جیهان پێکدەهێنن لەگەڵ پایەی سێیەم کە دامەزراوەی بازرگانی نێودەوڵەتییە. سستەمی ئابووری خاوەن توانا و سەربەخۆ لە جیهانی ئەمڕۆدا ئەو سستەمە ئابوورییەیە کە دەتوانێت هاوسەنگی بەدەستبهێنێت لەلایەن دامەزراوەی نەختیی و دارایی جیهانییەوە و پاڵپشتی دامەزراوەی بازرگانی نێودەوڵەتی هەبێت، لە ئێستادا سەرکردایەتی سستەمی نەختینەیی و دارایی جیهان خۆی دەبینێتەوە لە هەریەک لە دامەزراوەی سندوقی نەختینەیی جیهانی و دامەزراوەی بانکی جیهانی و سەنتەری بازرگانی جیهانی.

دوای کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی دوو کۆنگرەی جیهانی بەسەرکردایەتی براوەکانی جەنگ(ئەمریکا، بەریتانیا، یەکێتی سۆڤێت) بەسترا، یەکەمیان سیاسی بوو کۆنگرەی(یاڵتا-١٩٤٥) کە بۆ دابەشکردنی دەستکەوتەکانی جەنگ بوو، دووەمیان ئابووری بوو(بریتن وودز-١٩٤٤)، کە بووە هۆی دروستبوونی سندوقی دراوو بانکی نێودەوڵەتی، کۆنگرەی دووەم بەبێ یەکێتی سۆڤیەت بوو.

**یەکەم: دامەزراوەی سندوقی دراو بانکی جیهانی(٢)**

– سندوقی دراوی جیهانی: ((دامەزراوەیەکی نەختینەیی جیهانییە، کە سستەمی نەختینەیی لە جیهاندا بەڕێوەدەبات لە ڕێگەی جێبەجێکردنی سیاسەتی نەختینەیی کە دەبێتە هۆی هاوسەنگی و چارەسەری کورتهێنان لە تەرازووی پێدانی دەرەکیدا، لە وڵاتانی ئەندامی سەر بەم دامەزراوەیەدا. کە بە ئالیەتی باربۆکردنی نێودەوڵەتی کورتخایان ناسراوە، دروستبوونی ئەم سندوقە دەگەڕێتەوە بۆ دوو پرۆژەی جیاوازی (بەریتانی و ئەمریکی)، کە بە کۆنگرەی (بریتن وودز) ناسراوە لە ساڵی ١٩٤٤ دوای ئەوەی پرۆژە ئەمریکییەکە سەرکەوتوو بوو دروستبوونی سندوقی دراوی جیهانی لێ پەیدابوو، لێرەدا بوار نییە بۆ بە دووروودرێژی باسکردنی ئامانج و پەیکەر و هتد.. ئەم سندوقە، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەم سندوقە دڵ و بزوێنەری سستەمی نەختینەیی جیهانییە کە بڕیارە یەکلاییکەرەوەکانی ئەم سندوقە بە زۆرینەی دەنگ(٨٥٪) جێبەجێ دەکرێت، کە خودی وڵاتەیەکگرتووەکان مافی (١٧,٠٨٪) دەنگەکانی هەیە، واتە بەبێ ڕازیبوونی ئەمریکا هیچ بڕیارێک یەکلایی نابێتەوە تێیدا، بەڵام هەر بەپێی ڕێکەوتن بەڕێوبەری ئەم سندوقە نابێت ئەمریکی بێت، بەڵکو ئەورووپییە و لە بەرامبەردا هەمیشە ئەمریکا بەڕێوەبەری بانکی نێودەوڵەتی لەلایە.

– بانکی جیهانی: بەشێوەیەکی گشتی ئەم دامەزراوەیە دەرهاویشتەی هەمان کۆنگرەی(بریتن وودز)ی دروستبوونی سندوقی دراوی جیهانی بوو، بەڵام کارەکانی فراوان تر بوو، سەرپەرشتی سستەمی دارایی جیهانی دەکات، گەرچی لە سەرەتادا ئامانج لە دروستبوونی ئاوەدانکردنەوەی ئەو کاولکارییە بوو کە بەهۆی جەنگی دووەمی جیهانییەوە بە ئەورووپا گەیشت بوو، پاشان پێدانی قەرز پێیان بەمەبەستی بونیادنانی پیشەسازی و ژێرخانی ئابووری و پرۆژەکانی گەشەسەندنی ئابووری، بەشێوەیەک ئالیەتی باربۆکردنی درێژخایەنە.

**دووەم/ گەشەی ئابووری(٣):** چمک و دەستەواژەی گەشەکردن لە ناوەڕاستەکانی سەدەی ڕابردوو دەرکەوت و بەکارهات لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی و مەبەست لێی گەشەکردنی خێرای ئابووری بوو لە ڕێگەی بەرزکردنەوەی گەشەی کۆی داهاتی نەتەوەیی و ناوەندی داهاتی تاک، بۆیە گەر بە تێڕوانینە کلاسیکییەکە پێناسەی بکەین ((بریتییە لەو گۆڕانکارییانەی کە دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی داهاتی نەتەوەیی و ناوەندی داهاتی تاک لە ماوەیەکی زەمەنی دیاریکراودا))، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات و نەبوونی ڕۆڵی گونجاوی گەشەی ئابووری وەکو پێویست لە وڵاتانی جیهانی سێهەم، چەمکی گەشەکردن گۆڕا بۆئەوەی پەیوەست بێت بە چەندین لایەنی مەعریفی ترەوە، بەشێوەیەک تێڕوانینی تازە بۆ چەمکی گەشەکردن وەک هۆکارێک سەیری ئەم چەمکە دەکات لە

ئێستادا نەک وەک ئامانج، بەشێوەیەک ببێتە ئالەتێک لە توانایدا هەبێت ببێتە هۆکار بۆ سڕینەوەی ئەو هەژارییەی ماوەیەکی زۆرە یەخەی وڵاتانی جیهانی سێهەمی گرتووە، هەروەها بتوانێت هەلی کاری فراوان دابین بکات و دووبارە بەشێنەوەیەکی سامانی دادپەروەرانە فەراهەم بکات، بۆیە لە ئێستادا چەمکی گەشەکردن بەرەوپێش چووە و زۆر گشتگیرترە لە گرنگیدان بە گەشەی ئابووری کە یەکەم جار لە پێناویدا پەیدابوو، بەشێوەیەک ئێستا چەمکەکە گۆڕاوە بۆ چمکی گەشەکردنی گشتگیر (التنمیة الشاملة).

**سێهەم: وڵاتە دواکەوتووەکان(٤):** دواکەوتوو یاخود ئەو چەمکانەی باسی دیاردەی دواکەوتوویی دەکەن فرە و هەمەچەشنەن، بەشێوەیەک زۆرێک لە سەرەتای پەیدابوونی ئەم چەمکانە سەرەتایەکی سیاسی بوون پێش ئەوەی زانستی بن، خودی دابەشکاری وڵاتان بۆ دوو گرووپ یەکەمیان پێشکەوتوو ئەوی تریان دواکەوتوو دەرەنجامی جەنگی دووەمی جیهانی بوو، لێرەوە چەمکی (دواکەوتوو) دەرکەوت کە لەهەمانکاتدا وێنایەک بێت بۆ پیشاندانی حاڵەتی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقا و ئەمریکای لاتین بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٤٣.

> **وڵاتانی باکوور کێشە ئابوورییە سەختەکانیان ڕەوانەی وڵاتانی باشوور کردووە و لەسەر حسابی ئەم وڵاتانە کێشەکانی خۆیان چارەسەر کردووە.**

بەشێوەیەکی گشتی چەمکی وڵاتانی(دواکەوتوو – تازە گەشەکردوو- جیهانی سێهەم) بەکاردێت بۆ ئەو وڵاتانەی کە سەرکەوتوو نەبوون لەڕووی ئابوورییەوە، نەیانتوانیوە هەمەچەشنی بکەن لە سەرچاوەکانی داهات و بەردەوام دەستەئەژنۆی وڵاتانی دەرەوە بوونە، نەیانتوانیوە ئابوورییەکی هاوسەنەگ بنیادبنێن کە ناوەندەکانی هەڵاوسان و بێکاری تێیاندا هاوسەنگ بن، نەیانتوانیوە دەزگای باش بنیادبنێن لە ئیدارەدانی ئابووریی و کۆمەڵگەدا بەشێوەیەک لەگەڵ گۆڕانکاری لە سستەمی حوکمڕانیدا ئەم دامەزراوانە گۆڕانکاریان بەسەردا نەیەت، هەروەک چۆن ئەم وڵاتانە نەیانتوانیوە سەرکەتووبن لە دروستکردن و بوونی خوێندنی پێشکەوتوو کە بتوانن کێبەرکێ لەگەڵ وڵاتانی دەرەوەی خۆیاندا بکەن، ئەمە سەرباری لاوازی لە بوونی خزمەت گوزارییە گشتییەکانی وەک تەندروستی و کارەبا و ئاو ئاوەڕۆ و نەبوونی ژێرخانی ئابووری پێویست، هەروەک چۆن لەڕووی سستەمی سیاسییەوە ئەم وڵاتانە نەیانتوانیوە خۆیان لە پاشماوە و کاریگەرییە خراپەکانی نەتەوە و

خێڵ و مەزهەب و ئینتیە جیاوازەکان ڕزگار بکەن، تا دەگات بەوەی نەتوانن سستەمێکی دادوەری سەربەخۆ دروستبکەن و جیاوازی نێوان دەسەڵاتەکان بکەن، بەشێوەیەک کاریگەری پیاوانی ئاینیی و خێڵ و هۆزەکان و نەتەوەکان نەهێڵن لە بەڕیوەبردنی وڵاتدا.

چوارەم: وڵاتانی پێشکەوتوو یاخود گەشەکردوو: ئەو وڵاتانەن کە ئەو پێویستیانەیان تێدایە کە لە پێشەوە باسمان کرد لە وڵاتانی دواکەوتوودا نیە بەشێوەیەکی بەرچاو و باشتر بە بەروارد بە وڵاتانی دواکوتوو.

نابێت ئەوە لە بیر بکەین کە هەردوو چەمکی (گەشەکردوو- دواکەوتوو) دوو چەمکی ڕێژەیین، بەشێوەیەک ناکرێت چەمکی دواکەوتوو بسەپینرێت بەسەر تەواوی ئەو وڵاتانەی کە دەکەونە ئەو ناوچە جوگرافیاییەوە کە وڵاتانی دواکەوتووی لێیە، لەوانەیە ئەم وڵاتانە هەندێ تایبەتمەندی هاوبەشیشیان هەبێت، بەڵام لەڕووی دۆخی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابوورییەوە جیاوازییان هەیە.

**بەربەست و سیما دواکەوتووەکانی وڵاتانی دواکەوتوو:**

بەربەستگەلێکی زۆر هەن لە بەردەم وڵاتانی دواکەوتوودا کە بوونەتە ڕێگر لە بەردەم بەرەوپێشچوونی زۆرینەی ئەم وڵاتانە و مانەوەیان لە بازنەی هەژاریی و دواکەوتوییدا، لە دیارترینیان لاوازی گەشە و بەرەوپێشچوونی ئابووریی و نزمی و بێکەڵکی ناوەندی بەرهەمهێنان و دواکەوتوویی هۆکارەکانی ئاڵوگۆڕی بازرگانی ناوخۆیی و دەرەکی و نەبوونی هۆکارەکانی کەڵەکەبوونی سەرمایەی دارایی و ناڵاندنیان بەدەست قەرزی دەرەکییەوە، ئەمە وەک ئاماژەمان پێدا سەرباری بوونی سامانی سروشتی زۆر لە هەندێک لەم وڵاتانەدا، لەگەڵ بوونی هێزی کاری کارا کە لەبەر نەبوونی هەلی کاری پێویست ناچار بە کۆچ بووە بۆ وڵاتانی پێشکەوتوو، کە وڵاتە پێشکەوتووەکان سوود لە توانا و پسپۆڕی ئەم هێزی کارە وەردەگرن و لە بەرامبەردا وڵاتە دواکەوتووەکان توانا و پسپۆڕییەکی زۆری مرۆیی لەدەست دەدەن کە بۆ گەشەکردن و بەرەوپێشچوونی وڵاتەکەیان پێویستە.

دەکرێت ئەم چەند خاڵەی خوارەوە وەک دیارترین سیمای دواکەوتوویی وڵاتانی دواکەوتوو دەستنیشان بکەین(٥):

١. بوونی گەندەڵییەکی بێ شومار لە بەرێوەبردنی وڵاتدا، کە سەرەنجام بووە بەهۆی خراپ دابەشکردنی سامان و داهاتی تاکەکەسی.

٢. بێ توانایی دەوڵەت لە پلاندانانی گەشەکردنی وڵاتدا.

٣. بوونی کەم و کورتی و دابین نەکردنی پێداویستییە گشتییەکان بەتایبەت خۆراک.

٤. بارگرانی قەرزی دەرەکی بەسەر ئابووری وڵاتەوە.

٥. سەرفکردنی زۆرینەی داهاتی نەتەوەیی لە دامەزراوە سەربازیی و ئەمنییەکاندا

بەناوی پارێزگاری لە شکۆ و سەروەری وڵات، کە هەموو ئەمانە لەسەر حسابی بوارە هەستیارەکانی نێو کۆمەڵگەن و پێویستیان بە گەشەکردن و گرنگی پێدان هەیە.

٦. ڕێژەیەکی زۆر لە وڵاتە دواکەوتووەکان پێویستی بە سەرچاوەی سامانی سروشتییە بۆ بنیادنانی پیشەسازی نیشتمانی بەمەبەستی فەراهەمکردنی هەلی کار بۆ ئەو ڕێژە زۆرەی لە دەستی کار کە هەیانە.

٧. زۆرێک لە وڵاتە دواکەوتووەکان بەتەواوی پشت دەبەستن بە ئابووری کشتوکاڵ، کە خودی ئەم ئابوورییە پێویستی زۆری بە چاکسازی ڕیشەیی هەیە.

**ڕۆڵی دەوڵەتانی پێشکەوتوو و دامەزراوە ئابوورییەکانیان**

**لە بەرەوپێشچوونی ئابووری وڵاتانی دواکەوتوودا:**

لەڕاستیدا مەنتقی تەندروست نەک بۆ دواکەوتوویی ئابووری وڵاتنمان، بەڵکو هەمیشە و لە هەموو کارێکدا ئەوەمان پێ دەڵێت نابێت سەرنەکەوتوویی خۆمان بخەینە ئەستۆی ئەوانی تر، یاخود لانیکەم هەموو بەر پرسیاریەتییەکە نەدەین بەسەر ئەوانی ترداو خۆمانی لێ بێبەری بکەین، بەڵام واقعی ئەم وڵاتانە ئەوەمان پی دەڵێت کە وڵاتانی پیشکەوتووی ئەمڕۆ ڕۆلی کاریگەریان هەیە لە دواکەووتویی جیهانی سێهەم(خۆیان گووتەنی)، چ بەهۆی داگیرکاری لە ڕابردوودا و چ بەهۆی کردنی ئەم وڵاتانە بە پاشکۆی خۆیان کە ئەویش جۆریکی ترە لە داگیرکاری نوێ.

هەڵبەت ئێمە لیرەدا نامەنەوێت باسی ڕۆڵ و کاریگەری وڵاتە پێشکەوتووەکان بکەین لە سەردەمی داگیرکاری لەسەر دۆخی دواکەوتوویی لە وڵاتانی دواکەوتوودا، گەرچی کۆی ڕووداوە یەک لەدوای یەکەکان پەیوەندی و کاریگەرییان لەسەر یەکدی هەیە، بەڵکو دەمانەوێت باس لە ڕۆڵی ئەو وڵاتانە بکەین کە لە ئێستادا وەک وڵاتە پێشکەوتووەکان ناویان دەبەین و دەیان ساڵە لە ڕیگەی دامەزراوە بازرگانی و دارایی و نەختینەییەکانیانەوە سەرقاڵی بەرەوپێشچوونی ئابوورین لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا و بەبێ بوونی هیچ ئەنجامێکی ئەوتۆ و دڵخۆشکەر بگرە قوڕەکەیان خەستتر کردۆتەوە.

شێوە و دەرەنجامەکانی دەستوەردانی دامەزراوە نەختینەیی و داراییە جیهانییەکان لە وڵاتانی دواکەوتوودا:

ئەو دامەزراوە نەختینەیی و داراییانەی کە لە ئەنجامی کۆنگرەی (بریتن وودز)وە دروستبوون، چالاکی و گرنگی دانەکانیان گۆڕران و بەرەوپێشچوون، بەهۆی گۆڕانکاری لە چڕبوونەوە و هەمەچەشنەیی یارمەتییەکانیان بۆ ئابووری وڵاتان لە بواری دارایی و نەختینەییدا، کە لە سەرەتادا ئەم جۆرە چالاکیانەیان نەبوو. زۆرێک لە وڵاتانی دواکەوتوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ناهاوسەنگی و باری خواری ئابووری هەمووەکیان کە ببووە هۆی تێکچوونی بوجەی گشتی وڵات و ترازووی پێدانی دەرەکییان، ناچار(دروستتر

ئەوەیە بوترێت ناچارکران) بە پیادەکردنی سیاسەتی دامەزراوە ئابوورییە لیبرالییە دارایی و نەختینەییە نێودەوڵەتییەکان بوون بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم دۆخە.

ئەو بەرنامە چاکسازییە ئابوورییانە چی بوون؟ ڕۆڵی دامەزراوە نەختینەیی و داراییە نێودەوڵەتییەکان لەم چاکسازییە چی بوو؟ لێکەوتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی ئەم چاکسازییە لە جیهانی دواکەوتوودا چی بوون؟

ئەو بەرنامە چاکسازییە ئابوورییەی کە دامەزراوە ئابوورییە جیهانییەکان فەرزی دەکەن بە بەرنامەی چاکسازی بنەڕەتی ناسراوە، واتە پیادەکردنی ئابووری ئایدۆلۆژی بازاڕی ئازاد وەک ڕاگوزەرییەک لە کار و چالاکی ئابووری پلان بۆ دانراوی مەرکەزی (دەستی دیار) بۆ ئابووری بازاڕ(اقتصاد السوق- دەستی شاراوە)، هەڵبەت ئەمانە هەمووی دوای ژێرکەوتنی وڵاتانی دواکەوتوو بوو لەژێر قەرزێکی زۆردا، کە داوایان کرد دووبارە چاو بە گەڕانەوەی شێوەی قەرزەکانیان بگێڕدرێتەوە(٦).

سندوقی دراوی جیهانی بەوپێیەی کاری چارەسەرکردنی ناڕێکییەکانە لە تەرازووی پێدانی دەرەکی و نرخی دراوەکاندا هەڵدەستێت بە پێشکەشکردنی پەیکەری چاکسازییە ئابوورییەکانی کە خستنەڕووی پەیوەندییەکی هۆکارییە لە نێوان هەریەک لە کورتهێنان لە تەرازووی پێدانی دەرەکیدا کە دەبێتە هۆی زیادبوونی کێشەی قەرزەکان و خواستی گشتی، کە دەبێت ئەم کێشانە چارەسەر بکرێن لە ڕێگەی کاریگەری دروستکردن لەسەر بارستەی نەختی بەردەستەوە لە بازاڕدا و و داگرتنی بەهای دراوی نیشتمانی، زیادکردنی خستنەڕووی دراو لە ڕێگەی سیاسەتی دارایی فراوانەوە خواست لەسەر شمەک و خزمەتگوزارییەکان زیاد دەکات، کە لەڕاستیدا ئەمە لەگەڵ بوونی جهازی خستنەڕووی نیشتمانی بێهێزدا نایەتەوە کە لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا بوونی هەبووە و هەیە، کاری دابەزاندنی بەهای دراوی نیشتمانی بەمەبەستی زیادکردنی هەناردە و کەمکردنی هاوردەیە، هەروەها بەرزکردنەوەی ناوەندی سوو(فائدە) و زیادکردنی باج و خەرجی گشتی(لە سێکتەرەکانی تەندروستی و پەروەردە و کەمکردنەوەی مووچە و هەڵگرتنی پاڵپشتی لەسەر شمەکی هاوردەکراو و سووتەمەنی و...)، بەمانایەکی دی وڵاتەکان ناچار بە شوێنکەوتنی سیاسەتی سک هەڵگوشین دەکەن لە ڕێگەی فشار خستنە سەر پێداویستی و خزمەتگوزارییە بنەڕەتی و گشتیەکانی گەلانیان، مەبەست لە ڕێ و شوێنەکانی سندوقی دراو کەڵەکەبوون و زیادبوونی سەرمایەی وڵاتانی دواکەوتووە بەو دراوانەی توانای کڕین و فرۆشتنیان ئاسانە و دەبنە گرەنتی دانەوەی قەرزە کەڵکەبووەکانی سەریان(٧).

لە بەرامبەردا بانکی نێودەوڵەتی لە ڕێگەی بەرنامەی چاکسازییەکانییەوە کار لەسەر ئەوە دەکات کە کێشەی زیادبوونی قەرزە دەرەکییەکان پەیوەندیان بە خستنەڕووی

گشتییەوە هەیە، بەتێڕوانینی پسپۆڕانی بانکی نێودەوڵەتی هۆکاری دواکەوتنی کاروانی گەشەی ئابووری لە وڵاتانی دواکەوتوودا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئایدۆلۆژیایانەی کە وڵاتان پشتی پێ دەبەستن لە پلانە ئابوورییەکانیاندا بۆ پێشخستنی ئابوورییەکانیان، بۆیە دەبێت پەنا ببەنە بەر بەتایبەتکردنی سێکتەرەکان و خۆقوتارکردن لەدەستکەرتی گشتی و ئازادکردنی نرخەکان، هەمان ئەو ڕێگانە دەگرێتەبەر کە سندوقی دراو دەیگرێتەبەر، هەڵدەستێت بەپێدانی قەرزی درێژخایان بە وڵاتان بەمەبەستی بەشداربوون لە بازاڕە جیهانییەکان لە ڕێگەی ئازادکردنی ئاڵوگۆڕی بازرگانی دەرەکییەوە هانی وڵاتان دەدات، هەڵبەت هەماهەنگی هەیە لە نێوان سەرجەم دامەزراوە ئابوورییە جیهانیەکان(نەختی- بانکی- بازرگانی) بۆ بەرەو ئازادکردنی بازرگانی جیهانی، بەشێوەیەک ئەگەر سندوقی دراوی جیهانی ئامانجی پەیوەستکردنی وڵاتانی دواکەوتوو بووبێت بۆ گێڕانەوەی قەرزەکانیان، ئەوا بانکی جیهانی کاری بنەڕەتی بریتی بووە لە قوتارکردنی ئابووری زلهێزان لە قەیرانە ئابووریی و داراییەکان.

دەکرێت بڵێین ڕۆڵی هەریەک لە سندوق و بانکی جیهانی دانانی وەسفەیەکی ئابووری گشتی بوو وەک چارەسەرێک بۆ ئەو وڵاتانەی کە بەدەست گرفتی ئابوورییەوە دەیان ناڵاند و دەناڵێنن، لە بوارەکانی (خواست و خستنەڕوو)ی گشتیدا جێبەجێیان بکەن، بە پیادەکردنی هەرسێ بنەمای (لیبراڵی بوون- تایبەت کردن- سک هەڵگوشین) بەبێ ڕەچاوکردنی دۆخی جیاوازی نێوانیان، دەکرێت بەکورتی لەم خاڵانەدا کۆیان بکەینەوە(٨):

١. ئازادکردنی نرخەکان: بەشێوەیەک هیچ کۆنترۆڵ و ڕۆڵێک بۆ حکومەتەکان نامێنێتەوە بەسەر نرخەکانەوە، هەروەها وازهێنان لە پاڵپشتی شمەکە گشتییەکان(سووتەمەنی – خۆراک-تەندروستی...) بەبێ چاوخشاندنەوە و زیادکردنی کرێی گشتی، بەمەش تەواوی قورسییەکان دەکەوێتە سەرشانی چینی فەرمانبەرانی میریی و خاوەن داهاتە نزمەکان.

٢. زیادنەکردنی کرێی گشتی: واتە بەندی کرێی گشتی لە بوجەی گشتی وەک خۆی دەبێت و زیاد ناکات، بەشێوەیەک حکومەت فەرمانبەری نوێ دانامەزرێنێت و بەرزە مووچەی نوێش بە فەرمانبەرانی کۆن و خاوەن خزمەت نادات، زۆر جاریش حکومەت دەستهەڵدەگرێت لە هەزارەها کرێگرتەی کۆن، بەمەش هەڵاوسانێکی زۆر لە ژمارەی بێکاراندا ڕوودەدات.

٣. داگرتنی بەهای دراوی نیشتمانی لە بەرامبەر دراوە جیهانییەکان: بەومانایەی داگرتنی بەهای دراو دەبێتە هۆی زیادکردنی ناردەنییەکان بەهۆی هەرزانی نرخیانەوە بەراورد بە شمەکەکانی دەرەوەی وڵات، هەروەک چۆن بەهۆی کەم بەهایی دراوی ناوخۆ نرخی شمەکە دەرەکییەکان(هاوردەکان) زۆرتر دەبێت، بەمەش هەم ڕێژەی هەناردە بەرز دەبێتەوە کە دەبێتە هۆی هاندانی بەرهەمهێنەکان بۆ زیادکردنی ڕێژەی بەرهەمی هەناردە،

چونکە کەمی بەهای دراوی نیشتمانی خواستی دەرەکی لەسەر شمەکی ناوخۆیی زیاد دەکات، هەم ڕێژەی هاوردەی کەم دەکات، بەمە حکومەت دەتوانێت دراوی بیانی زیاتری دەستبکەوێت بۆ دانەوەی قەرزە دەرەکییەکانی.

٤. بەتایبەتکردنی سێکتەرە ئابووریی و خزمەتگوزارییە گشتییەکان و کردنەوەی دەرگا لەسەر پشت بۆ وەبەرهێنی دەرەکیی و کۆمپانیا خاوەن فرەڕەگەزییەکان.

٥. کەمکردنەوەی بوجەی گشتی: لە ڕێگەی کەمکردنەوەی خەرجییە گشتییەکانی حکومەت و نەهێشتنی پاڵپشتی شمەک و خزمەتگوزارییە گشتییەکان، لە بەرامبەردا بەرزکردنەوەی باج و بەتایبەتکردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان.

٦. ئازادکردنی بازرگانی دەرەکی و لابردن و کەمکردنەوەی بەربەستە گومرگییەکان، بەمەبەستی هاتنە ناوەوەی شمەکی وڵاتانی سەرمایەداری.

**لێکەوتەکانی جێبەجێکردنی بەرنامەی خۆگونجاندنی(٩) دامەزراوە ئابوورییە جیهانییەکان لە وڵاتانی دواکەوتوودا:**

لە بنەڕەتدا سیاسەتی خۆگونجاندنی پەیکەری ئابووری بۆ چارەسەری گرفتە ئابوورییەکانی جیهانی دواکەوتوو بوو، بۆیە ڕاستەوخۆ تێیدا کار لەسەر بوارە ئابوورییەکان کرا، بەڵام دواتر لێکەوتەکانی ئەم خۆگونجاندنە بە ئابوورییەوە نەوەستا و پەڕییەوە بۆ لێکەوتەی سیاسیی و کۆمەڵایەتیش، دەکرێت لیکەوتەکانی خۆگونجاندنی ئابووری بەم شێوەی خوارەوە بخەینە ڕوو:

١. لێکەوتە ئابوورییەکان(١٠): ئەگەر نمونەیەک وەربگرین بۆ ئەنجامی سیاسەتی دامەزراوە ئابوورییەکان لە وڵاتانی دواکەوتوو لەڕووی( پێوانەی ڕۆڵی جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی خۆگونجاندنی دامەزراوە ئابوورییەکان لە پێش و لە دوای جێبەجێکردنی سیاسەتەکان).

ئەوەی تێبینی دەکرێت لە ئەنجامی جێبەجێکردنی سیاسەتی دامەزراوە ئابوورییە جیهانییەکان دژەکەی هاتۆتە دی، بەشێوەیەک جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتانە بوونەتە هۆی دروستبوون و برەوپێدانی (هەڵاوسان و داشکانی) ئابووری لەو وڵاتانەی تێیاندا جێبەجێکراوە.

لە یەکێک لەو توێژینەوانەی خودی سندوقی دراوی جیهانی لە ساڵی ١٩٩٥ ئەنجامیداوە، لەبارەی ئەو سیاسەتە چاکسازییانەی لە (٣٦) دەوڵەت جێبەجێکراوە لە (١٩٨٨-١٩٩١)، ئەوەی تێبینیکراوە لە هەندێک وڵاتی کەمی ناو توێژینەوەکە ناوەندەکانی هەڵاوسان کەمیکردووە، بەڵام زۆرینەی وڵاتەکانی تری ناو توێژینەوەکە ناوەندی هەڵاوسان تێیاندا زیادیکردووە، یاخود هیچ گۆڕانکاریەکی بەسەردا نەهاتووە و وەک پێشتر بە بەرزی ماوەتەوە، هەروەک چۆن گەشەیەکی بەرچاو لە هیچ کام لەو وڵاتانەی توێژینەوەکەیان

لەسەر کراوە ڕووی نەداوە و وەبەرهێنانیش گۆڕانکاری ئەوتۆی لە بەرهەمی گشتی نەتەوەییدا نەکردووە(١١).

هەروەک چۆن توێژینەوەی تر لەمبارەوە لە سەر ڕۆڵی هەردوو سندوقی دراو بانکی جیهانی لە کەمکردنەوەی هەژاریی و قەرز کراوە لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو، دەرکەوتووە سیاسەتەکانی ئەم دوو دامەزراوە کە وڵاتان جێبەجێیان کردووە کاریگەری پێچەوانەی بووە، بەشێوەیەک تێچووەکانی قەرزی لە( ٤٨٪ بۆ ٨٥٪) بەرزکردۆتەوە، لەبەرامبەردا ئەو وڵاتانەی سیاسەتەکانیان جێبەجێ نەکردووە و بەشدار نەبوون لەگەڵ ئەم دوو دامەزراوە بۆ ئەم مەبەستە، تێچووی قەرزەکانیان یان نەگۆڕاوە یاخود بەڕێژەیەکی بەرچاو دابەزیوە(١٢).

ئەوەی دەرکەوتووە وڵاتە دواکەوتووەکان کە بەدەست قەرزەوە دەناڵێنن، بۆ گێڕانەوەی قەرزەکانیان بەپێی ڕێنمایی سندوقی دراو بانکی جیهانی دەبێت نزیکەی(٤٠٪) بوجەی گشتی بۆ قەرز دابنێن لەسەر حسابی بوارەکانی گەشەکردنی وەک خوێندن و تەندروستی و... بەمەش قەرزی ئەو دوو دامەزراوەیە لەبری ئەوەی ببنە بنەمایەکی گەشەکردن لە وڵاتی قەرزکەردا دەبێتە بەربەست و قورسایی کە ناتوانن خۆیانی لێ دەرباز بکەن، بگرە زۆرجار ئەم وڵاتانە بۆ دانەوەی قەرزەکانیان پەنا بۆ قەرزی تر دەبن، کە بەمەش دەکەونە نێو بازنەیەکی بەتاڵ کە دەرچوون لێی لە مەودای کورت و مام ناوەندیدا مەحاڵە.

لەگەڵ ئەو دەرەنجامە و چەندانی تر هێشتا دامەزراوە دارایی و نەختینە جیهانییەکان پێیانوایە جێبەجێکردنی سیاسەت و هەنگاوەکانیان لەڕووی تیۆرییەوە سەلامەت و بێ کێشەن، ئەوەی وادەکات سەرکەوتوو نەبن پابەندنەبوونی خودی وڵاتان بەم سیاسەتانەوە بەشێوەیەک کە کاریگەری نابێت، یاخود هەندێ هۆکاری تری دەرەکی وەک خراپی ژینگە و وشکەساڵی و مەرجەکانی ئاڵوگۆڕی بازرگانین نەک کەموکورتی بەرنامەی دامەزراوە ئابوورییەکان بێت.

٢. لێکەوتە کۆمەڵایەتییەکان: بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ بوونی لێکەوتەی باشی کۆمەڵایەتی جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی خۆگونجاندنی ئابووری لێکەوتەی خراپ و زەقی کۆمەڵایەتی لە وڵاتانی دواکەوتوو تۆختر کردۆتەوە و بەجێی هێشتووە، کە ئەوانیش:

– هەژاری: بەهۆی جێجێکردنی سیاسەتە داکشاوەکانی دامەزراوە ئابوورییە جیهانییەکان لە (دابەزاندنی بەهای دراوی نیشتمانی و کەمکردنەوەی کرێی گشتی و نەمان و لابردنی باربۆکردنی خزمەتگوزاری و پێداویستییە گشتییەکان و زیادکردنی باج و ڕسومات)، ئەمانە هەمووی بوونەتە هۆی بەرزکردنەوەی نرخی شمەک و خزمەتگوزارییەکان بەتایبەت هاوردەکراوەکان و ئەو بەرهەمە ناوخۆییانەی پشت بە

شمەکی هاوردە دەبەستن، کە دواتر دەبنە هۆی زیادکردنی هەژاریی و کەمکردنەوەی توانای پڕکردنەوەی پێداویستییەکان لەلایەن هاوڵاتیانەوە(١٣).

گەرچی دامەزراوە ئابوورییە جیهانییەکان پێیانوایە ئەم سیاسەتانە دەبێتە هۆی ئەوەی هەژارانی گوندەکان سودمەندبن بەهۆی ئازادکردنی نرخەکان و کەمکردنەوەی هاوردە شمەکەکانیان پارەی زیاتر بکات و داهاتیان بەرز ببێتەوە، ئەمە گەرواش بێت لێکەوتەی پێچەوانەی دەبێت و هەژارەکانی شارنشین بارگران تر دەکات بەهۆی بەرزبوونەوەی نرخەکان لەلایەک، لەلایەکی دی دابەزاندنی بەهای دراوی نیشتمانی نرخی ئەو شمەکانەی لە بەرهەمهێنانی کشتوکاڵیدا بەشدارن بەرزتر کردۆتەوە لە (پەینی کیمیایی- ئالەتی کشتوکاڵی و پارچەکانیان- تێچوو کرێی گواستنەوەی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان...)، بەمەش تەنها ئەو چینانە سوودمەند دەبن کە سەرمایەداری گەورە و مامناوەند و کۆمپانیا فرەڕەگەزەکانن( دەتوانن بەرگەی بەرزبوونەوەی شمەکە بەشداربووە گرانبووەکانی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی بگرن)، نەک هەژارەکانی خاوەن کێڵگەی بچووکن و ئەو توانایەیان نییە و ئەرکیان دژوارتر دەکات(١٤).

بەشێوەیەکی گشتی دەکرێت بوترێت سیاسەتی خۆگونجانی دامەزراوە ئابوورییە جیهانییەکان دەبێتە زیادبوونی ڕێژەی هەژاری، کە زۆر جار زیادبوونی ئەم ڕێژەیە لێکەوتەی تری دەبێت وەک کۆچکردنی تواناکانی وڵات بۆ دەرەوەی وڵات و بڵاوبوونەوەی تاوان و کارکردن بە ژنان و منداڵان، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گرانی نرخ و پڕکردنەوەی داهاتی لەدەستچوو، کە ئەمەش دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی بێکاری زیاتر لە نێوان چینی نێری ئامادەبووی کار، پاشان ئەنجامدانی هەڵسوکەوتی نەشیاوی کۆمەڵایەتی لەلایەن ئەم چینە بێکارەوە(١٥).

- خراپ دابەشبوونی داهات: ڕەنگە خراپ دابەشبوونی داهات وەک دەرەنجامی سیاسەتی خۆگونجانی پەیکەری پەیوەندی توندوتۆڵی لەگەڵ زیادبوونی ڕێژەی هەژاری هەبێت، بەڵام لەلایەکی ترەوە ئەم سیاسەتانە دەبنە هۆی بەهێزکردنی پێگەی هەندی گرووپی تری نێو کۆمەڵگە، کە ئەوانیش گرووپە باڵادەست و دەستڕۆشتووەکانی نێو کۆمەڵگەن، چونکە جێبەجێکردنی سیاسات و ڕێوشوێنەکانی دامەزراوە ئابوورییەکان ڕەنگدانەوەی باشی لەسەر ئەم گرووپانە هەیە، بەتایبەت ڕێوشوێنەکانی(دابەزاندنی بەهای دراوی نیشتمانی- بەرزکردنەوەی نرخەکان-بەرزکردنەوەی نرخی سوو)، چونکە هەرکات کە بەهای دراوی نیشتمانی دادەبەزێت ئەم گرووپانە و بەتایبەت لە دەرەوەی وڵات پارەیەکی زۆری یەدەگی بێگانەیان هەیە، هەروەها لە زیادبوونی نرخی سوەکان قازانج دەکەن بەوەی دراوی نیشتمانیشیان زۆرە و سووی زیاتریان بۆ دەهێنێت، چونکە ئەم گرووپانە گەورە پاشەکەوت کارن، بۆیە دەبینین لە قەیرانە ئابوورییەکاندا ئەم گرووپانە

بەکاربردنیان زیاد دەبێت بەتایبەت بۆ شمەک و خزمەتگوزارییە کەمالییەکان(١٦).

هەروەک چۆن لەکاتی بەتایبەتکردنی کەرتە گشتییەکاندا ئەم ڕووبەری جیاوازییە فراوان تر دەبێت، بەوەی ئەم گرووپانە دەبنە خاوەنی ئەو کەرتە گشتییانە لەڕێگەی کڕینەوە بەو پارە زۆرەی لەبەردەستیاندایە، لەبەرامبەردا چینەکانی تری کۆمەڵگە(مامناوەند و هەژار) داهاتیان کەمتر دەبێت، چونکە سیاسەتەکانی خۆگونجاندن کار لەسەر کەمکردنەوەی کرێی گشتی دەکات کە داهاتی سەرەکی چینە خوارووەکانی کۆمەڵگەن، کار لەسەر بەرزکردنەوەی قازانج دەکات کە دەچێتە گیرفانی چینە دەوڵەمەندەکەی نیو کۆمەڵگە، ئەمانەش دەبنە هۆی خراپ دابەشبوونی سامان و داهات لە کۆمەڵگە کە بەم جۆرە لە سیاسەتی پەیکەری زۆرترینی دانیشتوان زەرەرمەند دەبن.

- بێکاری: بەرزبوونەوەی ڕێژەی بێکاری یەکێکە لە دەرەنجامەکانی ڕاستەوخۆی جێبەجێکردنی سیاساتی خۆگونجانی پەیکەری، هەڵبەت دامەزراوە جیهانییەکان ئەم دیاردەیە ناشارنەوە، بەڵام پێیانوایە لەگەڵ هەژاریدا لە ماوەیەکی کورتدا نامێنن و جێبەجێکردنی ئەم سیاساتانە دەبنە هۆی فراوانبوونی هەلی کار و کەمکردنەوەی هەژاری.

کاریگەری ئەم سیاسەتانە لەسەر بێکاری بەم شێوانە دەردەکەون، لە ڕێی کەمکردنەوەی خەرجی گشتی کە یەکێکە لە هەرە ئامانجە گرنگەکانی ئەم سیاسەتانە هەوڵی بۆ دەدات، کە ئەمەش دەبێتە هۆی وەستانی دامەزراندن لە کەرتی گشتی یاخود دەستهەڵگرتن لە بەشێک کرێگرتەی سەرکار و دەرکردنیان، هەروەک چۆن کەمکردنەوەی خەرجییە گشتییەکان دەبێتە هۆی وەستانی زۆرێک لە کەرتە گشتییەکان و تەسفیەکردنیان بەم حاڵەتەش دیسانەوە ڕێژەی بێکاری بەرزدەبێتەوە، هەروەها لەکاتی بەتایبەتکردنی کەرتە گشتییەکان دەبێتە هۆی لەدەستدانی زۆرێک بۆ کارەکانیان، ئەمە سەرباری ئەوەی بەرزبوونەوەی نرخی سوو دەبێتە هۆی ئەوەی کەرتی تایبەت دەستی کار کەمبکاتەوە بە هۆی زیادبوونی تێچوونەوە و بە هۆی ئەو کێبەرکێییەی کە لەگەڵ بەرهەمەکانی تر دەیکات لەکاتی هەناردەیی و هەروەها لەگەڵ بەرهەمهێنە ناوخۆییەکان، ناچار بۆ کەمبوونەوەی نرخی تێچوون پەنا دەباتە بەر کەمکردنەوەی دەستی کار و زیاتر پشت بە ڕەگەزی چڕبوونەوە لە سەرمایەدا دەبەستێت(١٧).

ئەمانە هەمووی سەرباری ئەو ڕەنگدانەوە خراپانەی تر کە دەرەنجانی نەهێشتنی پاڵپشتی هەندێ شمەک و کەمکردنەوەی خەرجی لە خزمەتگوزراییە کۆمەڵایەتییەکان بەتایبەت (تەندروستی و فێرکردن)، هەروەها زیادکردنی ڕسوم و باج لەسەر هەندێ خزمەتگوزرای تر و ئازادکردنی نرخەکان، کە دەبنە هۆی دابەزینی ئاستی تەندروستی و فێربوون و هۆشیاری کۆمەڵگە.

# پوختە

پرسی بابەتی دواکەوتوویی گەشەی ئابووری لە جیهانی سێهەم و وڵاتە دواکەوتووەکان، پرسێکی زیندوو و هەستیارە، بەتایبەت ئەم وڵاتانە هەتاوەکو ئێستاش ماندووبوونی سەردەمی داگیرکارییان پێوە دیارە، لەئێستاشدا داگیرکاری نوێ لە ڕێگەی دامەزراوە ئابوورییەکانی و جیهانگیرییەوە ئەم حاڵەتی دواکەوتوویيەی تۆختر کردووەتەوە، بەشێوەیەک نایەکسانییەکی گەورە لە جیهاندا دروستبووە، دابەشبووە بۆ باکوورێکی دەوڵەمەند و خۆشگوزەران و باشوورێکی هەژار و بێ دەرەتان.

ئەوەی ڕوونە مامەڵەکردنی باکووری دەوڵەمەند لەگەڵ حاڵەتی دواکەوتوویی باشوور لە ماوەکانی ڕابردوودا بۆ بە پاشکۆکردن و دەستبەسەرداگرتن بووە، هەرکات قەیرانەکانی سەر باکوور توندبووبێتەوە کاریگەری لە باشووردا زیاتر دەرکەوتووە و ویستوویانە کێشەکانیان لەسەر حسابی باشوور چارەسەر بکەن، ئەوەش ئەم وڵاتانەی دواکەوتوو تر و برسی تر کردووە، جیهانگیری نوێ بە زۆر وڵاتە دواکەوتووەکانی خزاندووەتە نێو سستەمێکی ئابووری جیهانگیرەوە کە ڕۆڵیانی لە بەڕێوەبەردنی قەیرانی ئابووریدا کورتکردووەتەوە.

هەڵبەت نابێت خودی وڵاتانی دواکەوتووش لە بەرپرسیارێتی بەدەر بکرێت لەو حاڵەتی دواکەوتوویی و هەژارییەی کە هەیە، بەهۆی بوونی (دیاردەی گەندەڵی و کێشەی ئینتی و نەبوونی مافەکانی مرۆڤ و نەبوونی دامەزراوەیی لە بەڕێوەبردنی وڵات و خەرجکردنی پارەی وڵات لە بواری سەربازیی و ئەمنیدا، ئەمە سەرباری بوونی کۆمەڵێک سیاسەتی بێ سەروبەری هەڵەی ئابووری)، کە ئەمانە بە تێکڕا هۆکاری سەرەکیش نەبووبێتن بۆ دواکەوتوویی حاڵەتەکەیان بەهێزتر کردووە.

## پەراوێز و سەرچاوەکان


– بۆ کۆی ئەم بابەتە بڕواننە هەردوو کتێبی: اوزوالدو دي ريفيرو: خرافة التنمية الاقتصادية–اقتصاديات مستنفدة في القرن الحادي والعشرين، لبنان: شركة العالمية للكتب،٢٠٠٣. و احمد الكواز: لماذا لم تتحول أغلب البلدان النامية الى بلدان متقدمة تنمويا، الكويت: المعهد العربي للتخطيط، العدد ٤٤، ديسمبر ٢٠١١)

٢. بروانە: زينب حسن عوض الله: الاقتصاد الدولي نظرة عامة على بعض القضايا، دار الجامعة الجديدة للنشر، الاسكندرية، ١٩٩٩.

٣. بڕوانە: محمد فاضل قفطان: التنمية الاقتصادية، مطبعة الحوادث، بغداد: العراق، ١٩٨٤.

٤. بڕوانە: عمرو محي الدين: التنمية والتخلف، دار النهضة العربية، لبنان: بيروت، ١٩٧٢.

٥. سهام الدين خيرى: العولمة الاقتصاديه ومتطلبات التنمية والنهوض فى الدول النامية، كلية البغداد للعلوم الاقتصادية الجامعة، ص٢٩.

٦. عبدالمجيد قدي: المدخل الى الياسات الاقتصادية الكلية، ديوان المطبوعات الجامعية، الجزائر، ٢٠٠٥، ص ٢٧١ ومابعدها.

٧. سعد عبد نجم العبدلي وجليل كامل غيدان: برامج الاصلاخ الاقتصادي والفجوة الغذائية، مجلة الكوت للعلوم الاقتصادية والادارية، المجلد الأول، العدد ٢، جامعة واسط.

٨. برباص الطاهر: أثر تدخل المؤسسات النقدية والمالية الدولية في الاقتصاد –حالة الجزائر، ڕسالة ماجستير، كلية العلوم الاقتصادية، جامعة بسكرة، الجزائر، ٢٠٠٩، ص ١٣٣ وما بعدها.

٩. مەبەست لە وشەی (خۆگونجاندن) لە جێی (چاکسازی) ئابووری بەرکاهاتووە، لە بنەمادا دامەزراوە ئابوورییە جیهانییەکان ویستیان خۆگونجاندی ئابووری وڵاتە دواکەوتووەکان بووە لەگەڵ وڵاتانی خۆیان نەک چاکسازی کردن تێیاندا.

١٠. حنان عبدالخضر هاشم: الإجراءات التطبيقية لبرامج التصحيح الاقتصادي والنعكاساتها على الاقتصاديات النامية، مجلة القادسية للعلوم الإدارية والاقتصادية، مجلد ٨، العدد ٢، ص ١٢٢–١٢٣.

١١. سوزان شادلر: إلى أى مدى نجحت برامج التصحيح التى يساندها صندوق النقد الدولى، مجله التمويل والتنميه، مج٣٣، العدد:٢، واشنطن، ١٩٩٦، ص١٥.

١٢. بشارة الخوري: صندوق النقد والبنك الدوليان التنظيم والية العمل واثر سياستهما الاقتصادية على الدول النامية، مجلة الجيش، العدد:٢٠١، بيروت، مارس ٢٠٠٢، ص٢٣.

١٣. حميد وش علي: الفقر وآليات محاربته، الملتقى الدولي حول الفقر وطرق محاربته، اوكتوبر ٢٠٠١، كلية العلوم الاقتصادية وعلوم التسيير، البليدة، الجزائر، ص٦–٧.

١٤. بوريس بيرنشتن وجيمس بوتون: التصحيح من اجل التنمية: صندق النقد الدولى والفقراء، التمويل والتنمية، مج ٣٢، العدد، ٣، واشنطن، ١٩٩٤، ص٤٣.

١٥. ڕمزي زكي: الليبرالية المستبدة: دراسة في الآثار الاجتماعية والسياسية لسياسات التكيف في الدول النامية، دار سينا، القاهرة، ١٩٩٣، ص٩٩ وما بعدها.

١٦. رمزى زكى: المصدر السابق، ص ١٠٥.

١٧. هبة احمد نصار: بعض الآثار الاجتماعية لرامج الاصلاح الاقتصادي في مصر، دار المستقبل العربي، القاهرة، ١٩٩٤، ص١٠٩.



د. ئیدریس ڕەمەزان کۆچەر

# کاریگەرییەکانی قەیرانی دارایی هاوچەرخ لەسەر ئابووری جیهانی و چارەسەرکردنی به سیستەمی ئابووری ئیسلامی

قەیرانی دارایی لەسەر قەڵای سەرمایەداری سەریهەڵدا وەك پەتایەك خەریکە سەرتاسەری جیهان دەگرێتەوە، ئەم پەتایە لە گواستنەوەکەیدا مەترسیدارە بەهۆی بەپەلە گەیشتنی و بەپەلەتر لە نەخۆشییەکانی کوشندەی وەك کۆلێرا و تاعون و کۆرۆنا. هەرەسهێنانی دامودازگا داراییەکان هەروا کتوپڕ و لە خوتوخۆڕا نییە، بەڵکو هۆکار و پێشینە و ئەگەری جۆراوجۆر لەخۆدەگرێ بەهۆی ئەوەی بازاڕەکانی دارایی جیهان زۆربەیان بەیەکەوە بەستراونەتەوە چ لەڕووی ئابووری یان ڕامیاری بۆیە ئەو کاریگەرییە لەسەر گشت لایەك دەبێ و لەسەر گشتیشیان پێویستە گفتوگۆ و مشووری چارەسەری بخۆن. ئەم قەیرانەش لەکاتێکدا سەریهەڵدا بەگشتی بازاڕەکانی جیهان بەرەو تەنگانە دەڕۆیشتن و هاوکێشەکان بەزەقی سەنگیان دیاردەکەوێ و بەرزبوونەوەی نرخی نەوت بەشێوەیەکی ئەوتۆ بەرزبووە پارەدارانی ئەم نەوت فرۆشتنە وازیان لە پەرەپێدانی پیشەسازی قۆرس هێنا و پشتیان بەست بەپارەی کاش کەوا پێویستی بە ماندوون نەدەکرد، بەم پارەیە بازاڕەکانیان بە سیاسەتی دارایی خۆیان دەبەستەوە. ئێستاش لەکاتی تەنگانەدا پارەکانیان دەکێشنەوە وەك ئەوەی چەند وڵاتێك ئەنجامیدا.

بەهەرحاڵ ئایا ئەم قەیرانە سەرەتای شکستە بۆ سیستەمی سەرمایەداری وەک قەیرانی پەیدابوونی گۆرباتشۆف بۆ یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو کە سەرئەنجام هەرەسهێنانی سیستەمی سۆشیالیستی لێکەوتەوە یان تەنگەژە و گەردەلولێکی کاتیە؟ گرنگترین ئەو هۆکارانەی کەوا بوونەتە هۆی سەرهەڵدانی ئەم قەیرانە داراییە لە چەند خاڵێک دەستنیشان دەکەین، کە ئەوانیش ئەمانەن:

**یەکەم: نەمانی پارەی بەردەست یاخود سیولە لە بازاڕەکانی جیهاندا.**
**دووەم: نەمانی توانای ڕاستکردنەوەی ئەم کەموکوڕیی و گرفتە داراییانە.**
**سێیەم: نەمانی متمانە بە بانکەکان.**

ئەم سێ خاڵە یان گرفتە هۆکاری سەرەکی و گرنگی سەرهەڵدانی ئەم قەیرانە داراییە بوون کەوا سەرجەم جیهانی بگرتەوە، هەر لە ئەمریکا و ئەوروپا و ڕووسیا تەنانەت وڵاتانی عەرەبیش کەوتوونەتە خۆ بۆ چارەسەرکردنی ئەم قەیرانە ئەویش لەڕێگای خۆماڵیکردنی دامەزراوە بانکییەکان یاخود لە ڕێگای دانی پارە بە دامەزراوەکان بۆ گێڕانەوەی متمانە و توانایان بۆ گواستنەوە و پارەی بەردەست بەمەبەستی پەیداکردن و گەڕانەوەی متمانە و بڕوا بەخۆبوون، بەڵام سەبارەت بە متمانە گشت وڵاتانی جیهان لە هەوڵی ئەوەدان کەوا نرخی سوو (سعر الفائدە) کەمبکەنەوە لەپێناو گێڕانەوەی متمانە بۆ وەبەرهێنەرەکان و خاوەن پرۆژە ئابوورییەکان، چونکە بەرزی نرخی سوو ئەوە دەردەخات کەوا سوو خۆی هۆکارە بۆ دروستبوونی ئەم قەیرانە داراییە. جا لێرەدا زۆرێک لە ئابووریناسان پێیانوایە کەوا پێویستە جۆرە تێکەڵەیەک لە فەلسەفەی سەرمایەداری و ئیسلامی جێگەی ئەم فەلسەفە شکستخواردووەی سەرمایەداری بگرێتەوە و هەندێکی تریش بڕوای پتەویان بە فەلسەفەی ئیسلامی هەیە و پێیانوایە کەوا تاکە چارەسەرە بۆ ئەم گرفت و قەیرانانەی کەوا جیهان بەگشتی بەخۆیەوە خەریک کردووە، لەبەوەئەوەی خودی قەیرانەکە بەهۆی نەبوونی دادپەروەریی و نرخی سوو و جامبازی دروستبووە و هەروەک دەزانرێت کەوا ئەمانەش لە سیستەمی ئابووری ئیسلامیدا ڕێگە پێدراون نین.

ئەنجامەکانی قەیرانی دارایی جیهانی بەپێی هەر تێروانین و بیروبۆچوونێک بێت ئەنجامی کارەساتین بۆ هەر وڵات و کۆمپانیا گەورە و بچووک و بۆرسەکانی جیهانی و ناوخۆیی و وەبەرهێنەرە بچووک و فەرمانبەر و خانەنشینەکان، گومانی تێدا نییە کە ئەم قەیرانە قەیرانێکە دەگۆڕێت بۆ ناکۆکییەک بەپێی هەموو پێوەری بەڕێوەبردنێکی قەیران و سەرۆکایەتیکردنی ناکۆکییەکە لەناو خودی خۆیی و خەسڵەت و گۆڕان و بەهاکەیدا. بۆیە قەیرانەکە سیستەمێکی دارایی جیهانی ئاشکرا کرد کە بۆ نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو چاکە و ناتوانێت لەگەڵ بارودوخ و پەرەسەندنەکانی جیهانی سەدەی بیست یەک بڕوات.

ئەم قەیرانە ئاشکرای کرد کە جیهانگیری و کۆمپانیا و بانک و سندوقە گەورەکان و گۆڕانەکانی پیشەسازیی و چالاکییە ئابوورییەکان و هەروەها بەرهەمی گەورە و هەتاکو بازرگانی و وەبەرهێنانیش زۆر ناسک و سستن.

گومانی تێدا نییە کە زەرەمەندی هەرە گەورە لەم قەیرانەدا مرۆڤە، جا هەر مرۆڤێک بێت، پاشان ژینگە و داهاتووی دەرامەتی مرۆییە و ئەوەی کە لەگەڵ خۆی دەیهێنێت لە گۆڕانکارییەکان لە بەهایی کۆمەڵایەتی.

ئەوەی لە هەواڵەکان گوێبیستی دەبین ئاشکرایە بۆ هەمووان کە قەیرانی دارایی وەک بەشێک لە قەیرانی ئابووری لەماوەی نەوەت ڕۆژدا پێی ناکرێت ڕەفتارێکی ئابووری تەمەن سەد ساڵ بگۆڕێت. هەموو ئەمانە لەکۆتاییەکەیدا بەرەو ئەوەمان دەبات کەوا ئەم قەیرانە داراییە باڵی کێشاوە بەسەر جیهاندا و قەیرانی داهاتووە پێش ئەوەی قەیرانی ئێستا بێت هەموو لایەنە داراییە نێودەوڵەتییەکانی وەک سندوقی نەختینەیی و بانکی نێودەوڵەتیی و ڕێکخراوی بازرگانی جیهانیی و کۆربەندەکانی وەک داڤۆس و کۆمەڵەی هەشت وڵاتە گەورەکە نەیانتوانیوە کارێک بکەن بە هەموو پلان و ستراتیژییەتەکانیان بۆ قەیرانێک کە بە کۆمپانیاکانی فرۆشتنەوە دەستەبەرییەکان دەستییێکرد، ئەم قەیرانەش لە قەیراندا ناکۆکی لە ناکۆکیدا دروست دەکات. هەر بەهۆی کاریگەری ئەو بێبازاڕییەی کەوا لەم قەیرانە داراییەدا دروستبوو زۆرێک لە کۆمپانیا و دامەزراوەکانی دارایی و نەختینەیی تووشی زەرەر و نابووت بوون هاتن، لە ئەنجامیشدا کۆمەڵێکی زۆری کرێکار و فەرمانبەران کارەکانیان لەدەستدا. هەروەک چۆن نووسینگەی کاری نێودەوڵەتی ئاماژە بە لەکار لەدەستدانی سەدان هەزار کەس دەدات بەهۆی قەیرانی دارایی و پەتای کۆرۆناوە. هەروەها لەگەڵ کەمبوونەوەی بڕی هاوردە و هەناردەکانی جیهان نرخی زۆرێک لە کاڵا و کەلوپەلەکان تووشی دابەزین هاتوون و بەوهۆیەشەوە کۆمەڵێک وڵات تووشی زەرەر هاتوون و کاریگەری خراپی کردۆتە سەر ئاستی داهاتی ئەو وڵاتانە. لەگەڵ ئەمەشدا هەروەک ڕێکخراوی کشتوکاڵ و خۆراکی جیهانی ئاماژەی بۆ دەکات بەهۆی بەرزبوونەوەی نرخی خۆراک بە شێوەیەکی گشتی (کە یەکێک لە هۆکارەکانی، کەمبوونەوەی بەرهەمهێنان و خستنەڕووەکەیەتی بەهۆی کاریگەری قەیرانی دارایی جیهانی و پەتای کۆرۆنای و کەمبوونەوەی ڕادەی خواست و کڕین لە پێشتردا).

لەبارەی عێراق و هەرێمی کوردستانیشەوە هیچ ئامار و داتایەکی نوێ لەبەردەستدا نییە کە ئاماژە بەڕادە و ڕێژەی هەژاری و گۆڕانی بکات. نوێترین ئامار لەبارەی ڕادە و بڕی هەژاری لە عێراقدا ئەوە بوو کە لە ساڵی ڕابردوودا بڵاوکرایەوە لەلایەن لیژنەی نیشتمانی باڵا بۆ سیاسەتەکانی کەمکردنەوەی هەژاریی و ڕەخساندنی دەرفەتی کار و تۆڕەکانی دڵنیایی و پاراستنی کۆمەڵایەتی لە عێراقی فیدڕاڵ پێی هەستا، بەڵام پشتیان

به ئامار و داتاکانی ساڵانی ڕابردوو بەستبوو بەهاوکاری دەزگای ناوەندی ئامار و تەکنەلۆژیای زانستی عێراق و دەستەی ئاماری هەرێم و بە پشتیوانی بانکی نێودەوڵەتی کۆکرابوونەوە. لەو ئامارەدا ڕێژەی هەژاری لە عێراقدا بە (٣١,٧٪) و لە هەرێمی کوردستانیش بە (١٥,٠٪) پێوراوە. لەگەڵ ئەوەشدا لە ئاکامی ئەو تەنگژە داراییەی جیهان ڕادەی داهاتەکانی عێراق و هەرێمی کوردستانیش کەمبووەتەوە بەهۆی دابەزینی نرخی نەوت لە بازاڕەکانی جیهاندا لە ماوەی ڕابردوودا، کە بێشک ڕەنگدەداتەوە بەسەر ئاستی داهات و خەرجییەکانی گشتی و هاوڵاتیان لە وڵاتەکەماندا، پاشانیش ئەگەر لە دەستپێکی سەرهەڵدانی ئەم دیاردەیەدا شوێنەواری بەسەر هەرێمی کوردستان و عێراقدا دەرنەکەوتبێت ئەوا بەهۆی دابڕاوی ڕێژەیی ئابووری هەرێمی کوردستان لەڕووی دارایی و بانکییەوە بە ئابووری جیهانەوە بووە، بەڵام ئەمڕۆ هەست بەوە دەکرێت کە جۆرە کزییەک هەیە لە بازاڕەکانی عێراق و کوردستاندا.

> **بەپێی ئامارەکان یارمەتییە داراییەکانی وڵاتانی کۆمەکبەخش لە یەك ملیار دۆلار تێناپەڕن، بەڵام بۆ چارەسەرکردنی قەیرانی دارایی بە سەدان ملیار دۆلار خراوەتە ناو بازاڕ و بۆرسەکانیان.**

جگەلەوەی کە ڕادە و ڕێژەی هەژاری زیاد دەکات بەهۆی کاریگەریی و شوێنەوارەکانی تەنگژەی داراییەوە لەهەمانکاتیشدا هەوڵ و کۆششەکانی نێودەوڵەتی کەمدەکاتەوە لە بەخشینی دەرامەتی دارایی پێویست بەو وڵاتانەی کە هەژارن و ڕێگریشە لە بەردەم پێکانی ئامانجەکانی هەزارەی نوێ (کەمکردنەوە مردووان بەتایبەتی مناڵ و ساوایان و دابینکردنی فێربوون و خۆراکی چاک و خزمەتگوزارییەکانی تەندروستی و زاڵبوون بەسەر برسێتیدا و کەمکردنەوەی کاریگەرییەکانی گۆڕانکاری ئاووهەوا هەندێک لەو ئامانجانەن). هەروەک نەتەوە یەکگرتووەکان ئاماژەی پێدەکات پێداویستییەکانی وڵاتانی تازەپێگەیشتوو بە ٢٧٠ ملیار دۆلار مەزندە دەکرێت بە هاتنی ساڵی ٢٠٣٠ بۆ پێکانی ئەم ئامانجانە. هەربۆیە داوا لە وڵاتانی کۆمەکبەخش دەکات کە یارمەتی و کۆمەکە ماددیی و داراییەکانیان کەمنەکەوە بەهۆی ئەو تەنگژەیەوە. بەپێی ئامارەکان یارمەتییە داراییەکانی وڵاتانی کۆمەکبەخش لە یەک ملیار دۆلار تێناپەڕن، بەڵام بۆ چارەسەرکردنی قەیرانی دارایی بە سەدان ملیار دۆلار خراوەتە ناو بازاڕ و بۆرسەکانیان ئەوەش تەنها لە

بەرژەوەندی کەمینەیەکی بازرگان و جامبازاندایە، بۆیە شارەزایان و پسپۆڕانی ئابووری پێیانوایە گەر بێتوو وڵاتانی سەرمایەداری دەوڵەمەند لەبری ئەوە پارە و داراییەکی زۆر ببەخشنە وڵاتانی پێویست بە کۆمەکی خۆراک و دارایی بەتایبەتی وڵاتانی ئەفریقایی ئەوا دەبێتە هۆکار و دەروازەیەک بۆ نەهێشتنی بێبازاڕی ئابووری جیهان و چارەسەرکردنی تەنگژەی دارایی. لەکۆتاییدا ئامارەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەمڕۆ زیاتر لە ١١٥ ملیۆن کەس لە جیهاندا لەژێر هێڵی هەژاریدا دەژین و(٢٣ ٪) کەسانی جیهان لەوانە بە کەمتر لە ٣-٢ دۆلار  دەژین لە ڕۆژێکدا و(٧٣٤) ملیۆن کەسی دیکەش بە کەمتر لە دوو دۆلار ڕۆژانە دەژین کە ئەمانە پێوەر و نیشاندەری بەکارهێنراون لەلایەن بانکی نێودەوڵەتییەوە.

هەڵبەت نەبوونی هاوسەنگییەکی گونجاو لە ئاست و داهات و پەرەسەندنی ئابووریی وڵاتانی جیهان و فراوانی کەلێنی نێوان وڵاتانی دەوڵەمەند و هەژار لەم جیهانەدا هۆکارێکە بۆ زیاتر توندبوونی بێبازاڕی ئابووری جیهان بەتایبەتی لەکاتی ڕوودانی تەنگژە و قەیرانە داراییەکاندا. پاشانیش باوسەندنی سیستەمێکی ئابووریی سەربەست پشتبەستوو بە قەرز بڕواپێدان و گەرموگوڕتربوونی بازاڕ و لایەنەکانی دارایی و نەختینەیی لەسەر حسابی پاشەکشەکردنی لایەنی ماددی ئابووریی جیهان بەرەو تەنگژە و قەیرانی لەمجۆرە دەبات. بۆیە هەوڵدان بۆ هێنانەکایەی هاوسەنگییەکی ڕێژەیی لە نێوان ئابووری وڵاتە جیاجیاکانی جیهان و  زیاتر بوژاندنەوەی ئابووری وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان بەگشتی و یارمەتیدانی وڵاتە هەژارەکان و بونیاتنانی ئابوورییەکانیان لە ڕێی پێبەخشینی کۆمەکە ماددیی و داراییەکان لەلایەن نەتەوەیەکگرتووەکان و وڵاتانی دەوڵەمەند و پیشەسازی زلهێز و گەڕانەوە بۆ پەرەپێدانی لایەنی ماددیی و دوورخستنەوەیەکی ڕێژەیی لە ئابووریی بڕواپێدانی ڕادەبەر و نەختینەیی و دارایی، توانا دارایی و ماددییەکانی وڵاتانی جیهان بە ئاستێکی تاڕادەیەک دادوەرانە زیاد دەبێت و گرفتە جۆراوجۆرەکانی ئابووریی وەک هەژاریی و بێکاری  کەمدەبنەوە و خواستی جیهانیش لەسەر بەرهەم و کاڵا جۆراوجۆرەکان زیاتر دەبێت بەتایبەتی ئەگەر پەیوەندییەکی بەهێز و پتەو و ئابووریی وڵاتە جیاجیاکانی جیهان پێکەوەببەستێتەوە و ئابووریی جیهانیش لە قەیرانی لەمجۆرە دەپارێزێت یا ئەگەر ڕووبەڕووشیان بوویەوە بەلای کەمەوە لە ماوەیەکی کورتدا لێی ڕزگار دەبێت.

لەکوتاییدا کاتێک لە سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم سیستەمی بانکی سووخۆر دروستبوو لە جیهانی ڕۆژئاوادا ئەوان تانە و تەشەریان لە سیستەم و وڵاتانی ئیسلامی دەدا و دەیانگووت، چونکە بانکی سووخۆر یاخود قەرزی سووددارتان نییە بۆیە ئێوە پاشکەوتوون، بەڵام دوای سەد ساڵ بەتایبەتی پاش ڕوودانی ئەم قەیرانە داراییەی دوایی وڵاتانی ڕۆژاوا و سیستەمی سەرمایەداری گەیشتوونەتە ئەو ڕاستییە کە پێویستە سوود

لە سیستەمی ئابووریی ئیسلامی وەربگرێت هەروەک وەزیری دارایی ئەو کاتی فەڕەنسا ئەوەی ڕاگەیاند کەوا پێویستە سیستەمی ئابووریی ئیسلامی جێبەجێ بکەین بۆئەوەی خۆمان لەو قەیرانە داراییە ڕزگار بکەین. ئەمەش لە ئەنجامی ئەوەوە هاتووە کە لەگەڵ ڕوودانی ئەو قەیرانەدا وێڕای زەرەرمەندبوونی زۆرێک لە بانکەکانی سووخۆری وڵاتانی سەرمایەداریی، بانکەکانی ئیسلامی لەندەن و وڵاتانی کەنداو و سودان و پاکستان و مالیزیا و تەنانەت ئێراقیش بەدەربوون لە زەرەر و زیانەکانی ئەو قەیرانە.

بانکەکانی ئیسلامی لەسەر شێوەی چەندین جۆری جیاجیا هەن هەروەک لە پەرتووکە شەرعییەکاندا هاتووە لەوانە: هاوبەشایەتی سەرمایە (مایە)، هاوبەشایەتی بریکاریی (نیوە بە نیوە)، هاوبەشایەتی شوێنگای کۆمەڵایەتی، هاوبەشایەتی بەرجەستە، هاوبەشایەتی چاندن و ئاودان و هاوبەشایەتی جامبازیی کە گرنترین جۆرییانە کە بریتییە لە کارکردنی دوولایەنە و تێیدا لایەنی یەکەم کە بانکە سەرمایە(مایە) پێشکەش دەکات و لایەنی دووەم کەسێکی دیاریکراوە جامبازە هەڵدەستێت بە بەگەڕخستنی ئەو سەرمایە بەکار و ماندووبوونی خۆی و هەردووکیشیان لە قازانج و زەرەردا هاوبەشن بەپێی پشکی هەریەکێکیان. کاتێک پڕۆژەکەیان تووشی زەرەر دێت ئەوا بانک سەرمایەکەی تووشی لەدەست دەدات و جامبازیش ئەوەی سەرمایەکە دەخاتەگەڕ کارەکەی زەرەر دەکات. بەڵام لە قازانجدا هەردووکیان هاوبەشن بەپێی پشکی خۆیان لە پڕۆژەدا. ئەمجۆرە هاوبەشایەتییە سەرکەوتنی بەرچاوی بەدەستهێناوە لە زۆر وڵاتدا لە بواری وەبەرهێناندا.

ئێمە لێرە دەقێکمان هەیە کە خوای گەورە لە ئایەتێکی پیرۆزدا دەفەرمووێت:» الذین یستمعون القول فیتبعون احسنهم»، بۆیە دەکرێت ئابوورییەکەمان پێشبخەین بەسوودوەرگرتن لەلایەنە باشەکانی هەموو سیستەم و فیکرەیەکی ئابووریی جیهان بەمەرجێک لەچوارچێوەی شەریعەتی ئیسلامدا ڕێی پێدرا بێت. لەبەرئەوەی ئەمڕۆ هەموو جیهان تەنانەت وڵاتانی ئەوروپا و ڕۆژئاواش درکیان بەوە کردووە کە بۆ چارەسەرکردنی گرفتە ئابوورییەکانیان دەکرێت سوود لە سیستەمی ئابووریی ئیسلامی وەربگیرێت، بۆیە باشتروایە ئێمەش لای خۆمان گرنگی و بایەخی زیاتر بەم بوارە بدەین هەموو هەوڵ و ئاسانکارییەک بکرێت بۆ هاتنەکایەی ئەو سیستەمە و دەرفەتی کردنەوەی بانکی ئیسلامی کارا و جۆراوجۆر، بە مۆڵەتپێدان و فەراهەمکردنی سەرمایەی پێویست بۆ ئەو بانکانە بۆئەوەی سوود وەربگرین لەو سیستەمە شاردراوەی ئابووری.



**پ.ی.د. ئەیوب سماقەیی**
بەشی ئابووری کۆلێژی بەڕێوەبردن و
ئابووری، زانکۆی سەلاحەددین

# میکانیزمی بەراوردکردنی سیستەمە ئابوورییەکان

لەم نووسینە هەوڵدەدەین سیستەمە ئابوورییەکان بەشێوەی هێڵکاریی و وێنە بخەینە ڕوو، بۆ بەرچاو ڕوونی و ناسینی باشترین سیستەم، لەبەرئەوەی وێنە خێراتر دەچێتە زەین و بیری مرۆڤ، بەتایبەتیش لە ڕۆژگاری ئەمڕۆ مرۆڤەکان سەرقاڵی هۆکارە تەکنۆلۆژییەکانن، و ناتوانن سەدان لاپەڕە بخوێننەوە لەسەر هەر سیستەمێك، لەلایەکی دیکەش هەرێمی کوردستان هیچ فەلسەفەیەك و سیستەمێکی ئابووری دیاریکراو پەیڕەو ناکات، لە یەك کاتدا هەموو سیستەمەکان هەن لەیەك کاتیشدا هیچ سیستەم و فەلسەفەیەك بوونی نییە. لەبەرئەوە بنیاتنانی ئابوورییەکی پتەو پێویستی بە فەلسەفەیەك و سیستەمێکی پتەو هەیە.

سیستەمی ئابووری: بریتییە لە کۆمەڵێک یاسا و ڕێسا و نەریت و بنەما کە حکوم دەکەن لەسەر ئابووری نەتەوەیی، لە ڕێگەی ئەم یاسا و ڕێسایانە دەرامەتەکان بەکاردەبرێت بۆ تێرکردنی پێداویستەکانی مرۆڤایەتی، ئامانجی هەر سیستەمێکی ئابووری دیاریکردنی جۆر و بڕی ئەو کاڵا و خزمەتگوزارییانەیە کە پێویستە بەرهەمبهێنرێن، هەروەها دیاریکردنی ڕێگەی بەرهەمهێنان و چۆنێتیدابەشکردنی ئەم بەرهەمە. ئابووری هەر کۆمەڵگەیەک سنووردارە بەو دەرامەت و ئەو زانیارییانەی کە لەسەر تەکنەلۆژیا هەیەتی، لەبەرئەوە لەسەر هەموو کۆمەڵگەیەک پێویستە لە نێوان دروستکردنی ڕێگە و کڕینی چەک یەکێک هەڵبژێری و لە نێوان خوێندن و خواردن یەکێک هەڵبیژێرێ، لە نێوان تەندروستی و ئاهەنگ گێڕان یەکێک هەڵبژێرێت، لە نێوان چاکردنەوەی بەنداوی سماقوڵی و هێنانی گۆرانیبێژی ئەلبانی ئینسا یەکێک هەڵبژێرێت، کەواتە هەر کۆمەڵگەیەک ڕێگەیەکی هەیە بۆ بڕیاردان لەسەر ئەوەی ئایا چ کاڵایەک بەرهەم بهێنێت؟ چۆن بەرهەمی بهێنێت؟ بۆ کوێ بەرهەمی بهێنێت؟ ئەم سێ پرسیارە سەرەکییە بۆ هەر سستەمێکی ئابووری چ و چۆن و بۆ کوێ لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا گرنگی زۆری پێدەدرێت، دەکرێت بەم شێوەیە ڕوونی بکەینەوە:

١- چ کاڵایەک پێویستە بەرهەمبهێنرێت و چەند بەرهەمبهێنرێت؟ لەسەر کۆمەڵگە پێویستە بڕیار بدات چەند بەرهەمبهێنێت لەهەر جۆرێکی کاڵا و خزمەتگوزاری کە دەتوانرێت بەرهەمبهێنرێت، ئایا ئەمڕۆ کورد ئاوی کانزایی بەرهەمبهێنێت یاخود قوماش؟ ئایا ژمارەیەکی کەم کراس جۆری باش بەرهەمبهێنین یان ژمارەیەکی زۆر لە کراسی هەرزان؟ ئایا دەرامەتە کەمەکانمان بەکاربخەین بۆ بەرهەمهێنانی کۆکا کۆلا؟ یان کەمترین کاڵای بەکارهێنان زۆرترین کاڵای وەبەرهێنان بەرهەمبهێنین وەک ئامێری بەرهەمهێنانی کۆکاکۆلا لەپێناو زیادکردنی بەرهەم و بەکارهێنان لە دوارۆژدا؟

٢-چۆن کاڵا بەرهەمبهێنین؟ پێویستە کۆمەڵگە بڕیار بدات کێ هەڵبستێت بە بەرهەمهێنان و بە چ دەرامەتێک، چ تەکنەلۆژیایەکی بەرهەمهێنان بەکاربهێنرێت لە بەرهەمهێناندا، کێ کشتوکاڵ بکات و کێ بخوێنێت؟ ئایا کارەبا لە نەوت دروست بکەین، یان لە خەڵووز یان لە وزەی خۆر یان لە گازی سروشتی یان لە گازوایل و پێکردنی مولیدەی گەڕەکەکان.

٣- بۆ کوێ بەرهەم بهێنرێت؟ ئەرکی سەرەکی هەر کۆمەڵگەیەک بڕیاردانە لەسەر ئەوەی کێ بەروبوومی کۆششی ئابووری بخوات، چۆنێتی دابەشکردنی بەرهەمی نەتەوەیی لەسەر خانەوادەکاندا؟ ئایا هەژار زۆر و دەوڵەمەند کەم؟ ئایا دەستهاتە زۆرەکان دەدرێتە ئەندام پەرلەمان و وەزیرەکان یان کرێکار و خاوەن زەوییەکان؟ ئایا نەخۆش و تەمەن گەورەکان شوێنی ژیان و خواردنیان باشە یان وازیان لێ دەهێنین و خۆیان چارەسەری خۆیان بکەن. هەر سیستەمێکی ئابووری وەڵامی هەرسێ پرسیارەکە دەداتەوە هەریەک بەڕێگەیەکی تایبەت بەخۆی، بەم شێوەیەی خوارەوە:

**١ . ئابووری بازاڕ Market Economy:**

له وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و زۆربەی وڵاتانی دیموکراتی، زۆربەی بابەت و گرفته ئابوورییەکان له ڕێگەی بازاڕەوه چارەسەر دەکرێت، تاک و پرۆژەکانی تایبەت هەڵدەستن به بڕیاره سەرەکییەکانی تایبەت به بەرهەم و بەکارهێنان و سیستەمی نرخ و بازاڕ و قازانج و زیان و هاندان و پاداشت، کەواته بڕیاردان لەسەر چ و چۆن و بۆکوێ بەم شێوەیە:

- پرۆژەکان کاڵا بەرهەمدەهێنن که زۆرترین قازانج بدات، واتا بڕیاردان لەسەر ئەوەی چ کاڵایەک بەرهەمبهێنن.

- بەگەڕخستنی ئەو تەکنەلۆژیانەی بەرهەمهێنان، که کەمترین تێچوونیان هەبێت مانایی وایه بڕیاردرا لەسەر چۆنێتی بەرهەمهێنان.

- بەکارهێنان بڕیارەکانی تاک دیاری دەکات دەربارەی چۆنێتی خەرجکردنی کرێکانیان و داهاتی موڵکەکانیان وەبەرهێنانی موڵکەکانیان، واته بڕیاردان لەسەرئەوەی بۆ کوێ بەرهەمبهێنرێت و چۆن دابەشبکرێت. بەڵام لەکاتێکدا دەوڵەت هیچ ڕۆڵێکی ئابووری نەبێ و ئازادییەکی ڕەها هەبێت پێی دەگوترێت laissez – Economy ئابووری ئازاد. هەر سیستەمێک تێڕوانین و هۆکاری جیاوازی هەیە بۆ چۆنێتی وەڵامدانەوەی پرسیاره ئابوورییەکان، لەهەمانکاتیشدا میکانیزمی تایبەت بەخۆی هەیە، ئامانجی دیاریکراوی خۆشی هەیە، بۆ نموونه سیستەمی سەرمایەداری پێیوایه گرفتی ئابووری کاتێک دروست دەبێت که پێداویستییەکانی مرۆڤ بێسنوورن un limited و دەرامەتەکانیش دەگمەنن Limited Resources، لێرەدا ئەم سیستەمه دەستەبەری ئازادی تاکەکەسی دەکات، له بەرانبەر نەهێشتنی یەکسانی، له ڕێگەی دابینکردنی بەرهەمی پێویست، بەپێی میکانیزمی بازاڕMarket mechanism که خراپ دابەشکردنی لێدەکەوێتەوە، هەوڵدەدات زۆرترین تێرکردنی ماددی بۆ ئەوانەی توانای کڕینیان هەیه دابین بکات، هەوڵدەدات سامانی نەتەوەیی زیاد بکات ،دەکرێت لەم شێوەیەی خوارەوه زیاتر بەرجەستەی بکەین.



## ٢- ئابووری ئاڕاستەکراو :Command Economy

لەم سیستەمەدا حکومەت هەموو بڕیارەکان خۆی دەیدات دەربارەی بەرهەمهێنان و دابەشکردنی، ئەم جۆرە سیستەمە لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران پەیڕەو دەکرا، حکومەت خاوەنی هەرە زۆری هۆکارەکانی بەرهەمهێنانە (زەوی، سەرمایە)، هەروەها ئاڕاستەکردنی هەڵسوکەوتی دامەزراوەکانی لە زۆربەی دامەزراوەکانی بەرهەمهێنانی بەدەستە، دەوڵەت خۆی کرێکار دادەمەزرێنێت و پێشیان دەڵێت چۆن کاربکەن، بڕیار لەسەر چۆنێتی دابەشکردنی بەرهەمی نەتەوەیی دەدات لەسەر کاڵا و خزمەتگوزاری جۆربەجۆرەکان. بەکورتی لەم سیستەمەدا حکومەت وەڵامی هەموو پرسیارە ئابوورییە سەرەکییەکان دەداتەوە لە ڕێگەی خاوەندارێتی کردنی دەرامەتەکان و توانایی لە سەپاندنی بڕیارەکانی، دەکرێت لەم شێوەیەی خوارەوە زیاتر بەرجەستەی بکەین.



شێوەی ژمارە (٢)
سیستەمی ئابووری ئاراستەکراو

## ٣. ئابووری تێکەڵ :Mixed Economies

هیچ کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو بەتەواوی ناکەوێتە خانەی جۆری یەکەم ئابووری بازاڕ Market Economy و جۆری دووەم ئابووری ئاڕاستەکراو Command Economy، بەڵکو زۆربەی ئابووری جیهان لە جۆری ئابووری تێکەڵە، پێکهاتووە لە ئابووری بازاڕ و ئابووری ئاڕاستەکراو، هیچ وڵاتێک نییە ئابووری بازاڕ لەسەداسەد پەیڕەو بکات، لەگەڵ ئەوەی کە بەریتانیا لە سەدەی نۆزدەیەم نزیک بووە لەم جۆرە سیستەمە، ئەمڕۆ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بازاڕ زۆربەی بڕیارەکان دروست دەکات، بەڵام حکومەت ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە ڕاستکردنەوەی کاری بازاڕ، حکومەت یاسا و ڕێنمایی دەردەکات بۆ ڕێکخستنی ژیانی ئابووری، هەڵدەستێ بە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری خوێندن و تەندروستی و ئاسایش و ڕێگرتن لە پیس بوونی ژینگە و ڕێخستنی پاراستنی ژینگە و بەردەوامبوونی پەرەپێدانی ئابووری. دەکرێت لەم شێوەیەی خوارەوە زیاتر بەرجەستەی بکەین.

٤- سیستەمی ئابووری ئیسلامی: هەر سیستەمێک تێڕوانین و هۆکاری جیاوازی هەیە بۆ چۆنێتی وەڵامدانەوەی پرسیارە ئابوورییەکان، لەهەمانکاتیشدا میکانیزمی تایبەت

بەخۆی هەیە، ئامانجی دیاریکراوی خۆشی هەیە، بۆ نموونە سیستەمی ئابووری ئیسلامی پێیوایە گرفتی ئابووری کاتێک دروست دەبێت کە پێداویستییەکانی مرۆڤ جۆراوجۆرن و زۆرن، بەڵام بێسنوور نین و دەرامەتی پێویست هەیە، لێرەدا ئەم سیستەمە دەستەبەری ئازادی تاکەکەسی دەکات، لە بەرانبەر دەستەبەری یەکسانی، لە ڕێگەی دابینکردنی بەرهەمی پێویست، بەپێی شەریعەت و سوننەتی پێغەمبەری ئیسلام کە دادپەروەری دابەشکردنی لێدەکەوێتەوە، هەوڵدەدات بۆ دەوڵەمەندکردنی مرۆڤ لەڕووی ماددیی و ڕۆحی، هەوڵدەدات مرۆڤ بکات بەشایستەی جێنشینی خودا لەسەر زەوی، دەکرێت لەم شێوەیەی خوارەوە زیاتر بەرجەستەی بکەین.

## سیستەمی ئابووری ئیسلامی

لەکۆتاییدا سیستەمی ئابووری تێکەڵ و سیستەمی ئابووری ئیسلامی دەکرێت سیستەمێکی تێکەڵ لەم دوو سیتەمە دروستبکرێت و بگونجێنرێت بۆ هەرێمی کوردستان، لەم قۆناغەی ئێستادا، لەبەر بوونی خاڵی بەهێزی هاوبەش لەو دوو سیستەمە.



شێوەی ژمارە (٣)
سیستەمی ئابووری تێکەڵ



شێوەی(٤)
سیستەمی ئابووری ئیسلامی



# (ئابووری) بیبلیۆگرافیا و پێڕستی لە پڕۆژەی

## کورد و کوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێڕستیان لە کتێبی کوردیدا ١٩٢٠- ٢٠١٠

**ئامادەکردن: بوار نوورەدین**

ئەم بیبلیۆگرافیا تایبەتییە، تەنها کەڵکی لە پڕۆژەی (کورد و کوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێڕستیان لە کتێبی کوردیدا ١٩٢٠- ٢٠١٠) وەرگرتووە، کە ٥٦٨٠ کتێبی تێدا ناسێنراوە و لە ٥٢٠٦ لاپەڕە پێکهاتووە و بەسەر ١٢ بەرگ و بەشدا دابەشکراون، تایبەتکراوە بەو کتێبانەی لە نێوان ساڵانی ١٩٢٠- ٢٠١٠دا، لەبارەی «کورد و کوردستان»ەوە نووسراون، کتێبی نووسراوی بە هیچ زمانێکی تر لەخۆنەگرتووە. پڕۆژەی ناوبراو ساڵی ٢٠١٦ لە شاری تارانی وڵاتی ئێران چاپکراوە.

ئەم بیبلیۆگرافیایە تایبەتییە دوو تەوەرەی سەرەکییە، یەکەمیان ٤٢ کتێبە کە لە نێوان ساڵانی ١٩٧٣- ٢٠١٠دا، بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەبارەی (ئابووری)یەوە نووسراون، یان لە ناونیشاندا وشەی (ئابووری)یان بەکارهێناوە. تەوەرەی دووەمیش ٢٣٥ کتێبی ساڵانی ١٩٥٨- ٢٠١٠یە، کە لە ناوەڕۆکدا، لێکۆڵینەوە، یان بابەتیان لەبارەی ئابوورییەوە نووسیوە و کراوە بە سێ بەشەوە: کتێبی ساڵانی ١٩٥٨- ٢٠٠١، ٢٠٠٢- ٢٠٠٦ و ٢٠٠٧- ٢٠١٠.

تەنها بۆ وشەی (ئابووری) گەڕاوین، چونکە بیبلیۆگرافیاکە فراوانە، ئەگەرنا کتێبی تریش لەبارەی بابەتی تری پەیوەست بە ئابووری نووسراون، کە لە ئێستادا وازمان لێ هێناون، وەکوو: نەفت، نەوت، دارایی، بازرگانی، بەرهەم ...تاد، ئەگەر گۆڤارەکە پێی باش بوو، لە دەرفەتێکی دیکەدا کاری لەسەر دەکەینەوە. لەم بیبلیۆگرافیایەدا، هەروەک تەواوی پرۆژەکە، کتێبەکان بەپێی ساڵ و لە هەر ساڵێکیشدا، بەپێی «تیپ»ەکانی زمانی کوردی ڕیزکراون، ناونیشانی کتێبەکانیش، وەک خۆیان نووسراونەتەوە.

**کورتکراوەکان:**

پ.: پێوانە (بە سانتیمەتر و «پانی»ی پێش «درێژی»ی نووسراوە)

چاپ.: نۆبەتی چاپ

چ.: چاپخانە

ژ.: ژمارە

ژ.س.: ژمارەی سپاردن

ز.: زانکۆ

س.: ساڵ

ش.: شوێن

کۆڕ.: چاپخانەی کۆڕی زانیاریی کورد

ل.: لاپەڕە

و.: وەزارەت

ی.ن.ک.: یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

؟ : بۆ هەر زانیارییەکی نەزانراو و نادیار دانراوە

ISBN: International Standard Book Number ژمارەی جێگیری نێودەوڵەتیی کتێب.

## تەوەرەی یەکەم: کتێبی سەربەخۆ ١٩٧٣- ٢٠١٠ (بیبلیۆگرافیای کتێب)

**١- کوردستان و کورد- لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی و ئابووری**

نووسین: د.عەبدولڕەحمان قاسملوو

وەرگێڕانی لە ؟: عەبدوڵڵا حەسەن زادە

بڵاوکراوەی بنکەی پێشەوا

چاپ.: یەکەم، چ.: ؟، ش.: ؟، ژ.س.: ؟، س.: ١٩٧٣، ل.:٣٨٨، پ.:١٧×٢٤

ناوەڕۆک:

پێشەکی بۆ چاپی کوردی/ پێشەکیی چاپی ئینگلیزی/ فەسڵی یەکەم: کوردستان و نەتەوەی کورد/ کورتەیەک لە جوگرافیا/ دانیشتوان/ ئایین/ زمان و ئەدەب/ خوێندن/ لەشساغی/ فەسڵی دووەم: ئاوڕێک بۆ سەر مێژوو/ ڕەسەنی کورد/ کورد لە ڕۆژگاری کۆندا/ کورد لە سەدەکانی ناوەڕاستدا/ کورد لە ڕۆژگاری کۆندا/ خزینی دەوڵەتە ئمپریالیستەکان بۆ ناو کوردستان/ کوردستان پاش شۆڕشی مەزنی سوسیالیستی ئۆکتۆبەر/ فەسڵی سێیەم: دابەشکردنی کوردستان/ کورد لە تورکیا/ کورد لە عێراق/ کورد لە ئێران/ هۆی ڕاپەڕینەکانی کورد و ئامانجەکانیان/ کۆماری مەهاباد/ کورد لە سووریا/ کورد لە یەکێتیی سۆڤیێتی/ فەسڵی چوارەم: ئاوڕێکی گشتی بۆ سەر ئابووریی کوردستان/ چەند دیمەنێکی گشتی باری ئابووری/ هێندێ زانراو لە کوردستانی ئێران/ پایەی بەرهەمی کشتوکاڵ/ ئاودێری/ فەسڵی پێنجەم: ئاوڕێکی گشتی بۆ سەر مێژووی کۆمەڵی کوردەواری/ پەرەئەستاندنی مێژووی ملکداری/ کوردستان وەک بەشێک لە بازاڕی جیهانی/ پێگەیشتنی عەشیرەتە کوردەکان/ گۆڕانی تەرکیبی ئابووری/ فەسڵی شەشەم: شێوەکانی ملکداری زەوی/ ملکی خاوەن ملکەکان/ ملکەکانی دەوڵەت (خالیسە)/ ملکەکانی پادشا/ زەوییە مەرقووفەکان/ زەویی جووتیاران/ فەسڵی حەوتەم: شێوەکانی ملکانەی زەوی/ ملکانەی بە شتوومەک- نەزمی شەریکەتی/ ملکانەی بە دراو/ ملکانەی بە کار و کۆنەتی جووتیار/ ملکانەی ئاژەڵداری/ ملکانەی سەرمایەداری/ فەسڵی هەشتەم: پێکهاتنی کۆمەڵایەتی و پایەی ژیانی خەڵکی لادێ/ پێکهاتنی کۆمەڵایەتیی لادێی خەڵکی کوردستان/ وەزعی وەرزێران/ بەرهەم هێنانی وەرزێری و سیاسەتی وەرزێری/ فەسڵی نۆیەم: سەنعەت و بازرگانی و باری ماڵی/ سەنعەت/ بازرگانی و باری ماڵی/ فەسڵی دەیەم: جێگای نەوت لە ئابووریی نەتەوایەتیدا/ نەوت لە جیهاندا/ نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و مۆنۆپۆلەکانی نەوت/ نەزمی ٥٠-٥٠ و جێبەجێکردنی/ میللییکردنی نەوت/ پێوەندی بە پێشکەوتنی ئابوورییەوە/ فەسڵی یانزەیەم: گیروگرفتەکانی هەڵدانی ئابووری/ سەبەرخۆیی سیاسی و پێشکەوتنی ئابووری/ پێوەندیی دوولایی نێوان وەرزێری و

سەنعەتیکردن/ بەرزکردنەوی پایەی ژیان/ هەڵبژاردنی پایەی گەشەکردن/ فەسڵی دوازدەیەم: مەسەلەی کورد لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا/ سروشتە تایبەتییەکانی مەسەلەی کورد/ وەزعی ئێستای کورد/ جێگیربوونی نەتەوایەتیی کورد/ سروشتی خەباتی ڕزگاریخوازی گەلی کورد/ فەسڵی سێزدەیەم: مافی دیاریکردنی چارەنووسی نەتەوەکان و مەسەلەی کورد/ مارکسیستەکان و مافی دیاریکردنی چارەنووسی نەتەوەی کورد/ داخوازی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد/ ڕێگای ڕزگاریی گەلی کورد/ ئەنجام/ دوا قسە بۆ چاپی کوردی/ پاشکۆی یەکەم: بەندەکانی بەیاننامەی ١١ی مارسی ١٩٧٠/ پاشکۆی دووەم: بڕیاری حیزبی کرێکاری تورکیا لەسەر مەسەلەی کورد/ پاشکۆی سێیەم: بەرنامەی (ح.د.ک) ئێران/ ئەو وشە و زاراوانە بزانە/ سەرچاوەکان/ فیهرستی ناوەکان/ فیهرستی باسەکان (ناوەڕۆک).

**٢- ڕژێمە ئابوورییەکان و کۆمەڵگای تەکنۆلۆژی نوێ... بەرگی یەکەم**

نووسین: د.محەمەد فازیل محەمەد قەفتان

بڵاوکراوەی چاپخانەی ئۆفسێتی سەرکەوتن

چاپ: یەکەم، چ: سەرکەوتن، ش: سلێمانی، ژ.س: ١١٧٣، س: ١٩٨٥، ل:١٧٦، پ:٢٣×١٦

ناوەڕۆک:

پێڕست/ سەرەتایەک/ هەندێ بابەتی وەک: دروستبوونی کۆمەڵگای مرۆڤ- کۆمەڵگای سەرەتایی/ ڕژێمی کۆیلایەتی/ ڕژێمی دەرەبەگایەتی/ شۆڕشی پیشەسازی/ زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان/ فراوانبوونی بازرگانی ناوخۆ و دەرەوە/ سەرمایە/ ڕامیاریی سەربەستیی ئابووری و دەست تێ نەخستنی دەوڵەت لەنێو چالاکییە ئابوورییەکاندا/ بەرگی دووەم: ڕژێمی سەرمایەداری/ ڕژێمی سۆشیالیستی...

**٣- نەوتی کوردستانی عێراق- تۆژینەوەیەکی مێژوویی، جیۆلۆجی، جوگرافی و ئابوورییە- بەشی یەکەم**

ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: مەکتەبی ناوەندیی دیراسات و تۆژینەوە (پ.د.ک.)

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ؟، س: ١٩٩٧، ل:٩٦، پ:٢١×١٥

ناوەڕۆک:

بەرایی/ بەندی یەکەم: ململانێ لەسەر نەوتی کوردستان/ بەندی دووەم: جیۆلۆجیای نەوتی کوردستان/ بەندی سێیەم: جوگرافیای نەوتی کوردستان/ بەندی چوارەم: ئابووریی نەوتی کوردستان/ دەرەنجام/ پێڕستی خشتەکان/ پێڕستی نەخشە و وێنەکان/ ناوەڕۆک.

**٤- کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە بەهاری ١٩٨٨ کورتە باسێکی جوگرافی، ئابووری، کۆمەڵایەتی**

نووسین: شەوکەت حاجی موشیر

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ١٩٩٨، ل:٢١٠، پ:١٥×٢١

ناوەڕۆک:

پێڕست/ ژیاننامەی نووسەر/ ڕوونکردنەوەیەکی پێویست/ بەشی یەکەم: کورتەیەک لەسەر دەستپێکردنەوەی شۆڕشی نوێ لە ساڵی ١٩٧٦/ فەوجی جاشی سووک و کارگەرییان لەسەر ناوچەی هەڵەبجە/ گفتوگۆی ساڵی ١٩٨٤ی یەکێتی و حکوومەتی عێراق/ ڕێککەوتنی یەکێتیی نیشتمانی و حکوومەتی ئیسلامی ئێران/ ڕاپەڕینی خەڵکی ناوچەکانی سەر بە قەزای هەڵەبجە/ چالاکیی ئەنفالی یەک ساڵی ١٩٨٨/ بەشی دووەم: هەڵەبجە کوێیە؟/ شوێنەوارە بەناوبانگەکانی سنووری هەڵەبجە/ سەروەرییەکانی ناوچەی هەڵەبجە/ شاعیر و نووسەر و ئەدیبە بەناوبانگەکانی سنووری هەڵەبجە/ بەشی سێیەم: بۆچی شەڕی هەڵەبجە کەوتە پێش قەڵادزە؟/ سنوورەکانی ئێران لە دەوری هەڵەبجە/ جارێکی تر هاتنەوەی محەمەد تارانی بۆ لامان/ یەکەم بۆردومانی کیمیایی/ هاتنی هێزی ئێران/ پەشیمان بوونەوەی نوێنەرانی ئێران/ بەسەرهاتی بانقی هەڵەبجە/ دوا وتە.

**٥- کورد- کورتەی پێوەندیی کۆمەڵایەتی- ئابووریی- ڕۆشنبیری و گوزەران**

نووسین: ا. م. مینتیشاشڤیلی

وەرگێڕانی لە زمانی ڕووسییەوە: د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

لەچاپکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری

چاپ: یەکەم، چ: فەرهەنگ، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٠٤، س: ١٩٩٩، ل:٣٩٢، پ:١٧×٢٤

ناوەڕۆک:

پێشەکیی وەرگێڕ/ سەرەتا/ بەشی یەکەم: ئابووری- گوزەران و ڕۆشنبیری/ مەیدانەکانی کشتوکاڵ و باری ئابووری/ زەحمەتکێشانی لادێ/ ماڵداری/ کشتوکاڵ/ بنکەی ئەندازیاریی کشتوکاڵ/ حاڵی زەحمەتکێشانی مەیدانی کشتوکاڵ/ شار و ژیانی ناوشار/ باری پیشەی دەستکرد و بازرگانی/ کوردستانی تورکیا/ کوردستانی عێراق/ کوردستانی ئێران/ ژین/ خێزان/ خزمایەتی/ عادەت و ڕەوشت و خوو/ ئایین: ئیسلام/ سەید/ شێخ و دەروێش/ یەزیدی/ ئەهلی حەق (عەلی ئیلاهی- کاکەیی)/ ڕۆشنبیری/ زمان و نووسین/ ئەدەبیات/ چاپەمەنیی ناوبەناو/ بەشی دووەم: عەشرەتەکانی کورد و فیدراسۆنی عەشایر/ بەشی سێیەم: پێوەندیی کشتوکاڵ و گەشەسەندنی کشتوکاڵ/ پەراوێزەکان/ لیستەی ناوە کورتکراوەکان/ بەکارهێنانی سەرچاوە و ئەدەبیات/ فەهرەستی ناو/ ناوی جوگرافی/ ناوی ڕەگەز/ ناوەڕۆک/ کورتەیەک لەبارەی کتێبەکە بە زمانی ئینگلیزی.

**٦- ئابوریی کوردستان ١٩٧٧- ١٩٩٠**

نووسین: د.سەلاحەددین حەفید

بڵاوکراوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣٦٢، س: ٢٠٠٠، ل:٢٥٤، پ:٢٣×١٦

ناوەڕۆک:

پێشەکی/ بەشی یەکەم: سلێمانی/ بەشی دووەم: هەولێر/ بەشی سێیەم: دهۆک/ هەربەشێک باس لە (زانیاریی گشتی و کەرتی کشتوکاڵ و کەرتی پیشەسازی و کەرتی خزمەتگوزاری) هەریەک لەو شارانە دەکات/ پێڕستی خشتەکان/ پێڕست.

**٧- جوگرافیای ئابووریی نەفت لە کوردستاندا**

نووسین: د.عەبدوڵڵا غەفوور

چاپ: یەکەم، چ: و. ڕۆشنبیری، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣١٣، س: ٢٠٠١، ل:٢٦٤، پ:٢٢×١٦

ناوەڕۆک:

ناواخن/ قسەی بەرایی/ سەردێڕی یەکەم: چۆنیەتیی دروستبوونی نەفت و ڕێبازی دۆزینەوەی خەزێنەکانی/ سەردێڕی دووەم: عەقد و ئیمتیازەکانی نەفت لە کوردستاندا/ سەردێڕی سێیەم: یاسا و خۆماڵیکردنی نەفت لە کوردستاندا/ سەردێڕی چوارەم: بەرهەمهێنانی نەفت لە کوردستاندا/ سەردێڕی پێنجەم: جوگرافیای مەیدانەکانی نەفت لە کوردستاندا/ سەردێڕی شەشەم: پیشەسازیی پاڕزنی نەفت لە کوردستاندا/ سەردێڕی حەفتەم: هێنان و بردنی نەفت لە کوردستاندا/ سەردێڕی هەشتەم: ناردەی نەفتی خاو لە کوردستاندا/ سەردێڕی نۆیەم: شوێنەواری نەفت لە ئابووریی کوردستاندا/ سەرچاوە/ سەرباری تێکست/ سەرباری ئاماری.

تێبینی: وەک لە چاپی دووەمدا ئاماژەی پێکراوە، ساڵی ٢٠٠١ لە وڵاتی سویدیش چاپێکی تری کراوە.

**٨- کورتەیەک لە مێژووی ئابووری و کۆمەڵایەتی سەراوی سوبحان ئاغای شارەزوور**

**نووسین: مەحموود کەریم ئەحمەد**

چاپ: یەکەم، چ: ئەزمر، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٢١، س: ٢٠٠١، ل:٧٢، پ:٢٠×١٤

ناوەڕۆک: پێشەکی/ یەکەم: قۆناغی ئاوەدانبوونەوە/ دووەم: ژیان و گوزەرانی پێش ١٩٥٨/ سێیەم: دوا ساڵی ١٩٥٨/ پاشکۆکان/ لیستی ناوی ماڵە بنەڕەتییەکانی سەراو ١٩٣٠- ١٩٣٤-١٩٧٠/ سەرچاوەکان/ هەندێ وێنەی ڕەش و سپی.

**٩- كورد و زەمەنی عەولەمە- لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی ئابوورییە**

نووسین: دلێر عەباس مستەفا

چاپ: یەکەم، چ.: ژین، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٣٠، س.: ٢٠٠١، ل.:٨٢، پ.:١٤×٢٠

ناوەڕۆک: پێناسەیەک بۆ عەولەمە/ کورتەیەک لە مێژووی سەرهەڵدانی عەولەمە/ هۆکارەکانی پەیدابوونی عەولەمە/ عەولەمە و گۆڕینی بەها نەتەوەییەکان/ سەرمایەداری ... و شێواندنی هەرەمی دەوڵەتان/ عەولەمە... گۆڕینی باری ڕۆشنبیری/ عەولەمە و ... خوێندنەوەیەکی واقیعبینانە بۆ بەشەریەت/ وەرگرتنی ڕۆشنبیرییەکی نوێتر/ سیما ئاشکرا و بەرچاوەکانی عەولەمە/ کورد و زەمەنی عەولەمە/ پتەوکردنی ڕای گشتیی کوردی/ بەهێزکردنی دیموکراتییەت/ خەبات لە پێناو دەوڵەتی نەتەوەیی کوردی/ ئابووریی بەهێز... مەرجی خۆگونجاندنە لەگەڵ ڕەوتی عەولەمە/ سەرچاوەکان.

**١٠- ئەنفالی گەرمیان- ڕەهەندە دیمۆگرافی، ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی- لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانییە لە ئۆردوگای (ڕزگاری)دا**

نووسین: ناهیدە جەمال تاڵەبانی- جاسم محەمەد محەمەد عەلی

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ.: وشە، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ؟، س.: ٢٠٠٢، ل.:١٤٣، پ.:١٦×٢٢

ناوەڕۆک: پێشەکی/ بەشی یەکەم: لایەنی تیۆری/ باسی یەکەم: دەستنیشانکردنی چەمک و زاراوەکان/ باسی دووەم: جینۆسایدی گەلی کورد/ باسی سێیەم: ئەنفالی (سێ) گەرمیان/ بەشی دووەم: لایەنی مەیدانی/ باسی یەکەم: ڕێ و شوێنەکانی جێبەجێکردنی لێکۆڵینەوە مەیدانییەکە/ باسی دووەم: ڕەوشی دیمۆگرافی/ باسی سێیەم: ڕەوشی ئابووری/ باسی چوارەم: ڕەوشی کۆمەڵایەتی/ دەرەنجام و ڕاسپێرەکان/ دەرەنجامەکان/ ڕاسپێری و پێشنیازەکان/ لیستی سەرچاوەکان/ پێڕست/ پاشکۆی ناوی ئەنفالکراوەکانی نموونەی لێکۆڵینەوەکە/ پاشکۆی وێنەکان.

**١١- جوگرافیای ئابووریی نەفت لە کوردستاندا**

نووسین: د.عەبدوڵڵا غەفوور

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ: دووەم، چ.: و. ڕۆشنبیری، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٣١٣، س.: ٢٠٠٢، ل.:٢٦٤، پ.:١٦×٢٢

ناوەڕۆک: هەمان ناوەڕۆکی چاپی یەکەمی هەیە، بڕوانە کتێبی ژمارە هەشت.

**١٢- كەڵە فەرهەنگی ڕووەکە ئابوورییەکان بەتایبەتی لە کوردستاندا/ کوردی- عەرەبی- ئینگلیزی**

ئامادەکردن: کەمال جەلال غەریب

بڵاوکراوەی کتێبی هەرزان- سوید

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سوید، ISBN: ٩١ ٨٨٨٨٠ ٩٥ ٨، س: ٢٠٠٢، ل:٤١٨، پ:٢١×٢٩

ناوەڕۆک:

سەرەتایەکی پێویست/ سەبارەت بە ژیانی نووسەر/ سەبارەت بە چالاکیی سیاسی/ چاپکراوەکانی (ئەم بابەتانە لە لایەن «ئاسی ڕەباتی»یەوە نووسراوە)/ هەندێ بابەتی وەک: پێشەکی/ ناوی هەندێ لە ڕووەکزانە بیانی و عەرەب و کوردە کۆنەکان/ کورد و ڕووەکی پزیشکی/ ڕووەکی پزیشکی لە هەڵبەستی کوردیدا/ گوڵ و گیای کوردستان/ دەروازەیەک بۆ ڕووەکی ئابووری/ مادە سڕکەرەکان و کارەکانیان/ ڕووەکە پزیشکییەکان/ ڕووەک لە پیشەسازیدا/ دارستان و دارتاشین/ فەرهەنگەکە بە وێنەی (ڕەنگی شین) بەپێی ڕیزبەندی تیپەکان.../ فەرهەنگۆکی ئینسکلۆپیدیای ڕووەکە ئابوورییەکان.

**١٣- میرنشینییەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات لە سەردەمی فەرمانڕەوایی قاجارەکاندا- لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی، ڕامیاری و ئابووریی**

نووسین: نازناز محەمەد عەبدولقادر

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی

چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٩٥، س: ٢٠٠٢، ل:٢٤٦، پ:١٦×٢٣

ناوەڕۆک:

پێرستی ناوەڕۆک/ پێشەکی/ سەرەتا/ بەشی یەکەم: جوگرافیا و مێژوو و ژیانی ئابووری و سترۆکتوری ڕامیاریی کۆمەڵایەتیی کوردستانی ڕۆژهەڵات/ هەڵکەوتی جوگرافی کوردستانی ڕۆژهەڵات و باری جوگرافیی ڕامیاری/ کورتە باسێکی مێژووی ڕامیاریی میرنشینانی کوردستانی ڕۆژهەڵات لە سەرهەڵدانی میرنشینەکانەوە تا کۆتایی هاتنیان/ ژیانی ئابووریی کوردستانی ڕۆژهەڵات لە سەردەمی قاجاریاندا/ ستروکتوری ڕامیاریی کۆمەڵایەتی لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا/ بەشی دووەم: پەیوەندییەکانی دەوڵەتی قاجاری لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی و ڕووسیا و بەریتانیا و کاردانەوەی لەسەر کوردستانی ڕۆژهەڵات/ پەیوەندیی ئێران و عوسمانی و کاردانەوەی ئەم پەیوەندییە لەسەر میرنشینەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات/ پەیوەندی ناوخۆیی و دەرەکی میرنشینیەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات و هۆکاری چۆنێتیی لەناوچوونی میرنشینیەکان/ پەیوەندیی میرنشینیەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات لەگەڵ فەرمانڕەوایی قاجاردا/

پەیوەندیی میرنشینیەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات لەگەڵ یەکتری و لەگەڵ میرنشینانی کوردستانی ژێر فەرمانڕەوایی دەوڵەتی عوسمانی/ هۆکارەکان و چۆنێتیی لەناوچوونی میرنشینیەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات/ دەرەنجام/ لیستی سەرچاوەکان/ پاشکۆکان.

**١٤- ئابووریی کوردستان**

نووسین: میهرداد ئیزەدی

وەرگێڕانی لە زمانی ئینگلیزییەوە: کامەران فەهمی

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٣، ل:٥٦، پ:١١×١٥

ناوەڕۆک: ناساندن/ سەرچاوە سروشتییەکان/ نەوت/ ئاو/ کشتوکاڵ/ ئاژەڵ/ ئابووریی کۆچەر/ پاشکۆ/ پیشەسازی/ بازرگانی/ پێڕست.

**١٥- ئابووری کوردستانی باشوور- لێکۆڵینەوەیەکی ئابوورییە دەربارەی هەرێمی کوردستانی عێراق**

نووسین: خەسرۆ پیربال

وەرگێڕانی لە ؟: ئیسماعیل خەلیل هەژار

بە هاوکاریی وەزارەتی ڕۆشنبیری حکوومەتی هەرێمی کوردستان چاپکراوە

چاپ: یەکەم، چ: و-ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ١٤١، س: ٢٠٠٣، ل:١٢٨، پ:١٦×٢٢

ناوەڕۆک: ناوەڕۆک/ پێشەکیی وەرگێڕ/ بەشی یەکەم: پێشەکیی لێکۆڵینەوەکە/ بەشی دووەم: کوردستان و نەتەوەی کورد/ سەرەتا و بناغەی ڕەسەنی کورد/ بەشی سێیەم: ئابووریی کوردستان/ بەشی چوارەم: ڕێ و شێوازی بازرگانی لە کوردستانی عێراقدا/ بەشی پێنجەم: سەرنج و پێشنیازەکان/ کورتە و پوختە و دەرئەنجامەکان/ گەواه و سەرچاوەکان/ هاوپێچەکان.

**١٦- پشدەر- لێکۆلینەوەیەکی مێژوویی، کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابوورییە لە سەرەتای سەدەی بیست دا تا ساڵی ١٩٥٨**

کۆکردنەوە و نووسین: دارا خدر حەسەن

لەسەر ئەرکی (ئازاد جندیانی) چاپکراوە.

چاپ: یەکەم، چ: ناوەندی ڕاگەیاندنی (ی.ن.ک)، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٣، ل:١٥٠، پ:١٥×٢١

ناوەڕۆک: ناوەڕۆک/ هەندێ هێمای کورتکراوە/ پێشەکی/ بەشی یەکەم: ناوی پشدەر یان قەڵادزێ/ شوێنی پشدەر و سنوورەکەی/ دابونەریتی ناوچەی پشدەر/ پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی ناوچەی پشدەر/ دانیشتوانی پشدەر/ هۆز و تیرەکانی ناوچەی پشدەر/ بارودۆخی پشدەر دوای جەنگی جیهانیی یەکەم/ بەشی دووەم: پشدەر لە کۆتایی دەسەڵاتی عوسمانییەکان تا ساڵی ١٩٣٢/ شەڕی پشدەری و دەوڵەتی عوسمانی/ شەڕی پشدەری و ڕووس/ شەڕی پشدەری و مەنگوڕ/ شەڕی پشدەری و ئینگلیز/ شەڕی پشدەری و ئێران/ شەڕی پشدەری و وەڕاز/ بەشی سێیەم: بارودۆخی پشدەر لە دوای ساڵی ١٩٤١-١٩٥٨/ پەیوەندیی پشدەرییەکان لەگەڵ ئینگلیزدا/ پەیوەندیی پشدەرییەکان لەگەڵ سمکۆی شکاکدا/ پەیوەندیی پشدەرییەکان لەگەڵ شێخ مەحموودا/ پەیوەندیی پشدەرییەکان لەگەڵ حکوومەتی عێراقدا/ پەراوێز/ بەرەنجام/ سەرچاوەکان/ پاشکۆکان.

**١٧- پێکهاتنی چوارچێوەی ئابووری و سیاسی چینی بۆرجوازی لە شاری سلێمانیدا ١٨٢٠-١٩٢٠**

نووسین: مامۆستا جەعفەر

بڵاوکراوەی ڕاگەیاندن و ڕووناکبیریی مەڵبەندی ڕێکخستنی (ی.ن.ک)

چاپ.: یەکەم، چ.: ؟، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٤٤٧، س.: ٢٠٠٣، ل.:٦٨، پ.:١٥×٢٠

ناوەڕۆک: هەندێ بابەتی وەک: چینی بۆرجوازی/ سەرەتای دەرکەوتنی سیاسیی بۆرجوازی لە شاری سلێمانی/ حاجی سەعید ئاغا ١٨٦٢-١٩٦٢/ فەتاح بەگی ساحێبقڕان/ سلێمانی و کەرکووک/ مستەفا پاشای یامولکی/ سەرچاوەکان/ دوا وشە.

**١٨- شەڕێ ئابووری و ململانا جیهانی ل سەر دەریا قەزوین- ڤەکولینەک (سیاسی- ئابوری- ستراتیژی)**

نووسین: هاشم زێباری

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک)

چاپ.: یەکەم، چ.: ؟، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ؟، س.: ٢٠٠٣، ل.:١٩٠، پ.:١٥×٢٠

ناوەڕۆک: پێشگوتن/ هەندێ بابەتی وەک: جیوپولوتیکا پترۆل و گازێ ل جیهانێ/ پترۆل و پرسا کوردی و هێلا باکو- جیهان/ دەستپێکا پەیدابوونا ململانا جیهانی و هەرێمی ل سەر سامانێت دەریا قەزوین/ سەروبەرێ یاسایێ دەریا قەزوین/ پرۆژێن ڤەگواستنا سامانێت دەریا قەزوین/ کومارێن ئێکەتیا سۆڤیەتی یا جاران/ ئێران دبەرەیەکێ هەڤدژدا/ تورکیا و ململانا هەرێمی/ نەفتا عەرەبا و ڕۆژهەلاتا ناڤین/ بەلگەنامە/ ژ ڕۆژنامەڤانی یا جیهانی.

**١٩- ڕەوشی مێینە لە کوردستاندا- بەرگی یەکەم- توێژینەویەکی کۆمەڵایەتی سیاسی ئابوورییە سەبارەت بە ڕەگەزی مێ بەشێوەیەکی مەیدانی و تیۆری لە ماوەی ٢٠٠٢/٩/٢ تا ٢٠٠٢/١١/٢ لە ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستاندا ئەنجامدراوە**

نووسین: سۆران قادر کۆستە

بڵاوکراوەی ڕێکخراوی NPA نەرویجی

چاپ.: یەکەم، چ.: شڤان، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٦٣٢، س.: ٢٠٠٤، ل.:٧٩١، پ.:٢٢×٣٣

ناوەڕۆک:

ناوەڕۆک/ پێشەکیی ڕێکخراوی فریاگوزاریی میللەتی نەرویجی/ دەستپێک/ دەروازەی یەکەم: ئەزموونی توێژینەوەکە/ بەشی یەکەم: ئاسانکارییەکان/ بەشی دووەم: ئەزموون و پێویستی پرۆژەکەیان هێنایە گۆڕێ/ بەشی سێیەم: ناوەڕۆکی تیۆریی توێژینەوەکە/ بەشی چوارەم: کەرەستەی توێژینەوەکە و چۆنێتیی بەکارهێنانی/ پاشکۆی دەروازەی یەکەم: پاشکۆی ژمارە ١: فۆرمی کۆکردنەوەی زانیاری لە ڕێکخراوەکان/ پاشکۆی ژمارە ٢: بڕگەکانی فۆرمی تایبەت بەگرۆی کچ/ پاشکۆی ژمارە ٣: بڕگەکانی فۆرمی تایبەت بەگرۆی ژن/ پاشکۆی ژمارە ٤: بڕگەکانی فۆرمی تایبەت بەگرۆی بێوەژن/ دەروازەی دووەم: ئەنجامە ئامارکراوەکان/ خشتە و گرافەکانی تەوەری یەکەم: خوێندن و فێربوونی بەردەوام/ خشتە و گرافەکانی تەوەری دووەم: ئاستی ڕۆشنبیری/ خشتە و گرافەکانی تەوەری سێیەم: بایەخپێدانی تەندروستی/ خشتە و گرافەکانی تەوەری چوارەم: باری دەروونی و پەیوەندیی کۆمەڵایەتی/ خشتە و گرافەکانی تەوەری پێنجەم: ڕۆڵ و پلە و پایەی ڕەگەزی مێ لە خێزاندا/ خشتە و گرافەکانی تەوەری شەشەم: ماف و هۆشیاریی یاسایی/ خشتە و گرافەکانی تەوەری حەوتەم: شووکردن و هاوسەرگرتن/ خشتە و گرافەکانی تەوەری هەشتەم: بەشداریی سیاسی/ خشتە و گرافەکانی تەوەری نۆیەم: توندوتیژیی جێندەری/ خشتە و گرافەکانی تەوەری دەیەم: سەربەستیی بڕیاری ئابووری/ خشتە و گرافەکانی تەوەری یانزەیەم: بایەخپێدانی بێوەژن.

**٢٠- ڕەوشی مێینە لە کوردستاندا- بەرگی دووەم/ توێژینەویەکی کۆمەڵایەتی سیاسی ئابوورییە سەبارەت بە ڕەگەزی مێ بەشێوەیەکی مەیدانی و تیۆری لە ماوەی ٢٠٠٢/٩/٢ تا ٢٠٠٢/١١/٢ لە ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستاندا ئەنجامدراوە**

نووسین: سۆران قادر کۆستە

بڵاوکراوەی ڕێکخراوی NPA نەرویجی

چاپ.: یەکەم، چ.: شڤان، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٦٣٢، س.: ٢٠٠٤، ل.:٧٥٣، پ.:٢٢×٢٧

ناوەڕۆک: ناوەڕۆک/ بەرگی دووەمی ڕەوشی مێینە لە کوردستاندا/ پوختەی ڕەوشی مێینە لە کوردستاندا/ تەوەری یەکەم: خوێندن و فێربوونی بەردەوام/ تەوەری دووەم: ئاستی ڕۆشنبیری/ تەوەری سێیەم: بایەخپێدانی تەندروستی/ تەوەری چوارەم: باری دەروونی و پەیوەندیی کۆمەڵایەتی/ تەوەری پێنجەم: ڕۆڵ- پلە و پایەی ڕەگەزی مێ لە خێزاندا/ تەوەری شەشەم: ماف و هۆشیاریی یاسایی/ تەوەری حەوتەم: شووکردن و هاوسەرگرتن/ تەوەری هەشتەم: بەشداریی سیاسی/ تەوەری نۆیەم: توندوتیژیی جێندەری/ تەوەری دەیەم: سەربەستیی بڕیاری ئابووری/ تەوەری یانزەیەم: بایەخپێدانی بێوەژن.

**٢١- کورد گەلی مەینەتییەکان- ڕەوشی دیمۆگرافی ئابووریی و کۆمەڵایەتی کوردەکانی لوبنان**

نووسین: سەلاح عیسام ئەبوشەقرا

وەرگێڕانی لە ؟: جاسم محەمەد محەمەد عەلی

بڵاوکراوەی خانەی وەرگێڕان

چاپ: ؟، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦٢٥، س: ٢٠٠٤، ل: ١٩٠، پ: ١٤×٢٠

ناوەڕۆک: دەستپێک- کوردەکانی لوبنان لە مەنفایەکی ناچارییەوە بۆ نیشتمانێکی ئیختیاری: د.عیسام نوعمان/ پێشەکی: نووسەر/ بەشی یەکەم: کوردستان و کورد/ جوگرافیای کوردستان/ دیارترین وێستگەکانی خەباتی نەتەوەیی کورد لە دوای شەڕی جیهانیی یەکەمەوە/ شۆڕشی کورد بە سەرکردایەتی ئۆجەلان ١٩٨٤-؟/ بەشی دووەم: ڕەچەڵەکی کوردەکانی لوبنان/ بەشی سێیەم: لێکۆڵینەوەی دیمۆگرافی (دانیشتوان)/ بەشی چوارەم: ڕەوشی ئابووری/ بەشی پێنجەم: ڕەوشی کۆمەڵایەتی/ بەشی شەشەم: کۆچی کوردەکان لە لوبنانەوە/ کۆبەند و ئەنجامگیری/ پێڕستی سەرچاوەکان/ پێڕستی خشتەکان/ پێڕستی شێوەکان/ ناوەڕۆک (بێ ناونیشان).

تێبینی: ساڵی لەسەر نییە و بەپێی لیستی بڵاوکراوەکانی خانەی وەرگێڕان، لەم ساڵەدا دانراوە.

**٢٢- ئەتڵەسی کەرکووک- مێژوویی، کارگێڕی، سروشتی، مرۆیی، ڕامیاری، ئابووری**

ئامادەکردن: هاشم یاسین حەمەدئەمین و سەردار محەمەد عەبدولڕەحمان

بڵاوکراوەی لیژنەی باڵای بەرەنگاربوونەوەی بەعەرەبکردنی کوردستان

چاپ: یەکەم، چ: دار المغرب، ش: هەولێر؟، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٥، ل: ٧٨، پ: ٢٩×٤٣

ناوەڕۆک: ناوی لیژنەی باڵا/ ناوی لیژنەی تەکنیکی و سەرپەرشتیاری ئەتڵەس/ ناوی دانەران (بەپێی جۆری نەخشەکان)/ پەیڤی سەرۆکی لیژنەی باڵا: عارف تەیفوور

سەردار/ پێشەکی: دەستەی ئامادەکار/ نەخشەی ژمارە ١: کەرکووک لە دەوڵەتی حوری و سۆپارتی/ کەرکووک لە هەرێمی عێراق و هوزستان/ کەرکووک لە سەردەمی عوسمانییەکان/ کارگێڕیی کەرکووک لە ویلایەتی مووسڵ لە سەردەمی عوسمانی/ کارگێڕیی کەرکووک لە ساڵانی: ١٩٤٧-١٩٥٧-١٩٦٥/ ناوچە داپچڕاوەکان لە کەرکووک لە ساڵی ١٩٧٦/ کارگێڕیی کەرکووک لە ساڵانی: ١٩٧٧-١٩٨٧-١٩٩٧/ کەرکووک بەپێی ڕووبەر و یەکە کارگێڕییەکان ١٩٤٧-١٩٩٧/ ڕووبەری یەکە کارگێڕییەکان بەپێی قەزاکان ١٩٤٧/ ڕووبەری یەکە کارگێڕییەکان بەپێی قەزاکان ١٩٥٧/ ڕووبەری یەکە کارگێڕییەکان بەپێی قەزاکان ١٩٧٧/ ڕووبەری یەکە کارگێڕییەکان بەپێی قەزاکان ١٩٨٧/ ڕووبەری یەکە کارگێڕییەکان بەپێی قەزاکان ١٩٩٧/ شوێنی کەرکووک بە گوێرەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و عێراق/ شوێنی کەرکووک بە گوێرەی عێراق/ شوێنی جوگرافی کەرکووک لە هەرێمی کوردستان/ پێکهاتە جیۆلۆجییەکانی پارێزگای کەرکووک/ هەندێ داتای: پلەی گەرمی و باران و شێ و پاڵەپەستۆ و ئاو.../ ژمارەی دانیشتوان و دابەشبوونی ژینگەیی کەرکووک ١٩٤٧-١٩٩٧/ دابەشبوونی ژینگەیی دانیشتوان (شار و لادێ) ١٩٥٧/ دابەشبوونی ژینگەیی دانیشتوان (شار و لادێ) ١٩٦٥/ دابەشبوونی ژینگەیی دانیشتوان (شار و لادێ) ١٩٧٧/ دابەشبوونی ژینگەیی دانیشتوان (شار و لادێ) ١٩٨٧/ ڕێژەی کورد لە کەرکووک بەپێی قەزاکان ١٩٥٧/ ڕێژەی کورد لە کەرکووک بەپێی قەزاکان ١٩٧٧/ دابەشبوونی کورد و عەرەب و تورکان بەپێی قەزاکان ١٩٧٧/ دانیشتوانی کەرکووک بەپێی نەتەوەکان ١٩٥٧-١٩٧٧/ ڕێژەی زیادبوونی ساڵانەی دانیشتوان بەپێی نەتەوەکان/ قووچەی دانیشتوان: ١٩٧٧-١٩٨٧/ چڕی دانیشتوان: ١٩٥٧-١٩٧٧-١٩٨٧/ ژمارەی لادێکانی کەرکووک بە گوێرەی لادێکانی عێراق ١٩٥٧-١٩٨٧/ ژمارەی ڕاگوێزراوەکانی کەرکووک ١٩٦٣-١٩٦٩/ ناوچە ئەنفال و کیمیاباران کراوەکان/ ڕێژەی دابەشبوونی ئایینی دانیشتوان ١٩٧٧/ ناوچەی شوێنەوار و گەشتیاریی کەرکووک/ دابەشبوونی جوگرافی هۆزەکان/ کانزاکان لە کەرکووک.../ پێڕستی نەخشەکان (ناوەڕۆک).

**٢٣- ڕەوشی ئابووری و کۆمەڵایەتیی کوردی ڕەواندز**

نووسین: ئی. ئار. لیچ

وەرگێڕانی لە زمانی ئینگلیزییەوە: عەزیز گەردی

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی خانەی وەرگێڕان

چاپ: یەکەم، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژ.س: ١١، س: ٢٠٠٥، ل:٢٠٢، پ:١٤×٢١

ناوەڕۆک: ناوەڕۆک/ بەشی یەکەم: پێناسەی کێشەکە/ پێشەکی/ سەرنجێ لەبارەی ناوی کوردییەوە/ مەیدانی لێکۆڵینەوەکە/ ڕێبازی شیکردنەوە/ بەڕێوەبەرایەتیی دەرەکی/

بەشی دووەم: ڕەوشی کۆمەڵایەتی/ پێکهاتەی سیاسی/ پێناسەی توخمەکان/ میراتگریی/ زەویداری/ ئاغای بەرەباب/ ئاغای هۆز/ پێکهاتەی خزمایەتی/ زەماوەندی ڕەشەوەندی خەڵک/ زەماوەندی ئاغاکان/ بەراوردێک لەگەڵ تێبینییەکان (های)/ خاڵەکانی شیکردنەوە- لێکۆڵینەوەی زیاتریان بەدەمەوەیە/ ڕەوشی کۆمەڵایەتیی ناوچەکانی تری جگە لە باڵەک/ کۆچەر/ بەشی سێیەم: ڕەوشی ئابووری/ دیوەخانە/ خەرجیی ئاغا/ هاوسنگیی ئابووریی جڤاتی گوند/ ئەنجامەکانی زیادبوونی تووتن چاندن/ پەیوەندییەکانی ئابووری لە چوارچیوەی دێدا/ پیشە/ مامڵەتچی/ فرۆشتنی تووتن/ زەماوەند/ مردن/ مەلا/ بەشی چوارەم: لایەنی کۆمەڵایەتی و ئابووریی تەکنیکی کوردی/ پەیوەندیی تەکنەلۆجیا بە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتییەوە/ کەمیی زەوی و دروستکردنی خانوو و خزمایەتی/ زەویی کێڵان/ دەغڵ کوتان/ سوودوەرگرتن لە زەوی/ برنج/ ئاش/ جۆڵایی/ بەشی پێنجەم: هۆکارەکانی بایەخی ئابووریی بچووک/ جونگ/ دوژمنداریی/ ڕەوشی ئایینی/ مەلا/ مزگەوت/ بەشی شەشەم: ئەنجام/ سنووربەندەکانی بابەتی پێشەوە/ بەشداریی چالاکانە/ پاشکۆ- یەکەم: خشتەی زاراوەی خزمایەتی/ دووەم: هێڵکاریی تەکنیکی/ جۆڵایی کوردی- ئاشی کوردی/ نەخشەکان/ لیوای هەولێر/ ناوچەی ڕواندز/ گوندی وەلاش/ وێنە فۆتۆگرافییەکان.

**٢٤- فەرهەنگی ڕووداوەکانی کوردستان و وڵاتانی جیهان- ڕامیاری- جوگرافی- ئابووری- مێژوویی- نوێترین ئامارەکان**

ئامادەکردن: عەلی کەندی

بڵاوکراوەی کتێبخانەی زانیار

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: هەولێر، ژ.س: ٤١٩، س: ٢٠٠٥، ل:٥٣٢، پ:١٧×٢٥

ناوەڕۆک: پێشەکی/ کیشوەری ئاسیا/ کوردستان/ عێراق/ سووریا/ ئێران/ وە هەندێ وڵاتی تر/ سەرچاوەکان.

**٢٥- ئاسۆی ئابووری سەرچاوەکانی ئاو و کانزاکانی کوردستان**

نووسین: دارا عومەر

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک)

چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژ.س: ٩٩٩، س: ٢٠٠٦، ل:١٠٤، پ:١٤×١٨

ناوەڕۆک: ناوەڕۆک/ بەشی یەکەم: کانزاکانی کوردستان/ پێشەکی: د.ئاراس حسێن نەجاڕ/ نەوت/ ئاسن/ مس/ گۆگرد/ قوڕقوشم/ کرۆم/ فۆسفۆر/ کالسیۆم/ نیکڵ/ زێڕ/ زیو/ ئەلەمنیۆم/ ئەسبێست/ ئەڵماس/ مەنگەنیز/ زەرنیخ/ تەنەکە/ خەڵوزی بەردین/ مەڕمەڕ/

قیر/ چیمەنتۆ/ خوێ/ ئاوی تەندروستی/ سەرچاوەکان/ ئاسۆی ئابووریی سەرچاوەکان/ نەخشەکان/ بەشی دووەم: ئاسۆی ئابووری- سەرچاوەکانی ئاوی کوردستان/ پێشەکی/ گرینگی ئابووریی ئاوی ڕووبارەکان لە جیهاندا/ ڕووباری دیجلە و لقەکانی/ کێشەی ئاویی و یاسای نێودەوڵەتی/ ئاوی ژێرزەوی لە کانییەکانی هەرێمی کوردستاندا/ ڕووبارە سنوورییەکان/ ڕووبارەکانی دیکەی کوردستان/ پڕۆژەی کاپ (گاپ)/ ئاو- مرۆڤ- ئێستا و ئایندە/ دوا ڕاپۆرتی ڕێکخراوی FAO/ سەرچاوەکان.

**٢٦- کوردستان و کورد**

نووسین: د.عەبدولڕەحمان قاسملوو

وەرگێڕانی لە؟: عەبدوڵڵا حەسەن زادە

بڵاوکراوەی چاپخانەی ڕۆژهەڵات

چاپ: دووەم، چ: ڕۆژهەڵات، ش: هەولێر، ژ.س: ١٩٧، س: ٢٠٠٦، ل:٣٤٩، پ:١٧×٢٤

ناوەڕۆک: بۆ ناوەڕۆکی ئەم کتێبە، بڕوانە کتێبی ژمارە یەک.

**٢٧- مێژووی کۆنی کەرکوک لەبەر ڕۆشنایی دەقەکانی نوزی دا- توێژینەوەیەکی مێژوویی، سیاسی و ئابوورییە**

نووسین: کامەران کوێخا جەلال

بڵاوکراوەی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

چاپ: یەکەم، چ: خانی، ش: دهۆک، ژ.س: ٤٠٤، س: ٢٠٠٧، ل:٢١٣، پ:١٦×٢٢

ناوەڕۆک: ڕوونکردنەوە/ کورتکراوەی سەرچاوەکان/ ناوەڕۆک/ پێشەکی/ تیشکێک بۆ مێژووی دۆزینەوەی تابلۆکانی نوزی/ بەشی یەکەم: کەرکووک لە کۆنترین ڕۆژگارەکانیەوە تا کۆتایی هەزارەی سێیەمی پ.ز/ هەندێ تایبەتمەندێتیی جوگرافی/ پێگە و تۆبۆگرافیا/ ئاووهەوا/ نوزی/ ئەڕاپخا/ کوڕ و خاننی (تل الفخار)/ دانیشتووان/ سوباری/ گوتی/ خوری/ ڕەگەز/ زمان/ دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی خوری لە مێژوودا/ ئایین/ کەرکووک لە کۆنترین ڕۆژگارەکانییەوە تا کۆتایی هەزارەی سێیەمی پ.ز/ چاخەکانی پێش نووسین/ چاخی بنەماڵەکان/ چاخی ئەکەدی/ چاخی گوتی/ چاخی بنەماڵەی سێیەمی ئوور/ بەشی دووەم: باردۆخی سیاسی/ سەرەتای هەزارەی ٢پ.ز تا ١٧٥٠/ دەوڵەت و میرنشینەکان/ بووژانەوەی توڕوکو/ چاخی خوری- میتانی/ شانشینی ئەڕاپخا/ دەوڵەتی میتانی/ میتانی لە سەرچاوە مێخییەکاندا/ باردۆخی سیاسی/ لاوازبوونی میتانیی و چارەنووسی ئەڕاپخا/ بەشی سێیەم: ژیانی ئابووری/ کشتوکاڵ/ پیشە و پیشەسازیی دەستی/ بازرگانی/ دراو

یان ئامرازی مامەڵەکردن/ ڕێگا بازرگانییەکان/ ئامرازەکانی گواستنەوە/ دەرئەنجام/ سەرچاوەکان/ پاشکۆکان/ کورتەی توێژینەوەکە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی.

**٢٨- کورد- کورتەی پێوەندیی کۆمەڵایەتی- ئابووریی، ڕۆشنبیری و گوزەران**

نووسین: لا. م. مینتیشاشڤیلی

وەرگێڕانی لە زمانی ڕووسییەوە و پێشەکی و پەراوێز بۆ نووسین: پ.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

بڵاوکراوەی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

چاپ:. دووەم، چ:. خانی، ش:. دهۆک، ژ.س:. ١٦١٦، س:. ٢٠٠٨، ل:.٣٤٦، پ:.٢٣×١٦

ناوەڕۆک: هەمان ناوەڕۆکی چاپی یەکەمی هەیە، بڕوانە کتێبی ژمارە شەش.

**٢٩- گەشەی ئابووری کوردستان لە چوارچێوەی میکانیزمی دیموکراتیزەکردندا**

نووسین: محەمەد کەریم محەمەد

بڵاوکراوەی مونتەدای ئابووریی کوردستان- یەکێتیی ئابووریناسانی کوردستان

چاپ:. ؟، چ:. ؟، ش:. ؟، ژ.س:. ؟، س:. ٢٠٠٨، ل:.٤٨، پ:.١٥×٢١

ناوەڕۆک: پێڕستی توێژینەوەکە/ سیما بنەڕەتییەکانی ئابووریی کوردستان/ کەرتی کشتوکاڵی/ کەرتی پیشەسازی و تەکنۆلۆجیا/ کێشەی دارایکردن/ بەبازاڕکردن/ سوودمەندی ڕێژەیی/ سیستمی تەشریع و یاسا/ توێژینەوەی ئابووری و سیستمی ئامار/ ئابووریی هاوتەریب/ میکانیزمی پراکتیزەی دیموکراسی لە ئابووریدا/ سەروەریێتی/ دیموکراتیزەکردنی یاسا و تەشریع/ دەستپێشخەری.

**٣٠- نەوتی ناوچەکانی خانەقین و کەرکوک**

نووسین: فەیسەڵ عەلی

بڵاوکراوەی مونتەدای ئابووریی کوردستان- یەکێتیی ئابووریناسانی کوردستان

چاپ:. ؟، چ:. ؟، ش:. ؟، ژ.س:. ؟، س:. ٢٠٠٨، ل:.٨٠، پ:.١٥×٢١

ناوەڕۆک: پێڕستی توێژینەوە/ نەوتی خانەقین/ پێشەکی/ جوگرافیای خانەقین/ پێکهاتەی جیۆلۆجیای نەوتی ناوچەی خانەقین/ مێژووی دۆزینەوەی نەوتی خانەقین/ گواستنەوەی نەوتی نەفتخانە/ کاریگەریی نەوت لەسەر قەزای خانەقین/ دەرئەنجام/ سەرچاوە/ ئابووریی نەوت لە کەرکووک/ جوگرافیای پارێزگای کەرکووک/ پێکهاتەی جیۆلۆجی ناوچە نەوتییەکانی کەرکووک/ گرینگترین کانە نەوتییەکانی پارێزگای کەرکووک/ مێژووی دۆزینەوەی نەوت لە کەرکووک/ پاڵاوگەی نەوتی کەرکووک/

یەدەگی نەوت لە کەرکووک/ بەرهەمهێنانی نەوتی کەرکووک/ گواستنەوەی نەوت/ کۆبەند/ سەرچاوە/ نەخشە.

**٣١- هەولێر لە نێوان سالآنی ١٩١٤- ١٩٣٠ توێژینەوەیەکی مێژوویی یە- دەربارەی بارودۆخی کۆمەلآیەتی و ئابووری و کارگێڕی و سیاسی**

نووسین: مەهدی محەمەد قادر

بلآوکراوەی دەزگای چاپ و بلآوکردنەوەی بەدرخان

چاپ: یەکەم، چ: ڕۆژهەلآت، ش: هەولێر، ژ.س: ١٨٦١، س: ٢٠٠٨، ل:٢٧٢، پ:٢٣×١٧

ناوەڕۆک:

پێشەکی: پ.د.ئەرسەن مووسا ڕەشید/ هێما کورتکراوەکان/ ناوەڕۆک/ پێشەکی و شیکردنەوەی سەرچاوەکان/ کورتەیەکی جوگرافی و مێژوویی هەولێر پێش شەڕی یەکەمی جیهانی/ بەشی یەکەم: هەولێر لە سالآنی شەڕی یەکەمی جیهانی ١٩١٤–١٩١٨/ بەشی دووەم: هەولێر لە سەردەمی داگیرکردنی ئینگلیزدا ١٩١٨–١٩٢٠/ بەشی سێیەم: هەولێر لە سەردەمی ئینتیدابی بەریتانیدا ١٩٢١–١٩٣٠/ بەشی چوارەم: ڕۆڵی هەولێر لە مانگرتن و چالاکییە سیاسی و ڕۆشنبیرییەکان/ ئەنجام/ سەرچاوەکان/ پاشکۆکان: بەڵگەنامەکان– وێنەکان.

**٣٢- بنەماکانی زانستی ئابووری**

نووسین: ئەییوب ئەنوەر سماقەیی

پێداچوونەوە: پ.هۆشیار مەعرووف کاکە مەلا

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٠٣، س: ٢٠٠٩، ل:٢٦٤، پ:٢٢×١٦

ناوەڕۆک:

بەرایی: پ.هۆشیار مەعرووف/ پێشەکی/ بەشی یەکەم: چەمکە سەرەتاییەکانی زانستی ئابووری/ بەشی دووەم: خواست/ بەشی سێیەم: ڕەفتاری بەکارهێن/ بەشی چوارەم: خستنەڕوو/ بەشی پێنجەم: بیردۆزی بەرهەم/ بەشی شەشەم: هۆکارەکانی بەرهەمهێنان/ بەشی حەوتەم: تێچوون/ بەشی هەشتەم: داهات/ بەشی نۆیەم: بازاڕ/ بەشی دەیەم: دەسهاتی نەتەوەیی/ بەشی یانزەیەم: دابەشکردنی دەسهاتی نەتەوەیی/ بەشی دوانزەیەم: دراو/ بەشی سیانزەیەم: دامەزراوەی بانکی و سیستمی دارایی/ بەشی چواردەیەم: بازرگانیی دەرەکی/ ناوەڕۆک.

تێبینی: چاپی یەکەمی دەست نەکەوتووە و لەسەر چاپی شەشەم کە لە ساڵی ٢٠١١ چاپکراوە دانراوە.

**٣٣- پەرەسەندنی کوردستانی نوێ لە ژێر ئاڵای کلتوور دادپەروەری سازش ئابووری رامیاری دەوڵەتی یاسا**

نووسین: جەمیل محەمەد ئەرگوشی

وەرگێرانی لە ؟: سروود قادر و جەمیل محەمەد ئەرگوشی

چاپ: یەکەم، چ: و-رۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ٥٩٥، س: ٢٠٠٩، ل:٦٢٣، پ:١٦×٢٣

ناوەڕۆک: سەرەتا/ بەشی یەکەم: کلتوور لە کوردستاندا/ شۆڕشی کلتووری گەلی کوردستان.../ پەیوەندیی پەرەسەندنی کوردستان بە کلتووری نەتەوەییەوە/ کاریگەریی فێرکردن لە جێبەجێکردنی پرۆسەی شۆڕشی کلتووریدا/ بەشی دووەم: دادپەروەری لە کوردستاندا/ بەشی سێیەم: سازش لە کوردستانی نوێدا/ بەرفرەبوونی چوونیەکی/ بەشی چوارەم: ئابووری لە کوردستاندا/ چەمکی پەرەسەندنی ئابووری/ بەشی پێنجەم: رامیاری لە کوردستاندا/ هزری رامیاری/ بەشی شەشەم: دەوڵەتی یاسا لە کوردستاندا/ تیۆردارێژیی سەبارەت بە دەوڵەتی یاسا و رژێمی دەوڵەتی یاسا/ بناخەی دەوڵەتی یاسامەند/ سەرنجێکی قوڵتر بە ناوەڕۆکی دەوڵەتی یاسامەند و تەواوکردنی تەلارسازی فەرمی/ چاوخشاندنێک بە چەمکێکی بنەڕەتی/ سەرلەنوێ گەڵاڵە کردنەوەی بابەتی دەوڵەتی یاسامەند و پرۆسەکان/ پێڕست/ سەرچاوەکان.

**٣٤- کەرکوک لە سەدەی نۆزدەهەمدا- لێکۆڵینەوەیەک لە بارودۆخی رامیاری و ئابووری**

نووسین: بەختیار سەعید مەحموود شوانی

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک)

چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٩٢٢، س: ٢٠٠٩، ل:٢٥١، پ:١٦×٢٣

ناوەڕۆک:

سوپاس و پێزانین/ ناوەڕۆک/ پێشەکی/ هەندێک بابەتی وەک: دەروازە/ کورتەیەکی جوگرافیای مێژوویی کەرکووک/ یەکەم: جوگرافیای مێژوویی کەرکووک/ دووەم: پوختەیەک لە مێژووی کەرکووک بەر لە سەدەی نۆزدەیەم/ بەشی یەکەم: رەوشی رامیاریی کەرکووک لە سەدەی نۆزدەدا/ یەکەم: سیاسەتی دەسەڵاتداریێتی عوسمانی لە کەرکووک/ دووەم: هەڵوێستی دانیشتوان و رەوتی رووداوەکان/ بەشی دووەم: پەیوەندیی کەرکووک لەگەڵ ئیالەت و میرنشینەکانی دەوروبەری/ یەکەم: پەیوەندی لەگەڵ هەردوو ئیالەتی بەغدا و مووسڵ/ دووەم: پەیوەندیی کەرکووک لەگەڵ قەوارە و میرنشینە کوردییەکان/ بەشی سێیەم: بارودۆخی ئابووریی کەرکووک لە سەدەی نۆزدەدا/ کشتوکاڵ/ پیشەگەریی و چەند لایەنێکی تر/ بازرگانی/ باج و رەسم و دراوەکان/ ئەنجامەکان/ لیستی سەرچاوەکان/ نەخشە و بەڵگەنامەکان.

**٣٥- گۆڕانە ئابوورییەکانی کەرکوک لە ڕوانگەی سەردەمە مێژووییەکانەوە**

نووسین: سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک)

چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٩٦٥، س: ٢٠٠٩، ل:٣١٧، پ:١٦×٢٣

ناوەڕۆک:

پێڕست/ پێشەکی/ بەشی یەکەم: سەردەمەکانی پێش مێژوو/ بەشی دووەم: سەردەمە مێژووییەکان/ بەشی سێیەم: ئەم بەشەی تەرخانە بۆ لێکۆڵینەوەی گۆڕانە ئابوورییەکان لە سەردەمی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام تا ڕووخانی دەوڵەتی (عوسمانی) و هاتنی ئینگلیزەکان بۆ (عێراق)/ بەشی چوارەم: ڕووداوە ئابوورییەکانی سەردەمی ئینگلیزەکان و دروستبوونی دەوڵەتی (عێراق)/ بەشی پێنجەم: جۆرەکانی زەویوزاری کشتوکاڵی (کەرکووک) لە ڕووی چۆنێتیی چاکی زەوییەکەی و لە ڕووی یاساییەوە هەر لە سەردەمی ئینگلیزەکانەوە تا ئەم سەردەمەی ئێستامان/ بەشی شەشەم: سەرچاوە ئاوییەکانی شاری کەرکووک/ بەشی حەوتەم: گەشەکردنی ئاڵوویرە ئابووری و بازرگانییە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی شاری کەرکووک/ بەشی هەشتەم: بەروبوومە ئابوورییەکان/ سەرچاوەکان بەشێوەیەکی گشتی.../ سوپاس و پێزانین/ نووسەر لە چەند دێڕێکدا.

**٣٦- قەیرانی دارایی ئەمریکا و کاریگەرییەکانی لەسەر عێراق و کوردستان**

نووسین: فەیسەڵ عەلی

بڵاوکراوەی مونتەدای ئابووریی کوردستان

چاپ: یەکەم، چ: بابان، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٩، ل:٤٢، پ:١٤×٢١

ناوەڕۆک: پێشەکی/ هۆکارەکانی سەرهەڵدانی قەیرانی ئابووری/ پێشبینی نەکردنی قەیرانی دارایی/ هەنگاوەکانی دەربازبوون لەو قەیرانە/ ئاسەواری قەیرانەکە لەسەر عێراق و ئابووریی کوردستان/ سەرچاوەکان/ کورتەی ژیانی نووسەر.

**٣٧- جوگرافیای ئابووری نەفت لە کوردستاندا**

نووسین: د.عەبدوڵڵا غەفوور

بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی

چاپ: سێیەم، چ: حاجی هاشم، ش: هەولێر، ژ.س: ٥٤٦، س: ٢٠١٠، ل:٣٠٥، پ:١٧×٢٤

ناوەڕۆک: بەرایی چاپی سێیەم/ چاپکردنەوەی ئەم کتێبە بۆ؟: لێژنەی چاپکردنەوەی

کتێب/ بەرایی چاپی یەکەم/ هەمان ناوەڕۆکی چاپی یەکەم و دووەمی هەیە (بڕوانە کتێبی ژمارە هەشت و ١٢) تەنیا لەبری «سەردێڕ» وشەی «سەربابەت»ی بۆ بەشەکان بەکارهێناوە، هەروەها ئەم ناونیشانانەی خستووەتەسەر: خشتەکان، گرافەکان/ وێنەکان/ نەخشەکان/ سەرباری ١: هەندێ لە مەیدانەکانی نەفت لە باکووری کوردستاندا/ سەرباری ٢: هەندێ لە مەیدانەکانی نەفت لە باشووری کوردستاندا/ سەرباری ٣: هەندێ لە مەیدانەکانی نەفت لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا/ سەرباری ٤: هەندێ لە مەیدانەکانی نەفت لە ڕۆژئاوای کوردستاندا/ سەرچاوە و تێبینی/ ناواخن.

**٣٨- ئەتڵەسی پارێزگای هەولێر- مێژوویی، کارگێڕی، سروشتی، مرۆیی، ڕامیاری، ئابوری، ئامار**

ئامادەکردن: هوشیار محەمەد ئەمین ڕەشید خۆشناو، سەردار محەمەد عەبدولڕەحمان

بڵاوکراوەی جوگرافییەکانی تێنووس بۆ چاپەمەنی و نەخشەسازی کارتۆگرافی

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: هەولێر، ژ.س: ٧٣٦، س: ٢٠١٠، ل:١٩٢، پ:٢٢×٣٠

ناوەڕۆک: پێرست/ هەندێک بابەتی وەک: پێشەکی/ هێماکان/ باسێکی مێژووی هەولێر/ پوختەیەک لە جوگرافیای پارێزگای هەولێر/ هەولێر لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ئیبلا/ هەولێر لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ئەکەدی/ هەولێر لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی بابلی یەکەم/ هەولێر لە سەردەمی ئاشوورییەکان/ هەولێر لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی فارسی ساسانی/ هەولێر لە سەردەمی ئەمەوییەکان/ هەولێر لە سەردەمی عەباسییەکان/ هەولێر لە سەردەمی بوەیهییەکان/ هەولێر لە سەردەمی زەنگییەکان/ هەولێر لە سەردەمی ئەییوبییەکان/ هەولێر لە سەردەمی سەلجوقییەکان/ پێگەی هەولێر لە ڕێککەوتننامەی سایکس بیکۆ/ پێگەی پارێزگای هەولێر لە عێراق/ پارێزگای هەولێر لە هەرێمی کوردستانی عێراق/ سنووری یەکە نشینگەکان/ هەولێر لە ویلایەتی مووسڵ ١٩١٨/ لیوای هەولێر ١٩٢٢/ کارگێڕی لیوای هەولێر ١٩٤٧/ پارێزگای هەولێر ١٩٧٠/ بەرزی و نزمی/ چیاکان- زنجیرە و ئاڕاستەکانیان/ دەشتەکانی پارێزگای هەولێر/ دابەشبوونی ڕووەکی سروشتی/ توانستی بەرهەمهێنانی خاک/ دابەشبوونی ئەکتۆنییەکان/ کێڵگە نەوتییەکان- گواستنەوە و پاڵاوگەکان/ سامانی ئاوی سەر زەوی/ دابەشبوونی بەنداوەکان/ هەرێمەکانی ئاووهەوا بەپێی پۆلێنی (کۆپن)/ دابەشبوونی زاراوەکان (دیالیکتیک)/ دابەشبوونی ئایینی (الأديان)/ دابەشبوونی هۆزەکان/ دابەشبوونی هەندێک لە خێڵ و ڕەوەندەکان/ دابەشبوونی زانکۆ و پەیمانگاکان/ بە عەرەبکردن و ڕاگواستنی دانیشتوان/ ناوچە دابڕاوەکان/ نشینگە کیمیا بارانکراوەکانی/ ناوچە ئەنفالکراوەکان/ ئاسەوار و شوێنەوارە دێرینەکان/ ئامارەکان.

**٣٩- ١٠٠ ساڵ مێژووی ئابووری بانە**

نووسین: فەتاح ئەمین زادە

بڵاوکراوەی نشر ئانا- سنە

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سنە، ISBN: ٩٦٤-٦٨٧٦-٨٢-٨، س: ١٣٨٩ (٢٠١٠)، ل:١٢٤، پ:١٤×٢١

ناوەڕۆک:

پێرس/ سەرەتا/ کورتە باسێک لەسەر نەتەوەی کورد کە ڕەگەزی بانەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوان/ چەند ڕووداوی مێژووی بانە/ توێژینەوەیەک لەسەر ناوی بانە/ کورتە باسێک لەسەر جوگرافیای شاری بانە/ مێژووی ئابووریی بانە تا ساڵی ١٣٠٠ک.ه/ مێژووی ئابووریی بانە- دەورانی ڕەزاخانی پەهلەوی ساڵەکانی ١٣٠٠- ١٣٢٠ک.ه/ دەسەڵاتداریی محەمەد ڕەزای پەهلەوی ١٣٥٧-١٣٢٠ک.هـ/ ئابووریی بانە دوای شۆڕشی ئیسلامی/ کشتوکاڵ/ ئاژەڵداری/ بەشی دارستان و دەوەن/ پیشەسازی/ بازرگانی/ کورتە باسێک لەسەر زیادبوونی ڕادەی بازرگانی لەم ساڵانەی دوایی لە بانە/ فەرهەنگۆک/ سەرچاوەکان.

**٤٠- کاریگەرییە ئابورییەکانی جینۆساید لە گەرمیان**

نووسین: گۆران شێخ مستەفا

ڕاوێژکارانی پڕۆژە: عارف قوربانی- خالید سلێمان- هۆشیاری عەبدولعەزیز

سەرپەرشتیاری پڕۆژە: تەها سلێمان

بڵاوکراوەی پڕۆژەی ١٠ کتێب لە بیست و دووەمین ساڵیادی ئەنفالدا

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ١٢٩٧، س: ٢٠١٠، ل:١٩٥، پ:١٤×٢٠

ناوەڕۆک:

پەیڤێک بۆ ئەم پڕۆژەیە: تەها سلێمان/ ناواخن/ پێرستی خشتەکان/ پێشەکی/ تەوەری یەکەم: دەروازەیەک بۆ جینۆساید/ تەوەری دووەم: جینۆسایدی گەلی کورد/ کردەوەکانی جینۆساید لە کوردستانی عێراق/ بەکارهێنانی چەکی کیمیایی/ کردەکانی کۆمەڵکوژی و هەڵمەتەکانی ئەنفال/ ڕاگواستن و کۆچپێکردنی زۆرەملێ/ کوشتنی جۆراوجۆر و دەستدرێژی نێو زیندانەکان/ تێکدان و خاپوورکردنی شار و گوند و ماڵی کورد/ ڕەهەندەکانی کردەوەکانی جینۆساید/ ئابووری/ سیاسی/ کۆمەڵایەتی و دەروونی/ پڕۆسەی جینۆساید لە کەلار/ کاریگەرییە ئابوورییەکانی جینۆساید لە کەلار/ ئەنجام/ ڕاسپاردە و پێشنیار/ سەرچاوەکان/ پاشکۆ (نەخشەکان- بەڵگەنامەکان).

**٤١- هەولێر لە سەردەمی ئەتابەگییاندا- لێکۆڵینەوەی بارودۆخی سیاسی و ئابووری و لەشکری و ئیداری و کلتووریی هەولێری ئەو سەردەمەیە ٥٢٢- ٦٣٠ه/ ١١٢٨- ١٢٣٣ز**

نووسین: پ.د.موحسین محەمەد حسێن

وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: عوسمان عەلی قادر

بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی

چاپ.: یەکەم، چ.: حاجی هاشم، ش.: هەولێر، ژ.س.: ١٠٥، س.: ٢٠١٠، ل.:٤٦٥، پ.:١٧×٢٣

ناوەڕۆک: سوپاس/ هەندێک بابەتی وەک: ئاسۆی ئەم لێکۆڵینەوە و نمایشی سەرچاوە بنەڕەتییەکانی/ دەروازەی یەکەم: مێژووی سیاسی/ بەشی یەکەم: ئەمارەتی میرنشینی هەولێری سەردەمی ئەتابەگی- لە دامەزراندنەوە تا کۆچی دوایی زەینەددین یووسف ینالتگین لە ٥٨٦ه- ١١٩٠ز/ بەشی دووەم: ئەمارەتی هەولێری سەردەمی (موزەففەرەددین گۆگبوری) ٥٨٦- ٦٣٠ک- ١١٩٠- ١٢٣٣ز/ دەروازەی دووەم: مێژووی شارستانێتی هەولێری ئەو سەردەمە/ پلانەکانی شاری هەولێر/ بینا و بارەگاکان کە موزەففەرەددین گۆگبوری لە هەولێر دایمەزراندن/ سەرچاوەکانی گوزەرانی ئابووریی ئەمارەتی هەولێر/ باری ڕۆشنبیری و کلتووری لە هەولێری سەردەمی ئەتابەگیدا/ مزگەوتەکان/ خانەقاکان/ سیستەمی هەڵسووڕاندن و دارایی و دادوەریی ئەمارەتی هەولێر/ سیستەمی لەشکری ئەمارەتی هەولێر/ دراو و سیستەمی دراوی ئەمارەتی هەولێر/ خشتەکان و پاشکۆکان/ کلیلی مادەکان/ پێڕست.

## کتێبی بێ ساڵ

**٤٢- کورد گەلی مەینەتییەکان- ڕەوشی دیمۆگرافی ئابووری و کۆمەڵایەتی کوردەکانی لوبنان**

نووسین: سەلاح عیسام ئەبوشەقرا

وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: جاسم محەمەد محەمەد عەلی

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی خانەی وەرگێڕان

چاپ.: یەکەم، چ.: ڕوون، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٦٢٥، س.: ؟، ل.:١٨٨، پ.:١٤×٢٠

ناوەڕۆک: دەسپێک/ کوردەکانی لوبنان- لە مەنفایەکی ناچارییەوە بۆ نیشتمانێکی ئیختیاری/ پێشەکی/ بەشی یەکەم: کوردستان و کورد/ جوگرافیای کوردستان/ دیارترین وێستگەکانی خەباتی نەتەوەیی کورد لە دوای شەڕی جیهانیی یەکەمەوە/ شۆڕشی کورد بە سەرکردایەتی ئۆجەلان (١٩٨٤- ؟)/ بەشی دووەم: ڕەچەڵەکی کوردەکانی لوبنان/ بەشی سێیەم: لێکۆڵینەوەی دیمۆگرافی دانیشتوان/ بەشی چوارەم: ڕەوشی ئابووری/ بەشی پێنجەم/ ڕەوشی کۆمەڵایەتی/ بەشی شەشەم: کۆچی کوردەکان لە لوبنانەوە/ کۆبەند و ئەنجامگیری/ پێڕستی سەرچاوە و مەراجیعەکان/ پێڕستی خشتەکان/ پێڕستی شێوەکان/ پێڕست (بێ ناونیشان).

یەکێک لەو بابەتانەی لەناو ماڵی ئیسلامییەکانی سەربەهێڵی ئیخوان موسلیمین لە کوردستانی عێراقدا مشتومڕ و ڕای جیاواز و تەفسیری هەمەجۆری ناکۆک و هاودژی بەدوای خۆیدا هێناوە بابەتی ڕێکەوتنی ١٩٨٨/١١/٩ی کرماشان و لێکەوتەکانیەتی. لەو ڕێکەوتەوە تا ئەمڕۆشی لەگەڵدابێت ئەو بابەتە وەک خاڵی سەنتەراڵ بەهۆکاری لێکترازان و دابەشبوونی ئەم هێڵە دێتە ئەژمار، قسە لەسەرکردن و لێکدانەوەی چ وەک نووسینی مێژوو، یان لێکۆڵینەوەی زانستی یان بەدواداچوونی هەندێک لە کارەکتەرکانی ناو لایەنەکانی ئەم دابەشبوونە بەردەوامە. لەسۆنگەی باوەڕ بەوەی خوێندنەوەی دەق لەگەڵ زمانی دەق جیاوازییان زۆرە، بۆیە بەندە وەک شاهێد حاڵ و ئەگەر بشێ بڵێم وەک کارەکتەرێکی ناو ئەم بابەتە لەو سەردەمەی خۆیدا، ئەم ئەڵقەیەی یاداشتەکانمی بۆ تەرخان دەکەم.

ئەگەر هەنگاوێک بێمە دواوە بۆ هەمان بابەتی ئەڵقەی پێشوو دەربارەی ئەوەی ناونرابوو ڕێکەوتن نەک هەر لە ناوەڕۆکدا، بەڵکو لە دەقەکەشیدا بەناوی «بڕیار» هاتووە، هەر لە سەرەتای گۆڕانکارییەکانی پاش ڕاپەڕین و گەڕانەوەی هەردوو لایەنی ئەم بڕیاری ڕێکەوتنە بۆ هەرێمی کوردستان بۆشایی و کەموکورتییەکانی دەرکەوتن، لایەنی هێڵی ڕێکخستنی مامۆستا صدیق بە دەستگرتن بەدەقی بڕیار و لایەنی دووهەمیش هێڵی ڕێکخستنی مامۆستا سەلاح بە پشتگوێخستنی بەو ئیعتبارەی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی دۆخێک بووە کە کات و شوێنی بەسەرچووە.

ئەگەر لەئێستادا پرسیاری مێژوویی لەوە بکرێت، ئەی ئێوەی نوێنەری باڵی ڕێکخستنی مامۆستا صدیق لە کۆبوونەوەکەدا بۆچی ئەم بڕیارەتان بەمشێوەیەی کە هەیە قبوڵکرد، یان شەخسی مامۆستا صدیق کە بڕیارەکەی بەدەست گەیشت، بۆچی قبوڵی کرد؟ کە دواتر پاشگەڕانەوەی لایەنەکانی بۆ کوردستان دنیایەک ئاڵۆزیی و ناکۆکی و دابڕانی لێکەوتەوە و دواجار بە لێکترازان کۆتایی هات؟

ڕەنگە وەڵامی سادە ئەوەبێت نالۆژیکییە ئەگەر داوای وەڵامی ئەم پرسیارە بخرێتە ناو سەنتەری ساتەوەختی گفتوگۆکانی دانیشتی کۆبوونەوەکەوە، چونکە ئاشکرایە هەموو کۆبوونەوەیەکی لەمشێوە کە مەبەستی ڕێکەوتنی نێوان دوولایەنە لەسەر پرسێک، ئەگەر دوو دەوڵەت بن یان دوو حزب و کۆمەڵەی سیاسی یان دوو ڕێکخراو یان دوو کۆمپانیای ئابووریی و بازرگانی و دارایی، یان تەنانەت دوولایەنی کۆمەڵایەتی کە پرس و پێویستییەک کۆیانبکاتەوە، دەبێت خوێندنەوەی ناوەڕۆک ئەنجامەکانی –هەرچییەک بێت– لە هۆکار و دراوەکان و فاکتەرەکانی زەمەنی پێشتری خۆیدا سۆراخی شیکار و لێکدانەوەیان بۆ بکرێن، واتە بڕیار و ڕێکەوتن بەرهەمی کۆمەڵێک دراو و فاکتەر و

هۆكاری پێشتر خەمڵێنراوە كە گوزارشت لە ئیرادە و خواستی ڕاستەقینەی هەردوو لایەن دەكات، لەپێناو گەیشتنە بەرژوەندی هاوبەشی هەردوولایەندا، بەڵگەنەویستە كە پشكی دەسكەوتی هەرلایەک لە ئەنجامی ڕێكەوتن یان بڕیاری هاوبەشیاندا، بەڕێژەی سەنگ و توانا و هێز و كارتەكانی دەستی هەرلایەكیان دێتەدی.

بۆ نموونە: كاتێک باس لە «بڕیار» بەگشتی و بڕیاری سیاسی بەتایبەتی دەكرێت، دەوترێت بڕیار: «هەڵبژادنی گونجاوترین خیارە لە نێوان خیارە لەبەردستبووەكاندا كە ئامانجەكان دێنێتەدی»، واتە ئەو كەسەی بەرپرسی وەرگرتنی بڕیارە كۆمەڵێک یان لانیكەم زیاتر لەیەک خیاری لەبەردەستە بۆ هەڵسەنگاندن و شیكار و دواتر بە بەرپرسیاریەتییەوە یەكێكیان هەڵبژێرێت و ئەنجامەكانیشی لەئەستۆ بگرێت.

بەڵام ئەگەر كەس و كۆمەڵەیەک لە بەردەم جەبرییەتی شەرعییەتی ئینتما بۆ ڕێكخستنێک كە ئیخوان شەرعییەتی پێداوە، تەنها یەک خیار لەبەردەستە، ئیتر مەرج و مانا سەرەتاییەكانی وەرگرتنی بڕیاری تیا نییە، وەک پەندە عەرەبییەكە دەڵێت:(ترید غزال خذ الارنب وترید الارنب خذ الارنب)، وشەی بڕیار جگە لە ناوێک بۆ ناولێنانی پرۆسەكە شتێكی تر نییە. هەروەها كاتێک باس لە «ڕێكەوتن» بەگشتی و ڕێكەوتنی سیاسی بەتایبەتی دەكرێت، دەوترێت ڕێكەوتن:» پێكهاتنی ئیرادەی ئازادانەی دوولایەنە بۆ گەیشتنە كۆمەڵە ئەنجامێک كە بەرژەوەندی هەردوو لایەنی چوارچێوەی پێكهاتنەكە دێنێتەدی». لەم نووسینەی ناومانا ڕێكەوتن، لە خاڵی(٣) بڕگەی(أ)دا هاتووە: سێیەم:-أ- پەیوەندی ڕێكخستن بەهەر تاكێكەوە دەپچڕێ كە پابەندی ئەم فەرمانە نابێت.

لێرە تەنها یەک ئیرادە هەیە، ئەویش ئیرادەی فەرمانەكان و ڕێساكانی ڕێكخستنی ئیخوانی دەرەوەیە كە مامۆستا سەلاح و هاوكارانی نوێنەرایەتیان دەكرد، یەک ئاڕاستە هەیە كە دەبێت سەرلەبەری بیت، ئەگینا پەیوەندیت بەم ڕێكخستنەوە نامێنێ.

بەگەڕانەوە بۆ ئەڵقەكانی پێشوتری ئەم یاداشتە، ناوەناوە هەندێک لەو فاكتەرە خودیی و بابەتییانەی كە بوونە هۆكار و زەمینەخۆشكەری گەیشتنە بەردرگای بڕیاری یەک خیاری ناچاربوون و پابەندیی، بەڕوونی بەرچاو دەكەون، لێرەشدا بە چەند خاڵێک لەسەر دراوە زەمەنییەكانی پێشتر و چڕبوونەوەیان لە ساتەوەختی بڕیاری ڕێكەوتن و ڕۆڵ و ڕەفتاری كارەكتەرە سەرەكەكانی ڕادەوەستم:

**یەكەم: نەبوونی هیچ دۆكیۆمێنت و وەرەقەیەكی نووسراوی واژۆكراو لەسەر ڕێكەوتنی نێوان هێڵی ڕێكخستنی ئیخوانی ناوەوەی عێراق و هێڵی ڕێكخستنی مامۆستا صدیق.**

ڕێكەوتنی نێوان هێڵی ڕێكخستنی مامۆستا صدیق ساڵی ١٩٨٥ لەگەڵ هێڵی ڕێكخستنی ئیخوانی ناوەوەی عێراق، كە لە ساڵی ١٩٨٠بەدواوە (د.عبدالمجید سامەڕایی) ببووە كەسی

یەکەمی و (د.عصام ڕاوی) هاوکاری دەکرد، ڕێکەوتنمان لەسەر متمانەی برایەتی و یەک مەنهەجی و یەکڕەوتی ئیخوانی بوو، کە ئەوان بەناوی نوێنەرایەتی هێڵی ڕێکخستنی ئیخوانەوە ڕوویان لە هێڵی ڕێکخستنی ئێمە کردبوو، ڕێکەوتنمان ڕێکەوتنێکی ئەخلاقی بوو لەسەر ئە پرنسیپانەی سەرەوە دامەزرابوو»، هیچ ڕێکەوتنێکی نووسراوی واژۆکراو لە نێوانماندا نەبووە«، ئەوان زانیارییان لەسەر هێڵ و کاری ئێمە هەبوو، ئاگاداربوون بەوەی ئێمە کۆمەڵێک گەنجی زانکۆ و پەیمانگاکان و ژمارەیەکی کەم کەسی بەتەمەنمان لەگەڵن، بەمانایەکی تر نەوەی سێیەمی ئیخوان و ژمارەیەکی دیاریکراو لە نەوەی دووەم، بەدەوری مامۆستا صدیقەوەین وەک نەوەی یەکەمی ئیخوان لە ناوچەکەدا، ئەوان زۆر ئارەزوومەندی سەرتاسەریکردنی ڕێکخستنەکەیان بوون لە تەواوی عێراقدا، ئێمەش بەگیرهاتبووین بەدەست قەیرانی شەرعییەتەوە لەلایەن برایانی ناوچەکەی خۆمانەوە، ئێمە یەکەم ماڵ و یەکەم هێڵ نەبووین ئەوان سەر بەماڵماندا بکەن، لە ساڵی ١٩٨٣ سەردانی هەڵەبجەیان کردبوو، لەگەڵ مامۆستا سەلاح کە لە ئێرانەوە گەڕابوویەوە کۆبوونەوەیان کردبوو، برایانی هێڵی قەدەغەی ڕێکخستن کە بە ئێمەیان دەگووت کارتان ناشەرعییە و ڕێکخستن بەفەرمانی موراقیبی گشتی ئیخوانی عێراق-دکتور عبدالکریم زیدان- ڕاگیراوە هەمان شتیشیان بەوان وتبوو، ئەگەر ژمارەیەک لە برایانی هێڵی دژە ڕێکخستن، وەک مامۆستا سەلاح و مامۆستا حسن شەمێرانی و ...هتد، ڕێکخستنخواز بووبن و هەستیان بە زەرورەتی زیندووکردنەوەی کار بە ڕێکخستن و ئارەزووی پەیوەندی و خۆڕێکخستنەوەیان لەگەڵ ئەم هێڵەی ڕێکخستنی عێراقدا هەبووبێ، ئەوا لەلایەک لە ناوخۆدا لەسەر ئەم پرسە ناکۆک بوون، لەلای دووەمەوە وەک مامۆستا سەلاح لە یاداشتەکانیدا ئاماژەی بۆ دەکات، لە شێوازی مامەڵەی هێڵی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراق و ڕەفتاریان لەسەر چۆنیەتی پەیوەندیکردن پێیانەوە و داواکارییە زۆرەکانیان لەمان لێیان ڕازی نەبوون.

ئەگەر بە پێوەرە ئیمانییەکان و ئەخلاقی برایەتی ئیسلامی و پرەنسیپەکانی کاری ئیسلامی کە باسی ئیخلاس و عەمەلی ساڵح و چاو لە قیامەت بوونە، ئەو قسە و زانیارییانەی لە شەوی کۆبوونەی بڕیاردا (١٩٨٨/١١/٩) لە گفتوگۆکانی نێوان مامۆستا سەلاح و دکتۆر ئوبوزەڕدا کران -کە لە ئەڵقەی پێشوودا گووتم هەمووی بۆ من تازەبوون- ڕەفتار و کردارەکانی کەسانێک بپێوین ئەو پرسیارە دەوروژێنێ، ئەگەر ئێوە لەو بەروارەوە کە دووساڵی ڕەبەق پێش پەیوەندی هێڵی مامۆستا صدیق، بەهێڵی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراق ئاشنا بوون و دەتانزانی ئەم هێڵی ڕێکخستنە لەکاردایە و خۆشتان هەر لەوکاتەوە جۆرێک لە ڕێکخستنتان سازدابوو، بۆچی بەردەوامبوون

له بەناشەرعی ناساندنی هێڵی ڕێکخستنی مامۆستا صدیق، تەنها لەبەرئەوەی باسی ڕێکخستن دەکەن؟ یان بۆچی ئەم هێڵەتان بەوان نەناساند تا پاش دوو ساڵ مامۆستا سەید ئەحمەد له بەغداوە ببێتە چاوساغ و ڕێپیشاندەریان بۆ لای هێڵی ڕێکخستنی مامۆستا صدیق؟ ئەگەر متمانەتان بە مامۆستا صدیق نەبوو کە دەتانگووت: گوایە ئەهلیەتی بەرپرسیاریەتی ئەم کارەی نییە، خۆ دەتانزانی کۆمەڵێک گەنجی لەخۆی کۆکردوەتەوە و بەهەمان ناوەوە کاردەکات، هیچ نەبێت بۆ سەلماندنی بۆخواکارکردن و نییەت باشی له پاراستنی یەکڕیزی هێڵی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراق کە تازە له ناوچەکەدا کەوتبووە کار و چالاکی، بەو کۆمەڵە گەنجەتان بووتایە ئێوە کە خوازیاری کاری ڕێکخستنی ئیخوانن ئەوەتا ئێمەش ڕێکخستنخوازین و لەبن دەستی ئێوەداین فەرموون کارمان لەگەڵ بکەن؟ هەروەک چۆن ڕەحمەتی مامۆستا ئیبراهیم ڕێشاوی ئەوانەمانی کۆکردەوە کە دواتر بەسێکوچکەی کاری مامۆستا صدیق ناوزەدکراین، بۆئەوەی پێمان بسەلمێنێ ئەم کارەتا هیچ شەرعیەتێکی دەرەوەی خۆتانی نییە و بەهیچ جێگەیەکەوە نەبەستراوە، کارکردن بۆ ئیسلام تەنها ڕێکخستن و بانگەشە بۆ ڕێکخستن نییە، دەشێ هەزاران کار بۆ دینی خوا و گەیاندنی بەخەڵک بکەیت بێ ئەوەی پێویستت بە ڕێکخستن هەبێت؟ با ئێوەش هەمان هەنگاوتان بنایە هیچ نەبێت بۆ ئیقامە حوجە.

وەک شایەتی بۆ مێژووی ئەوکات و ئێستەی دنیا و قیامەت، وەک بەرپرسیارێتییەکی ئەخلاقی، وەک پێشتریش وتوومە، دەڵێم: مامۆستا صدیق بۆ تەنها یەکجاریش بە ئێمەی نەوتووە و لێمان نەبیستووە کە بڵێت: ئەم کاری ڕێکخستنەی ئەو پەیوەندی بە ڕێکخستن یان کەسایەتی یان بەرپرسێکی ئیخوانی دەرەوەی خۆمان هەیە، بەڵام کارکردنی هەموو ئەندام و هەواداری ئەم هێڵە لەژێر گوشاری گوتاری «کارتان ناشەرعییە» و کار بە ڕێکخستن ناشەرعییەدا دەژیاین، ئێمەی هاوکاری دەوروبەری مامۆستا گوشارەکەمان دەخستە سەر ئەو کە دەبێت چارەیەکی ئەم بابەتە بکات، ئەویش لە خەمی چارەسەردا بوو، بە خەبەرزانین لێرە و لەوێ و خەڵک ناردنە بەغدا و موسڵ، تا دواجار ڕێمان لەم هێڵی ڕێکخستنەی ئیخوانی ناوەوە کەوت بە ڕابەرایەتی دکتۆر ئەبوزەڕ. هەموو ئەوانەی دەڵێن: ئیدعای پەیوەندی دەرەوە و ناوەوەیان هەبووە و ئەمەیانکردووەتە ناڕاستییەکی مێژوویی با خۆیان لە دیوانی خودادا وەڵام بدەنەوە.

ڕەنگە تەنها وەڵامێک بۆ ئەم پرسیارانە کە بیانوو و پاساوی جگەلەوە هەڵناگرێت، زاڵبوونی ڕەگەزی خۆیەتی –زاتی– و شەرعاندنی شەڕی کێ دەبێت ڕابەر و مورشید بێت بوو، لەژێر لافیتەی کاری ئیسلامیدا، تاکە وەڵام و سەرچاوەی ڕوودانی ئەم هەموو ڕیس و گوریسە بوون.

ئێمە وەک نوێنەری هێڵی ڕێکخستنی مامۆستا صدیق، بێ بەدەستەوەبوونی هیچ

نووسراوێک یان دۆکیۆمێنتێک لەسەر ڕێکەوتنمان لەگەڵ هێڵی ڕێکخستنی عێراق، کە ئەرک و ڕۆڵ و پابەندییەک بۆ لایەنەکانی دروستبکات و جێگەی قسەیەکمان بۆ بکاتەوە چووینە ناو کۆبوونەوە، سەرباری ئەمە و لەمەش خراپتر هیچ زانیارییەکمان دەربارەی چۆنیەتی و سەرچاوەی بڕیاری کارکردنی ڕێکخستنی ناوەوەی عێراق و پەیوەندیان لەگەڵ ڕێکخستنی دەرەوە و کەسایەتییە و دەزگای کارکردنی ئەم ڕێکخستنەی دەرەوە نەبوو.

**دووەم: گۆڕینی ڕێڕەوی کاری ئیخوانی لەلایەن مەرحومی مامۆستا مەلا عوسمانەوە وەک ئەمیری هێڵی ئیخوان لە کوردستاندا.**

> **مامۆستا صدیق بۆ تەنها یەکجاریش بە ئێمەی نەوتووە و لێمان نەبیستووە کە بڵێت: ئەم کاری ڕێکخستنەی ئەو پەیوەندی بە ڕێکخستن یان کەسایەتی یان بەرپرسێکی ئیخوانی دەرەوەی خۆمان هەیە**

لە ڕێکەوتنی نێوان هێڵی ڕێکخستنی ناوەوەی عێراق و هێڵی ڕێکخستنی مامۆستا صدیقدا- کە تەنها دووخاڵی زارەکی بوون- یەکێک لەو دووخاڵە کە بۆئەوان زۆرگرنگ و جێگەی بایەخ بوو، متمانەشیان بەکارکردن لەگەڵ ئەم هێڵە زیاتر و قوڵتربوویەوە، قبوڵکردنی ئەمیری کاری ڕێکخستنی ئیخوانی کوردستان بوو لەلایەن مەرحومی مامۆستا مەلا عوسمانەوە، بۆ هەمان مەبەست لە مانگی ئەیلولی ١٩٨٥ مامۆستا چووە شاری موسڵ و بەیعەتی پێدان، - وەک لە سەرەتای نامەکەی دکتور نوعمان سامەڕایشدا ئاماژەی پێکراوە- لە پەرەسەندنی دواتری ڕووداوەکانی شاری هەڵەبجە و کۆچکردنیان بۆ کۆماری ئیسلامیی ئێران، مامۆستا فتوای جیهاد و چەک هەڵگرتنیدا و بوویە ڕابەری گشتی بزوتنەوەی ئیسلامیی لە کوردستانی عێراق و لە ئەڵقەکانی پێشوودا باسی نامەکەی ڕێکخستنی دەرەوەی ئیخوانی عێراق و هەڵوێستیان بەرامبەر فەتوای جیهادی مامۆستا و پرسی چەکهەڵگرتن و دواجار بەڕای ئەوان ئەبێ چی بکات خرابووە ڕوو.

مامۆستا پشتیوانێکی مەعنەوی گەورە بوو لە کاری ئێمەدا، بەتایبەت لە کێشەی تانەدان لە شەرعیەتی کاری ڕێکخستنی ئێرە، هەمیشە ئەیگووت کاری ئیسلامی و کار بۆ بەرزڕاگرتنی دینی ئیسلام، ڕێکخستن وەسیلەیەتی شەرعیەتی گەرەک نییە، مەنهەجیەت و دەستگرتن بەو مەدرسەوە شەرتە.

تێگەیشتنی هەرلایەک هەرچی و هەرچۆن بێت لەسەر ڕۆڵی مامۆستا مەلا عوسمان لەکاری ڕێکخستنی نهێنی و مەنهەج و بڕیاری پراکتیک و هونەری سیاسەتکردندا، هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێت کە بە نەمانی ئەو هێڵی ڕێکخستنی مامۆستا صدیق لە بڕیاری قیادە مێژووییە کۆنەکەی ئیخوانی دەرەوەدا، گەر نەڵێم کوژایەوە، بەدڵنیاییەوە دەڵێم ڕۆڵی ئەوتۆی نەما، بەم ڕووداوە ئیتر ئەوان، ڕوانینیان بۆ هێڵی مامۆستا صدیق بوویە مامەڵەی تاکەکەسی، دکتۆر ئەبوزەڕیان ڕاسپاردبوو مادەم لەگەڵ مامۆستا مەلا عوسمان نەچوون و ئیدیعای ئینتما بۆ ئیخوان دەکەن فەرموون ئەمە بڕیاری ئێمەیە و پابەندبن بەڕێکخستنی ئیخوانی عێراق لە ئێراندا بەقیادەی ئەبو پەیام.

**سێیەم: شکستخواردنی دکتۆر ئەبوزەڕ لە بەرانبەر ڕێکخستنی ئیخوانی دەرەوە و مامۆستا سەلاحدا:**

وەک پەندە کوردییەکە دەڵێت: «ئومێدمان بەوەیس بوو وەیش بەسوننی دەرچوو»، شمشێری دەبانی دەستی ئێمە لەم موناقەسە و خۆبەدەستەوە نەدانە بەکاری هێڵی مامۆستا سەلاح لە ئێراندا، دکتۆر ئەبوزەڕ بوو چاوەڕوانیمان لێی هەبوو، بەڵکو بەهۆی ڕۆڵی ئەوەوە بگەینە کۆمەڵە مەرج و سازانێک شتێک لە خواستی ئێمەی تیا ڕەچاو بکرێت. بەر لە قسەکردن لەسەر شکستخواردنە دوو لایەنەکەی دکتۆر ئەبوزەڕ، با سەیری خاڵەکانی ڕێکەوتنی نێوانمان بکەین بزانین چی ماوەتەوە، ئەوجا لەوە تێدەگەین وەک ڕێکەوتنەکەمان ئەخلاقی و بێ نوسراوی واژۆکراوی نێوانمان بوو، هەوڵەکانی ئەمیش بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییەکی گونجاوی ئێمە لەگەڵ هێڵی ڕێکخستنی دەرەوەی عێراق لە ئێراندا بەڕابەرایەتی مامۆستا سەلاح، بەهەمان شێوە کارێکی ئەخلاقییە و هەست بە بەرپرسیارێتییەکی ویژدانییە و ڕەنگە بکرێ بڵێین ڕوڵێنانی ئێمەی هێڵی مامۆستا صدیق ناچاری کەوتنەناو ئەم بێنە و بەرەیەی ئیخوانە کوردەکانی یەک ناوچەی کوردستان، کە زۆربەشیان خەڵکی یەک شاربوون.

لە دوو خاڵەکەی ڕێکەوتنی زارەکی و ئەخلاقی نێوانمان، یەکەمیان وەک لە خاڵی یەکەمی سەرەوەدا ئاماژەم بۆ کرد «دانانی مەرحومی مامۆستا مەلا عوسمان بوو وەک ڕابەری ڕێکخستنی ئیخوانی کوردستان». ئەوە کۆتایی هات و خاڵی یەکەم هەڵوەشایەوە.

خاڵی دووەم:» ڕێکخستنی هێڵی مامۆستا صدیق تەنها نوێنەری هێڵی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراق بێت لە کوردستاندا»، دیارە ئەمە بە عەمەلی نەکرا، چونکە چەندین کەس و گرووپی ڕێکخستنخوازی دەرەوەی هێڵی قەدەغەی ڕێکخستن لە هەڵەبجە و شارەکانی تر، پێش پەیوەندی ئێمە یان دوای ئێمە، کە هەندێکیان نزیک و هاوڕای مامۆستا سەلاح بوون لە ئێرانەوە ئاڕاستەی دەکردن، پەیوەندییان پێوە کردبوون، بەگوێرەی ڕێکەوتن لەلایەن مامۆستا صدیقەوە ئەم بابەتەیان لەگەڵ خرایەبەر گفتوگۆ، گوتیان دەبێت سەبر

بکەین تا بە تێپەڕبوونی کات هەموولایەن لەیەک چوارچێوەدا قاڵب دەگرین و شێوازی کاری نویێ یەکڕەنگمان دەکات، وەک خۆیان هەمووجار دەڵێن: تا دڵەکان لەیەکتر نزیک دەبنەوە و حەساسیەتی کۆن نامێنێ، پابەندی بە بڕیارەکانەوە دروست دەبێت، ئەوکاتە قسەکردن لەسەر یەک چوارچێوە بۆ ڕێکخستنی ئیخوانی کوردستان ئاسان دەبێت، بۆ نیشاندانی ڕاستگۆییان، لەم ماوەدا هەماهەنگیان لە نێوان مامۆستا صدیق و دکتور محەمەد ئەحمەد و کاک هیوا و بەشێوەیەک لە شێوەکانیش لەگەڵ مامۆستا حەسەن شەمێرانیدا دروستکرد.

ئەم هێڵەی ڕێکخستنی ئیخوان لە ناوەوەی عێراق، تەواو قاڵ و شارەزا ببوون، لە کێشە و گرفتەکانی دابەشبوونی ئیخوان پاش بڕیاڕی هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخستنەکەیان، بەسەر باڵ و هێڵ و خەت و گرووپی فلان و تاقمی فلان مامۆستادا، لە هەموو شارە سوننییەکان و لە بەسرەشدا سەد ئەوەندەی ناوچەکەی ئێمە ئاڵۆز و ناهەمواریی و کێشەیان هەبوو، تاڕادەی پەلاماردانی یەکتریی و دەستەویەخەبوون، وەک ئەبوئیمان لەموسڵ بۆی باس دەکردم.

لەم دۆخەی ئێستای هێڵی ڕێکخستنی مامۆستا صدیق لە ئێراندا خاڵی دووەمی ڕێکەوتنەکەش لە حوکمی هەڵوەشاوەدایە.

ڕاستییەکی نوکتە ئامێز: هەندێ کەس هەبوون لەم نێوانە ئاڵۆزەی دوو هێڵی ڕێکخستن و هێڵی بنەڕەتی قەدەغەی ڕێکخستن، لەژێر پاساوی «لەبەرخوا و لە خەمی نەفەوتانی گەنجەکان و لەبەر پەرەدان بەکاری ئیسلامی و لێکنزیکردنەوەی دڵەکان و دانەبڕانی براکان لەیەکتر » لە هەموو لایەک ئامادەییان هەبوو! بە هەموو زمانەکان قسەیان دەکرد! ئاویان بە هەموو ئاشەکاندا دەکرد؟ لە هێڵی قەدەغەی ڕێکخستن نەفەریان وەردەگرت، لە هێڵی ڕێکخستنی عێراق وەک ئەندام ڕێکیان دەخستن، لەگەڵ هێڵی ئێمەش وەک ژمارەی ئەندامی گرووپ و هێڵ دەیانهێنانە ئەژمار بۆ حساب بۆ کردن؟

ئێمەی هێڵی مامۆستا صدیق حسابمان بۆ ئەوە نەکردبوو کە دکتۆر ئەبوزەڕ وەک شەخسی سەرکردە خۆی بووەتە کارتێکی سووتاو، هەموو کارتەکانی دەستیشی سوتاون، هۆکارەکانی لاوازبوونی هەڵوێست و پێگەی دکتۆر دووبەشن، هەریەکەشیان هۆکار و چوارچێوەی تایبەت بەخۆیان هەیە.

یەکەم: شکستخواردن لای بەرپرسانی ڕێکخستنی ئیخوانی دەرەوە، لەم چەند خاڵە سەرەکییەدا کورت دەبنەوە:

١- ڕێکخستنەکانی ناوەوەی عێراق کە دکتۆر بەرپرسی یەکەمیان بوو، ئاشکرا بوون، ژمارەیەکی بەرچاویان گیران، (٤٩) کەسیان بە حوکمی ئیعدام و زیندانی درێژماوە حوکمدران، بەشێکی زۆر لە ئەندام و هەوادارانیان ڕاوەدوونران و لەدەستی ڕژێمی

بەعس هەڵاتن و ئاوارەی وڵاتانی ئێران و تورکیا و شوێنەکانی تر بوون.

٢- ئەم ڕووداوانە هەڵوێستی هێڵی بنەڕەتی دژە ڕێکخستن و ڕێکخستن قەدەغەیەی بەهێزکرد و جارێکی تر بوویە هۆی ڕاستاندنی پاساوەکانی دکتۆر عبدالكریم زەیدان لە هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخستندا، وەک بڵێت: ئەها چیتان بەسەر مسوڵمانانداا هێنا، نەمگووت دەست بۆ کاری ڕێکخستن مەبەن؟

٣- ڕێکخستنی ئیخوانی دەرەوەی تووشی ئیحراجییەکی گەورە کردبوو لە بەرانبەر دکتۆر زەیدان و ڕای گشتی هێڵی ڕێکخستن قەدەغەیە، وەک ئەوەی هەرکەس لە فەرمانی ئەمیری جەماعەت دەرچوو، ئەوا دەبێت باجەکەی بدات، ئەگەر دورتر بڕۆین و قسەکە فراوانتر بکەین، دەکرێ وەک خیانەت لە بەیعەت و دەرچوون لە فەرمانی موراقب عام لێکبدرێتەوە.

٤- ڕێکخستنی ئیخوانی دەرەوەی ناچاری هەوڵ و گەڕان بەدوای واسیتە و دەستەوداوێن بوونی حزبە ئیسلامییەکان و حکومەتانی وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامیی کردبوو، بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەکی کاریگەر لەسەر سەدام حسێن و حیزبی بەعس و ڕاگرتنی بڕیارەکەیان لەسەر حوکمدراوەکان، کە دواجار ئەنجامێکی ئیجابی لە دابەزاندنی حوکمەکان لێکەوتەوە.

٥- ئەو هەنگاوەی کە قیادە مێژووییەکەی ئیخوانی عێراق لە دەرەوە بەگشتی، چ لایەنگرانی ڕێکخستن و چ دژە ڕێکخستن بەخاڵێکی ئیجابی و دەسکەوت سەیریان دەکرد، لە کاری هێڵی ڕێکخستنی ناوەوە بەڕابەرایەتی دکتۆر ئەبوزەڕ، و بە گۆڕانێکی نەوعیان دەزانی لە پەیوەندیکردنی بە هێڵی مامۆستا صدیقەوە، هاتنە ناوەوەی مامۆستا مەلاعوسمان و بەیعەتدانی بوو لەسەر کارکردن لەگەڵ ئەم هێڵەی ڕێکخستنی ناوەوە، وەک زانایەک لە کەسایەتییە مێژووییەکانی ئیخوانی عێراق - وەک لە نامەکەی دکتۆر نعمان سامەڕییدا دیارە- ئێستە دکتۆر ئەو کەسایەتییەشی لەدەستچووە، و ڕێبازی کاری میانەڕەویی و دور لە چەکی ئیخوانی بەجێهێشتووە.

دووەم: هۆکارەکانی شکستخواردن بەرامبەر مامۆستا مامۆستا سەڵاح

١- لەدەستدان و سڕانەوەی هەموو پێگە و بەرپرسیارێتییەکی ڕابردوویی و بوونی بە تاکە کەس

د.نعمان سامەڕایی لە دیمانەیەکیدا لە ٢٠١٤/٢/١٣دا لەگەڵ محەمەد حسام ئەلحسینی نووسەری کتێبی(حزب و جوڵانەوە ئیسلامییەکانی عێراق لە نێوان ئۆپۆزسیۆن و دەسەڵاتدا، ل٩٨)، دەڵێت: لە ساڵی ١٩٨٠وە عبدالمجید سامەڕایی کاروباری ڕێکخستنی جەماعەتی لە ناوخۆدا گرتەدەست، ئاشکرایە ئەم لێدوانە ناکۆکە لەگەڵ هەموو ئەو قسانەی باس لە مۆڵەتی دەرەوە بۆ ناوەوە دەکەن و باسی ئەیاد سامەڕایی لە دوای ئەو ڕێکەوتە

دێننە بەرباس، دواجار ڕاستییە ونبووەکەی نێوان ئەم باڵباڵێن و هێڵهێڵێنە هەرچییەک بێت کێشەی ئێمە نییە، ئێستە ئەم پیاوە لە وڵاتی ئێراندا، هیچ نازناو و پێگەیەکی بەدەستەوە نەماوە، بووەتە کەسێکی ڕێکخستنی ئیخوان لە دەرەوە، لەژێر ڕەحمەتی بڕیاری ڕابەری ئەم ڕێکخستنەدایە چ ئەرک و کار و ڕۆڵ و پێگەیەکی بۆ بڕیار دەدات، دەبێت بێ چەن و چون پێوەی پابەند بێت، ئێستا سێ ڕێگەی لەپێشە یان دەبێت لە شارێکدا نیشتەجێ ببێت و کەنار بگرێت و باسی هیچ نەکات و کاری بەسەر هیچ کارێکی ئیخوانەوە نەبێت، یان دەبێت ئیلتحاق بکات و پابەندی سەرلەبەری ئەو فەرمان و بڕیارانە بێت کە لێپرسراوی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراقییەکانی ئێران بۆی دیاری دەکەن، یان دەبێت لەم وڵاتە بچێتە دەرەوە، کە سەرەنجام ئەمەی دواییانی هەڵبژارد.

٢-بەدڵنیایی لە زاکیرەی هەردوو کەسەدا، شێوازی مامەڵە و ڕەفتاری دکتۆر ئەبوزەڕ وەک بەرپرسی ڕێکخستنی ناوەوە و دکتۆر عصامی هاوکاری، لە ساڵەکانی ١٩٨٣و کۆتایی ساڵی ١٩٨٤ لەوەش بەدواوە هەرماوە، کە بەنەفەسی بەرپرس مامەڵەکردن و لەسەرەوە ڕوانین، فەرمان پێکردن و داواکاری زۆر لە برایان و هاوکارانی مامۆستا سەلاح لە ناوەوە، ئێستا ئاوێنەی زەمەن و ڕووداوەکان وێنەکەی ئاوەژوو کردوەتەوە.

٢- ڕازی نەبوون و نیگەرانی مامۆستا سەلاح لە ڕێکەوتنەکەی نێوان هێڵی ڕێکخستنی مامۆستا صدیق و دکتۆر ئەبوزەڕ لە ناوخۆی عێراق، بەڕێکەوتنێکی ناقۆڵای ناوزەد دەکات، لەلایەک بە مامەڵەیەکی سیاسی ناوی دەبات، سەبارەت بەو خاڵەی ڕێکەوتنی نێوان هەردوولا، کە دەڵێت:» ڕێکخستنی هێڵی مامۆستا صدیق تەنها نوێنەری هێڵی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراق بێت لە کوردستاندا»، بۆچوونی حساب بۆ کەسی تر نەکراوە مەگەر بە«شوێنکەوتەیی و ئیلتیحاق»، هەروەک سەبارەت بەخاڵی «دانانی مەرحومی مامۆستا مەلا عوسمان وەک ڕابەری ڕێکخستنی ئیخوانی کوردستان»، بۆچوونی ئەمە هەڵخەڵەتاندێکی زۆرە و پاشقولێکی گەورەیە لە برایانی ئەو، هەر لە بناغەوە هەڵەیەکی گەورە بووە و....هتد. دەکرێ هەرئەوەندە بڵێین: مامۆستا سەلاح پاش ئەو هەموو گفتوگۆ و دانوستانە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆیەی مامۆستا صدیق و دکتۆر ئەبوزەڕ، لە ئێستەی ئەم بڕیاری ڕێکەوتنەدا، وەڵامی پاشقولە گەورەکەیان دەداتەوە جگەلە «شوێنکەوتەیی و ئیلتحاق» بەهیچی تر ڕازینەبوو، چونکە وەک دەڵێت: چارەیەکی تریان لە بەردەمدا نییە ئەگەر بیانەوێت لە ڕیزی برایاندا بن.

٣- لاوازی یان نەبوونی متمانەی مامۆستا سەلاح بەو قسە و گفتوگۆ و بۆچوونانەی کە دکتۆر ئەبوزەڕ لە هێڵی مامۆستا صدیق و شەخسی مامۆستاوە دەیگەیاندە لای ئەو، چونکە پێیوابوو مامۆستا پێیەکی لای براکان و بنەماڵەکەیەتی لەناو بزوتنەوەدا و پێیەکەی تری لای ئیخوانە، وەک خۆی دەیگووت: ئەم دوو فلیقانەییەی بۆ ناچێتەسەر و هیچ

لایەکیشمان ڕازی ناکات، پاشماوەیەک لە هاتنی نامەکەی ڕێکخستنی ئیخوانی دەرەوە بەناوی دکتۆر نعمان سامەڕایی، لێکەوتەکانی و دروستبوونی مقۆمقۆ و ئاڵۆزییەکی زۆر، خودی مامۆستا سەلاح دەچێتە ماڵی مامۆستا صدیق و پێی دەڵێت: «تۆ لە ماڵی خۆت و من لە ماڵی خۆم»، ئەم قسەیە ئارەزوویەکی توندی لە کۆڵکردنەوە و کردنەدەرەوەی مامۆستا صدیقی لە ڕیزی کۆمەڵەی ئیخوانی لەخۆدا حەشارداوە، ئەم میانە زۆرەی بێ متمانەیی و ناکۆکی مێژوویی لەگەڵ یەکتر بە دکتۆر ئەبوزەڕ چارەسەر نەدەکرا.

٥- لە ئێستای هەوڵی ڕێکەوتن و یەکخستنەوەی نێوماڵی ئیخوان لە دەرەوە و ئاوارەییدا، مامۆستا سەلاح باکی بەوە نەبوو ئەم هێڵی مامۆستا صدیقە ڕێککەون یان نا! هەربۆیە بۆ بەیەکجاری نوزە بڕینی دکتۆر ئەبوزەر و کۆتایی هێنان وەک دەڵێن: بە مەساعی حمیدەکەی، گومانی خستبووە سەر شەرعییەتی کاری ڕێکخستنی چەند ساڵەی خۆشی لە ناوەوەی عێراقدا، وەک خۆی دەڵێت: خستبووی بە کۆسی خۆیدا. ئەویش بەدەستبڕا و ئەگەر ڕوونتر بڵێین درۆ لەگەڵ کراو دەرچوو، بۆ تێپەڕاندنی قۆناغێکی کۆمەڵەکە لەعێراقدا.

> **ئێمەی هێڵی مامۆستا صدیق حسابمان بۆ ئەوە نەکردبوو کە دکتۆر ئەبوزەڕ وەك شەخسی سەرکردە خۆی بووەتە کارتێکی سووتاو، هەموو کارتەکانی دەستیشی سوتاون.**

بەگشتی ئەم خاڵانە هۆکاری سەرەکی بوون لە دروستنەکردنی هەرجۆرە قەناعەتێک لەلایەن دکتۆر ئەبوزەڕەوە بۆ قیادەی ئیخوانی دەرەوە دەربارەی هەرجۆرە سازانێک لەگەڵ هێڵی مامۆستا صدیق، هەروەها نەیتوانی مامۆستا سەلاح ڕازی بکات جگەلەوەی لەو خاڵانەی سەرەوەدا ئاماژەی بۆکراوە.

پاش بڕیاری ڕێکەوتنی ١٩٨٨/٩/١١ی کرماشان، دکتۆر ئەبوزەڕ خیاری ئێران بەجێهێشتنی جێبەجێ کرد، وڵات بە وڵات تا لە بەریتانیا گرسایەوە، و دەستیکرد بەردێژەدان بەخوێندی باڵا لە پسپۆڕییە پزیشکیەکەیدا و دواتر لە عەممانی پایتەختی ئەردەن جێگیر بوو، لەم ساڵانەی دواییدا تووشی نەخۆشی درێژخایەنی شۆکی جەستە هاتبوو، دواتر لە شاری لەندەن بە پەتای کۆرۆنا وەفاتیکرد و تۆماری پێچرایەوە بۆ دیوانی خودا.

له کێشەکانی هێڵی یەک و دووی ئیخوانی ناو کوردستاندا ناو و باسی ئەم پیاوە نەهاتە ناوناوان، لە پەیوەندییە نوێیەکانی پاش سەرەتای نەوەدەکان لەگەڵ قیادەی ئیخوانی دەرەوە وەک سەردانی محەمەد ئەحمەد ڕاشد و د.عادل شوەیخی ڕەحمەتی، دواتر پاش ڕاگەیاندنی یەکگرتوو و سەردانی وەفدەکانی حیزبی ئیسلامی بۆ هەرێمی کوردستان و سەردانی حیزب و سەرکردەکانی هەرێم، هیچ باس و خواسێک لەم پیاوە و ڕۆڵ و کاریم بەرگوێ نەکەوتەوە، بیستم پاش گۆڕانی ڕژێم لە ٢٠٠٣ و سەرلەنوێ خۆڕێکخستنەوەی حزبی ئیسلامیی و دەستبەکاربوونیان لەکاری سیاسیی و بەشداری پرۆسەی سیاسی، سەردانی حزبی ئیسلامی و کۆمەڵەی ئیخوانی کردبوو، لە چەندین کۆبوونەوەدا بەشداری کردبوو، بەڵام کەس ئاوڕێکی بەخێری لێنەداوەتەوە وەک کورد دەڵێن: کەس لوتی پیانەهێناوە!!

### چوارەم: گرەوکردنی مامۆستا صدیق لەسەر خاڵی یەکەمی بڕیارەکە

مامۆستا صدیق لە سەرەتاوە زۆر باکی بە خۆگونجاندن و سازاندن لەگەڵ ڕێسا و بنەماکانی کاری قیادەی ئیخوانی دەرەوە و بەرپرسی ئەو قیادەیە لە ئێراندا نەبوو لەلایەک سەرگەرمی بەدەمەوەبوونی مامۆستا عوسمانی براگەورەیەوە بوو وەک ڕابەری بزوتنەوەی ئیسلامیی، لەلایەکی ترەوە هەمیشە چاوی لەسەر گەڕانەوە بۆ کوردستان و کاری ناوەوەی کوردستان بوو، لەگەڵ ئەوەی لەو ساتەوەختەدا دۆخە سیاسییەکەی عێراق و کوردستان و تەنانەت حیزبە سیاسییەکانیش ڕاوەستانێکی کوشندە بەسەریدا زاڵبوو، ئاماژەیەکی ئەوتۆی بەئاڕاستەی گۆڕانکاری بە ئاقاری ئیجابی پێوە دیارنەبوو.

لە سەروبەندی گەڕانەوەی دکتۆر ئەبوزەڕ لە پاکستانەوە و هێنانی فەرمانی سەرکردایەتی ئیخوانی دەرەوە کە حەتمیە دەبێت پابەندبن، ڕۆژێک مامۆستا صدیق و دکتۆر ئەبوزەڕ و مامۆستا محەمەد ڕەئوف و بەندە لە کرماشان دیدارێکمان کرد، قسەی زۆرکران لەسەر زەرورەتی پابەندبوون بەکاری ئیخوانی ئێران و سەرکردایەتییەکەی و دەرنەچوون لە بڕیاری سەرکردایەتی ئیخوان و پێویستە ئەم قۆناغە بە ئارامی و خۆگری تێپەڕێنین ....هتد. پاشان مامۆستا و دکتۆر لە ئێمە جیابوونەوە و چوونە ناو مزگەوتی زەردۆییەکان(تیرەیەکن لە عەشیرەتی جاف) بۆ گفتوگۆی تایبەتی خۆیان، کە هاتنەوە لای ئێمە مامۆستا گووتی: تا خاڵی سفر لەگەڵ ئەم ڕێکەوتنە دەڕۆم و قبوڵی دەکەم! جگەلەوەی کۆمەڵێک وەسفی دکتۆری کرد کە پیاوێکی نەجیبە و خاوەنی قسە و عەهدی خۆیەتی، لەو گفتوگۆیەی چووبوو بە نێوانیاندا کە زیاتر لە کاژێرێکی خایاند هیچی نەدرکاند.

دکتۆر ئەبوزەڕی ڕاسپاردبوو کە ئەگەر ئەو خاڵە جێگیر بکرێت ئێمە خەمێکی ترمان نییە، خاڵەکەی خواستی ئەو لە خاڵی یەکەمی بڕیاری ڕێکەوتنەکەدا جێگیر کرا، کە

دەقەکەی دەڵێت: یەکەم: پابەندیی هەموو برایانی کاری ئیخوان لە ناوخۆی عێراقدا بەرامبەر سەرکردایەتی گشتی کاری ڕێکخستنی ئیخوان دەبێت لە عێراقدا.

دەقی ئەم خاڵەی کە مامۆستا صدیق ماڵی لەسەرکردبوو بۆ داهاتوو، لەلایەک شتێکی بەڵگە نەویستە، ئەگەر ڕۆژگارێک هاتەپێشەوە و ڕێکخستنی گشتی ئیخوان موسلیمینی عێراق، کەوتەوە کارکردن لە ناوخۆی عێراقدا نەک هەر هێڵی مامۆستا صدیق و مامۆستا سەلاح، بەڵکو هەموو ئەوانەی ئینتمایان هەیە بۆ کۆمەڵەی ئیخوانی عێراق دەبێت پابەندی ئەو ڕێکخستنەبن. لەلای دووەمەوە وای بۆدەچم مامۆستا لە گفتوگۆکەی کرماشاندا وای مەزەندە کردبوو، کە ئەم هێڵی ڕێکخستنەی ناوەوەی عێراق کە ئێستە دکتۆر ئەبوزەڕ بەرپرسی یەکەمیەتی، خاوەن بڕیار یان لانیکەم یەکێک دەبێت لە سەرکردە خاوەن بڕیارەکانی داهاتووی ڕێکخستنی گشتی ئیخوان، بەمەش پێگە و ڕۆڵی خۆی و هێڵی ڕێخستنەکەی پارێزراو دەبن.

بەڵام وەک لای هەمووان ڕوونە کە بای ڕووداوەکانی کوردستان و عێراق لە پاش ڕاپەڕین و بڕیاری ٦٨٨ی نەتەوەیەکگرتووەکان دەربارەی گەلی کورد لە کوردستانی باشوور بە ئارەزووی گەشتیەکەی مامۆستا هەڵی نەکرد.

پێنجەم: مامۆستا لە قوڵایی دەروون و ویژدانیدا زیاد لە ئەندازە هۆگر و پابەندی مەنهەج و ڕێبازی کاری کۆمەڵەی ئیخوان موسلیمین بوو، ئێمە کە چەندین ساڵ بە شەو و ڕۆژ لە خزمەتیدا بووین، نەک هەر ئەوەمان دەرک کردبوو، بەڵکو کردبوویە بەشێکی نەگۆڕ لە بیرکردنەوە و تێگەشتن و وێناکردنی ئێمەش بۆ ئەم کۆمەڵەیە، ئامادە نەبوو بە هیچ شتێکی بگۆڕێتەوە، نەک هەر پابەندی ڕۆحی ئەم مەدرەسەیە بوو وەک خۆی دەیگووت، بەڵکو بۆچوونی وابوو توانایەکی گەورەی عەقڵیی و فیکریی و سیاسیی و مرۆییان لەبەردەستە، بۆچوونی وابوو زانیاریی و ئاگابوونیان لە ڕووداو و گۆڕانکارییەکانی جیهان هەیە، هەروەها دەیگووت: بەڵام بەداخەوە ئێمە لەم عێراقە و لە سایەی ئەم دکتاتۆرەدا بەگیرهاتووین و دەستمان ناگاتە لایان وەک خۆی، لەوەش زیاتر دەیگووت: بەغەیری ئەمانە ئوممەی ئیسلامیی ناگاتە ئیستئنافی حەیاتی ئیسلامی، جگەلە کتێب و نووسینی کەسایەتییەکانی ئەوان دەربارەی کاری ئیسلامیی بایەخی بەبیر و نووسینی کەسانی تر نەدەدا.

بێگومان ئەم جۆرە ڕوانینە بۆ مەنهەج و ڕەوت و ڕێباز و فیکرەیەک، دەبێتە مایەی جێگیری و دامەزراوی لەسەر کار و جوڵە و مەبدەئگەرایی و بەردەوامی پابەندبوون و دروستکردنی هێڵی خۆجیاکردنەوە لەوانی تری جیاواز لەم ڕێگە و ڕێبازە، بەڵام بەهەمان پێوەری ئەم جۆرە ڕوانینە تەجریدییە، بۆ مەنهج و ڕەوت و فیکرەیەک و گواستنەوەی هەمان تەجرید بۆ کارەکتەرە بەشەرییەکانی هەناوی هەر کۆمەڵە و ڕێکخستنێک و

داماڵینیان لە سیفەتەکانی حەز و خواست و ئارەزوو و پێویستییە هەمەچەشن و جۆراوجۆرەکانی و مەیلی باڵادەستی و ئارەزووی کۆنترۆڵکردن و پەنابردنە بەر ئامراز و تەکنیکی نەشیاو....هتد، کارێکی نادروست و ناکۆکە لەگەڵ سیفەتەکانی مرۆڤ لە قورئانی پیرۆزدا.

لەگەڵ ئەمەشدا مامۆستا زۆر دەستکورت و هەژار بوو لە پەیوەندی لەگەڵ سەرکردە و کەسایەتییە خاوەن نفوز و دەستڕۆشتووەکانی ناو ئیخوان و کوتلە و هێڵ و میحوەرەکانیدا، وەک ئەوەی مامۆستا سەلاح پیاوێکی بەناو و دەنگ و خاوەن نفوز و دەست و دەمڕۆشتووی وەک محەمەد ئەحمەد ڕاشیدی لە پشتەوە بوو. ئەمسەری دکتۆر ئەبوزەڕ بوو، ئەوە حاڵی بوو کە باسکرا، ئەو سەرەکەشی مامۆستا سەلاح بوو، کە وەک ئاماژەم بۆ کرد لە ماڵی خۆیدا بەئاشکرا جوابی کردبوو.

ئەم قەناعەتە دەروونییەی مامۆستا یەکێک بوو لەو فاکتەرانەی هەموو خیارەکانی تری لەبەردەمدا داخستبوو، هێڵی ڕێکخستنەکەشی تووشی جۆرێک لە سەرگەردانی و ونکردنی ئاڕاستە و لایەنداری کردبوو. هەر ئەم قەناعەتە وایکرد پاش ناکۆکییەکانی گەڕانەوە بۆ هەرێم بە پارچە وەرەقەیەکی مورشیدێکی ئیخوانەوە ماوەی دوو ساڵ دەیویست قەناعەت بۆمانەوەی خۆی لەو کۆمەڵەدا بسەلمێنێ، سەرباری دەستەوداوێنی ئەم کەس و ئەو کەسایەتی ناو ئیخوان، بەڵکو چارەیەک بدۆزێتەوە و لەم بازنەیەدا بمێنێتەوە، تا گەیاندییە ڕازیبوون بەهێڵی دوو.

دواجار بڕیاری ڕێکەوتنەکەی ١٩٨٨/١١/٩ی کرماشان بوویە دوا وێستگەی بوون و مانەوەی مامۆستا لەناو کۆمەڵەی ئیخوان موسلیمیندا، دابەشبوونی ماڵی کۆمەڵەی ئیخوان موسلیمین لە کوردستان.

قسەی ناڕاست و بێئینصافانەی هەندێک کەس زۆرن کە زۆر دووربوون لەم قەناعەتەی مامۆستا بە ڕێبازی کاری ئیخوان، بەڵام باخۆیان وەڵامی قیامەتیان بدەنەوە، چونکە ئەوێ ئێرە نییە، بڵێن: بەرپرسین و ئیجتهادمان وایە.

# هاوبەشی دەسەڵات لە عێراقدا
# لە عەبادییەوە بۆ کازمی



**د.ئیبراهیم محەمەد عەزیز**

لەدایکبووی ١٩٧٨، هەڵەبجە. دکتۆرا لە سیاسەت و
پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان (٢٠١٧) لە وڵاتی بەریتانیا.

**پێشەکی:**

بابەتی هاوبەشی دەسەڵات لە عێراقدا لە دوای ٢٠٠٣وە یەکێکە لەو بابەتانەی کە جێگەی سەرنج و لێکۆڵینەوەی شارەزایانی بواری سیستمی سیاسییە بەتایبەت ئەوانەی کە گرنگی بە سازان و تیۆری لایپهارت دەدەن بۆ شیکاری سیستمی سیاسی لە دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعسەوە. ئەرێنت لایپهارت چوار ڕەگەزی سەرەکی داناوە بۆ سیستمی سیاسی لە کۆمەڵگە دابەشبووەکاندا بۆئەوەی هاوبەشی لە دەسەڵاتدا دروست ببێت و سەرئەنجام لە ناکۆکییەوە بگوازنەوە بۆ ئاشتی و ئارامی. لێرەدا بەشێوەیەکی پراکتیکی دوو ڕەهەندی گرنگ وەردەگرین ئەویش ڕێژەی پێکهاتەکانە لە پەرلەمان و بەرکەوتەیانە لە حکومەتی هاوبەش. لایپهارت پێی وایە هاوبەشی لە دەسەڵات و نوێنەرایەتی ڕێژەیی لە دەسەڵاتدا دەبێتە هۆکاری بەدیهێنانی ئاشتی و ئاسایش لە نێوان پێکهاتەکاندا و نموونەشی بە عێراق هێناوەتەوە. ئەم نوسینە گرنگی تایبەتی دەبێت لەڕووە پراکتیکییەکەیەوە، چونکە باشترین تێگەیشتن لە هاوبەشی دەسەڵات بواری کرداریی و چۆنیەتی جێبەجێ کردنەکەیەتی. وەک خراوەتەڕوو هاوبەشی لە دەسەڵاتدا چەند ئاستێکی هەیە، بەڵام لێرەدا تەنها دوو ئاست وەردەگرین بۆ دیراسەکردنەکە ئەویش ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لەگەڵ کابینەی حکومەت، واتە زیاتر جەخت دەکرێتەوە لەسەر پۆستەباڵاکان لە پەرلەمان و ئەنجوومەنی وەزیراندا.

ئەم بابەتە دابەش دەبێت بەسەر دوو قۆناغی سەرەکیدا ئەویش سەردەمی عەبادی کە لە ٢٠١٤ دەستپێدەکات و سەردەمی عادل عەبدولمەهدی ٢٠١٨ و پاشان بە کازمی ٢٠٢٠ کۆتایی پێدێت، کە تیایدا شیکارییەکی گرنگ دەکرێت بۆ دوو ئاستی پەیوەست بەیەک، یەکەم: ڕێژەی پێکهاتەکان لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق و ئەو کورسیانەی کە بەدەستیانهێناوە. دووەم: حکومەتی هاوبەش و ئەو پۆستەباڵایانەی کە پێکهاتەکان بەریانکەوتووە. دیارە لەم دوو ئاستەدا دەبێت بزانرێت کە ئایا کورسییەکانی پێکهاتەکان لە ئەنجوومەنی نوێنەران لەڕووی کردارییەوە لە کابینەی حکومەتدا ڕەنگیداوەتەوە؟ ئایا هاوسەنگی لە نێوان کورسییەکانی پەرلەمان و پۆستەکانی حکومەتدا هەبووە و هەیە؟

ئەمانە لە چوارچێوەی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا دەخرێتەڕوو بەشێوازێک سەرەتا شیکاریی بۆ داتاکانی ئەنجوومەنی نوێنەران دەکرێت و پاشان بەراورد دەکرێن لەگەڵ ئەو پۆستانەی کە پێکهاتەکان وەریانگرتووە لە ماوەی ٢٠١٤ دا پاشان بەهەمان شێوە بۆ قۆناغی ٢٠١٨ تا ٢٠٢٠ دەکرێت و هەردوو قۆناغەکەش لەگەڵ یەکتردا بەراورد دەکرێت بۆئەوەی بزانرێت بەشێوەیەکی پراکتیکی ڕەنگدانەوەکان لەڕوانگەی ئەو دوو ڕەگەزە سەرەکییەوە لەو ماوەیەدا چۆن بووە، پاشان ئەوە دەخرێتە ڕوو کە ئایا لایپهارت گریمانەکەی ڕاست دەرچووە یاخود نا.

**ئەنجامی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق ٢٠١٤:**

هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لە نیسانی ٢٠١٤دا ئەنجامدرا، کە تیایدا ژمارەیەکی بەرچاوی قەوارە و هاوپەیمانێتی جیاواز تیایدا بەشداربوون. ئەنجامی هەڵبژرادنەکەش بەم شێوازەی خوارەوە بوو:

| ئەنجامی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق نیسانی ٢٠١٤<br>خشتەی ژمارە (١) | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ژ | قەوارەی سیاسی | کورسی | ڕێژەی کورسییەکان | پێکهاتە | تێبینی |
| ١ | دولة القانون | ٩٢ | ٢٨.٠٤ | شیعە | |
| ٢ | الاحرار الصدر | ٣٤ | ١٠.٣٦ | شیعە | بە سێ قەوارە بەشداربوون |
| ٣ | المواطن عمار الحكيم | ٢٩ | ٤٨.٨ | شیعە | |
| ٤ | المتحدون النجيفي | ٢٣ | ١٧.٠ | سوننە | |
| ٥ | الحزب الديمقراطي | ٢٥ | ٧.٦٢ | کورد | |
| ٦ | الوطنية اياد العلاوي | ٢١ | ٦.٤٠ | عەلمانی | زۆربەی پێکهاتەی لیستەکەی سوننە بوون |
| ٧ | الاتحاد الوطني | ٢١ | ٦.٤٠ | کورد | |
| ٨ | العربية صالح المطلك | ١٠ | ٣.٠٤ | سوننە | |
| ٩ | حركة التغيير | ٩ | ٢.٧٤ | کورد | |
| ١٠ | الفضيلة | ٦ | ١.٨٢ | شیعە | |
| ١١ | تيار الوطني للاصلاح الجعفري | ٦ | ١.٨٢ | شیعە | |
| ١٢ | ائتلاف العراق- قتيبة ابراهيم | ٥ | ١.٥٢ | سوننە | |
| ١٣ | ائتلاف ديالى هويتنا | ٥ | ١.٥٢ | سوننە | |
| ١٤ | الاتحاد الاسلامي الكوردستاني | ٤ | ١.٢١ | کورد | |
| ١٥ | الجماعة الاسلامية الكوردستانية | ٣ | ٠.٩١ | کورد | |
| ١٦ | تحالف نينوى الوطني | ٣ | ٠.٩١ | شیعە | |
| ١٧ | التحالف المدني الديمقراطي | ٣ | ٠.٩١ | سوننە | |
| ١٨ | ائتلاف الوفاء للأنبار | ٣ | ٠.٩١ | سوننە | |
| ١٩ | جبهة تركمان كركوك | ٢ | ٠.٦٠ | تورکمان | |
| ٢٠ | ائتلاف الوفاء للعراق | ٢ | ٠.٦٠ | شیعە | |
| ٢١ | تجمع الكفاءات والجماهير | ٢ | ٠.٦٠ | سوننە | |
| ٢٢ | وحدة أبناء العراق | ٢ | ٠.٦٠ | شیعە | |
| ٢٣ | ١٠ کیانی سیاسی بچووک هەبوون هەریەکەیان یەک کورسیان بەدەستهێنابوو | ١٠ | ٣.٠٤ | لە نێوان سوننە و شیعەدا بە دابەشبووە. | |
| ٢٤ | کەمینەکان | ٨ | ٢.٤٣ | | |
| | | ٣٢٨ | ٩٩.٨٥ | | |

بەپێی خشتەی سەرەوە لەم هەڵبژاردنەدا شیعەکان بەگشتی بوون بە خاوەن ١٧٤ کورسی پەرلەمانی کە دەکاتە لە ٥٣.٠٤٪ ، ئەمە جگەلەوەی کە لەناو هاوپەیمانێتییەکانی تریشدا بوونیان هەبووە وەک کەسایەتی شیعە. بەم پێیە شیعەکان نیوە +١ ئەنجوومەنی نوێنەرانیان بۆ خۆیان بردەوە، ئەوەی وایکردووە کە ئەو ڕێژەیە بەو شێوازەبێت یاسای هەڵبژاردنەکان و فرەبازنەیی سیستمەکە بوو کە بەپێی یاسای هەڵبژاردن کورسییەکانی پەرلەمان دابەشکرابوون بەسەر پارێزگاکاندا و شیعەکان ژمارەی دانیشتوانیان زۆرە و بەرکەوتەکەشیان گەیشتە ئەو ئاستە، لەلایەکی تریشەوە ڕەنگدانەوەی ئەوە بوو کە هەموو پارێزگا شیعەنشینەکان دەنگیان بۆ لیست و قەوارە شیعییەکان بوو، بۆیە لە کۆتاییدا ئەوان ئەو ژمارە کورسییە زۆرە و ئەو ڕێژە بەهێزەیان بەدەستهێنا. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە شیعەکان نەیانتوانی بەیەک لیست بەشداری بکەن، بەڵکو لەناو خۆیاندا دابەشبوونێکی تەواویان پێوەدیار بووە کە ٣ قەوارەی گەورە و ٥ ی بچووک بەشداربوون.

هەرچی سوننەکانە، بە چەند لیستێکی جیاواز ٧٢ کورسیان بەدەستهێناوە کە دەکاتە ٢١.٩٥٪ کە بە دووەم پێکهاتە دێن لە دوای شیعەکان. کورد ٦٢ کورسی بەدەستهێناوە کە دەکاتە ١٨.٩٠٪ کۆی کورسییەکان.

بەم شێوەیە دابەشبوونی پێکهاتەکان لەناو ئەنجوومەنی نوێنەراندا ڕەنگیداتەوە بەجۆرێک هەیمەنەی شیعە بەسەر دامەزراوەکەوە دەبینرێت، چونکە توانیویانە زۆرینەی ڕەهای کورسییەکان بۆ خۆیان ببەنەوە. هەرچەندە شیعە هەیمەنەی هەبوو بەسەر پەرلەماندا، بەڵام سەرۆکی پەرلەمان لەلای کەسێکی سوننە بوو، چونکە سازانی پێکهاتەکان لە دوای ٢٠٠٣وە وایخواستووە کە سەرۆک سوننە بێت و دوو جێگرەکەشی یەکێکیان شیعە و ئەویتریشیان کورد بێت. وەک لە خشتەی ژمارە ٢ دا دیارە.

| سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق ٢٠١٤<br>خشتەی ژمارە (٢) | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ژ | ناو | پۆست | پێکهاتە | قەوارەی سیاسی | |
| ١ | سەلیم جبوری | سەرۆکی ئەنجوومەن | سوننە | حزبی ئیسلامی عێراقی | |
| ٢ | هومام حەمودی | جێگری سەرۆک | شیعە | مجلس الاعلی | |
| ٣ | ئارام محەمەد | جێگری سەرۆک | کورد | بزووتنەوەی گۆڕان | |

بەهەمان شێواز سەرۆکایەتی کۆمار بەشێوەی سازان دابەشکراوە سەرۆک لەلایەن کوردەوە دانراو جێگرێک بۆ کورد و دوو جێگریش لەلایەن کەسایەتی شیعەوە پڕکرایەوە وەک لە خشتەی ژمارە (٣)دا دیارە، لێرەدا ئەیاد عەلاوی هەرچەند شیعەیە، بەڵام لەسەر شیعە حساب ناکرێت وەها ناسراوە کە ئاڕاستەیەکی سیکۆلاری نیشتمانی هەیە و زۆربەی پێکهاتەی لیستەکەشی کەسایەتی سوننە بوون.

| سەرۆکایەتی کۆمار ٢٠١٤-٢٠١٨<br>خشتەی ژمارە (٣) | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ناو | پۆست | پێکهاتە | قەوارە یان پارتی سیاسی | تێبینی |
| فوئاد مەعسوم | سەرۆک کۆمار | کورد | یەکێتی | |
| ئوسامە نوجێفی | جێگر | سوننە | موتەحیدوون | |
| ئەیاد عەلاوی | جێگر | شیعە | القائمة الوطنية العراقية | |
| نوری مالیکی | جێگر | شیعە | دەوڵەتی یاسا | |

هەرچەندە عەبادی لە ١٦/٨/ ٢٠١٥دا بڕیاریدا بەلابردنی جێگرانی سەرۆک کۆمار، بەڵام دادگای باڵای فیدراڵی لە بەرواری ١٠/١٠/٢٠١٦دا، واتە دوای ساڵێک و دوومانگ ئەو بڕگەیەی کە تایبەت بوو بە لابردنی جێگرانی سەرۆک کۆمار بە نایاسایی دانا و جێگرانی سەرۆک کۆمار گەڕانەوە سەرکارەکانی خۆیان بە بڕیاری دادگای باڵای فیدراڵی. ئەمەش جۆرێک بوو لە ناسەقامگیری سیاسیی و ئیداری، چونکە دواجار پرۆسەکە وەها کۆتایی هات جێگرانی سەرۆک کۆمار بەهۆکاری سیاسی لابراون نەک بەڕێکاری یاسایی، لە بارودۆخێکی وەهادا دامەزراوەکان لە نێوان خۆیاندا تەواوکەری یەکدی نابن و بەردەوام لە ململانێ و ناکۆکیدا دەبن و ناتوانن ئەرکی خۆیان بابەتییانە جێبەجێ بکەن.

پێکهاتەی حکومەتەکەی حەیدەر عەبادی ٢٠١٤.

کابینەی حکومەت یەکێکە لەو دامەزراوە سیاسییانەی کە لە دەوڵەتێکی تەوافوقیدا پێویست دەکات هاوپەیمانی بێت و هاوبەشبێت لە هەموو پێکهاتە سەرەکییەکان بۆئەوەی بەشێوەیەکی کرداری هاوبەشی لە دەسەڵاتی جێبەجێ کردندا بێتەدی. ئەمەش یەکێکە لە ڕەگەزە سەرەکییەکانی سازان کە لایپهارت باسیکردووە.

بۆئەوەی شیعە بگەنە ڕێکەوتن لەسەر کەسێک بۆ سەرۆکی حکومەت لەناوخۆیاندا ناکۆک بوون و سوننە و کوردیش چاوەڕێی شیعەیان دەکرد تاوەکو لە نێوان خۆیاندا بگەنە ڕێکەوتن لەسەر کەسێک، هەرچەندە کورد حەزی بە مالیکی نەدەکرد سوننەش حەزیان دەکرد یەکێکی تر بێت، چونکە مالیکی هەرچەندە لەناو شیعەکاندا یەکەم لیستی براوەبوو ٩٢ کورسی بردبوویەوە، بەڵام چانسی زۆری نەبوو بەهۆی ئەوەی دوو خولی

ڕابردوو سەرۆک وەزیران بوو، هەروەها نەیتوانی لەو ماوەیەی کە سەرۆک وەزیران بوو یەکگرتوویی نێوان پێهاتەکان بپارێزێت و پراکتیزەی سازان بکات، بەپێچەوانەوە لە خولی دووەمیدا بانگەشەی بۆ حوکمی زۆرینە دەکرد. بۆیە دواجار شیعەکان ڕێکەوتن لەسەر حەیدەر عەبادی کە کاندیدی ئەوان بێت بۆ سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دوای ئەوەی عەبادی دەستیکرد بەگفتوگۆ بۆ پێکهێنانی کابینەکەی ئەوەی جێگەی هەڵوێستە لەسەرکردنە ئەوەبوو لە دانوستانی لایەنەکاندا کە لەژێر چاودێری ئەمریکا و بەریتانیا و نەتەوەیەکگرتووەکان بەڕێوەدەچوو و ئێرانییەکانیش لە نێوانیاندا بوون بۆئەوەی پێکهاتەکان بگەیەننە ڕێکەوتن، سوننە و شیعە گەیشتبوونە ڕێکەوتن، بەڵام ئەو بەشەی کە بۆ کورد دیاری کرابوو جێگەی ڕەزامەندی کورد نەبوو. شیعە بەتایبەتی عەبادی دوا پێشنیازی خۆیان بە شاندی کوردی ڕاگەیاندبوو کە پشکیان چەند دەبێت لە حکومەتەکەیدا، بەڵام شاندی کوردی ڕەزامەندیان دەرنەبڕیبوو لەسەر ئەو پۆستانە، شاندەکە گەڕایەوە بۆ کوردستان بۆئەوەی لەگەڵ سەرکردەی لایەنەکان کۆببنەوە ئەوەبوو لەکاتێکدا ئەوان لە کۆبوونەوەدا بوون عەبادی لە پەرلەمان حکومەتەکەی پێشکەش کرد و چاوەڕوانی گەڕانەوەی شاندی کوردی نەکرد بۆ بەغداد. وەک ڕۆستایی دووپاتیکردەوە «ئەمەش لە ئەنجامی ئەوە بوو کە ئەوان(واتە شیعەکان) دوا پێشنیازی خۆیان بەئێمەدا و ڕازی نەبوون لەوە زیاتر بێنە پێش بۆ کورد و لەوە زیاتریان بۆ کورد پێ قبوڵ نەدەکرا، ویستیان بیکەن بە ئەمری واقیع بەسەر کورددا، کوردیش لەوکاتەدا هیچ ڕێگەچارەیەکی لە پێش نەما یان دەبوو بەشداری نەکات یاخود بەشداری بکات بەوشێوەیەی کە ئەوان دەیانویست، بۆیە عەبادی و حزبەکانی بەشدار لە حکومەتەکەیدا لەمە زیاتریان بەڕەوا نەدەبینی بۆ کورد».

> **لە پێکهێنانی کابینەکەی حەیدەر عەبادیدا پێگەی کورد ڕووی لە لاوازی کرد، چونکە لە دوای 2003 وە ئەوە یەکەم جاربوو شیعە بەبێ ڕەزامەندی کورد حکومەت پێشکەش بکات.**

بەم جۆرە بەشداری کورد لەم کابینەیەدا بەوشێوازەبوو، کابینەکە بە بەرکەوتەی کورد تەواوکرا بەوشێوەیەی کە لە خشتەی ژمارە (٤)دا دیارە.

| پێکهاتەی حکومەتەکەی حەیدەر عەبادی ٢٠١٤<br>خشتەی ژمارە (٤) | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ت | ناو | پۆست | پێکهاتە | قەوارەی سیاسی | تێبینی |
| ١ | حيدر العبادي | سەرۆک | شیعە | الدعوة | |
| ٢ | ڕۆژ نوری شاویس | جێگر | کورد | پارتی | لابرا |
| ٣ | صالح المطلك | جێگر | سوننە | | لابرا |
| ٤ | بهاء الاعرجي | جێگر | شیعە | الصدري | لابرا |
| **الوزارات السيادية** | | | | | |
| ٥ | محمد سالم الغبان(٢٠١٤-٢٠١٦)<br>قاسم الأعرجي (٢٠١٦-٢٠١٨) | ناوخۆ | شیعە | بەدر | |
| ٦ | خالد العبيدي(٢٠١٤-٢٠١٦)<br>عرفان الحيالي (٢٠١٦-٢٠١٨) | بەرگری | سوننە | العراقية | |
| ٧ | هوشیار زێباری(٢٠١٤-٢٠١٦)<br>عبد الرزاق العيسى (بالوكالة)<br>(٢٠١٦-٢٠١٨) | دارایی | کورد | پارتی | هوشیار زێباری متمانەی لێوەرگیرایەوە |
| ٨ | عادل عبد المهدي(٢٠١٤-٢٠١٦)<br>جبار اللعيبي (٢٠١٦-٢٠١٨) | نەوت | شیعە | مجلس الاعلى | |
| ٩ | ابراهيم الجعفري | دەرەوە | شیعە | الاصلاح الوطني | |
| ١٠ | سلمان حسن الجميلي | پلاندانان | سوننە | المتحدون | |
| **الخدمية** | | | | | |
| ١١ | عديلة حمودي حسين | تەندروستی | شیعە | الدعوە | کرا بەیەک لەگەڵ ژینگە |
| ١٢ | جاسم محەمەد جاسم (دەرباز) | کۆچ وکۆچبەران | کورد | گۆران | |
| ١٣ | ملاس محمد كريم الحسيني | بازرگانی | سوننە | تجمع الوحده العراقية | کورد بەڵام لەسەر سوننە حساب دەکرێت، چونکە لەسەر بەشی ئەوان پۆستی وەرگرتووە |
| ١٤ | قاسم محمد الفهداوي | کارەبا | شیعە | ائتلاف العراقية | |
| ١٥ | فلاح حسن الزيدان | کشتوکاڵ | سوننە | العراقية | |
| ١٦ | محمد اقبال عمر | پەروەردە | سوننە | حزب الاسلامی | |
| ١٧ | كاظم حسن الراشد | الاتصالات | شیعە | بدر | |
| ١٨ | نصير العيساوي | پیشەسازی | شیعە | الصدري | استقالەی کرد و پاشان محمد صاحب الدراجي چووە شوینەکەی |
| ١٩ | فارس يوسف الجوجو | زانست و تەکنۆلۆجیا | المسيحي | | لەگەڵ وەزارەتی خوێندنی باڵا کرا بەیەک |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٠ | فرياد ڕواندوزي | ڕۆشنبيری | كورد | يەكيتي | |
| ٢١ | عبدالكريم الانصاري | شارەوانی | شيعە | بدر | لەگەڵ الإسكان والاعمار كرا بەيەک |
| ٢٢ | عادل محمد الشرشاب | گەشت وگوزار | شيعە | المستقلون فی كتلە دولە القانون | كرا بەيەک لەگەڵ ڕۆشنبيری |
| ٢٣ | محسن عصفور | سەرچاوە ئاوييەكان | الشيعە | الصدری | |
| ٢٤ | طارق كطيفة الخيكاني | الاسكان والاعمار | شيعە | الصدري | كرا بەيەک لەگەڵ بلديات |
| ٢٥ | محمد شياع السوداني | كار و كاروباری كۆمەڵايەتی | شيعە | الدعوة | |
| ٢٦ | حيدر ناطق الزاملي | داد | شيعە | الفضيلە | |
| ٢٧ | باقر جبر الزبيدي (٢٠١٤-٢٠١٦)<br>كاظم فنجان الحمامي (٢٠١٦-٢٠١٨) | گواستنەوە | شيعە | مجلس الاعلى | كاظم الفنجاني عند ترشيحات العبادي للتكنوقراط |
| ٢٨ | عبدالحسين عبدالرضا | وەرزش | شيعە | مجلس الاعلى | |
| ٢٩ | حسين الشهرستاني | خوێندنی باڵا | شيعە | المستقلون | |
| ٣٠ | محمد مهدي البياتي | مافی مرۆڤ | شيعە – التركمان | بدر | لابرا |
| ٣١ | قتيبة ابراهيم الجبوري | ژينگە | سوننە | العراقية | كرا بەيەک لەگەڵ تەندروستی |
| ٣٢ | احمد عبد الله الجبوري | وەزيری دەوڵەت بۆ كاروباری پارێزگاكان | سوننە | العراقية | لابرا |
| ٣٣ | احمد عبد الله الجبوري | وەزيری دەوڵەت بۆ كاروباری پەرلەمان | سوننە | | لابرا |
| ٣٤ | بيان نوری | وەزيری دەوڵەت بۆ كاروباری ئافرەتان | كورد | الاتحاد الاسلامي | لابرا |
| ٣٥ | سامان عبد الله | وەزيری دەوڵەت | كورد | الجماعة الاسلامية | لابرا |

ئەوەی جێگەی هەڵوێستە لەسەرکردنە لە پێکهێنانی کابینەکەی عەبادیدا پێگەی کورد ڕووی لە لاوازی کرد، چونکە ئەوە یەکەم جاربوو شیعە بەبێ ڕەزامەندی کورد حکومەتی پێشکەش کرد لە دوای ٢٠٠٣ وە و سیاسەتی ئەمری واقیعی گرتەبەر لە بەرامبەر کورددا. ئەم دیدگایە دواتر لە کۆی حکومەتەکەی عەبادی ڕەنگیدایەوە بەتایبەتی دوای ئەوەی بەبێ گەڕانەوە بۆ لایەنە بەشداربووەکانی پێکهێنەری حکومەت بڕیاری کەمکردنەوەی وەزارەتەکانیدا، وەک ئەوەی کە لە خشتەی ژمارە (٦) دا دیاریکراوە.

| بەروواردی نێوان بەرکەوتەی پێکهاتەکان و کورسییەکانیان لە پەرلەمان و حکومەتدا ٢٠١٤<br>خشتەی ژمارە(٥) | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ت | پێکهاتە | ژمارەی کورسی پەرلەمانی | ڕێژەی سەدی پەرلەمان | ژمارەی وەزارەت | ڕێژەی سەدیی وەزارەت | بەراوردی ڕێژەی نێوان پەرلەمان و حکومەت |
| ١ | شیعە | ١٧٤ | ٥٣.٠٤ | ١٩ | ٥٤.٢٨ | ٠.٨٨ + |
| ٢ | سوننە | ٧٢ | ٢١.٩٥ | ٨ | ٢٢.٨٥ | ٩٥.٠ + |
| ٣ | کورد | ٦٢ | ١٨.٩٠ | ٦ | ١٧.١٤ | ١.٧٦ − |

لە خشتەی سەرەوەدا دەبینرێت کورد هاوسەنگی نییە لە نێوان ڕێژەی کورسییەکان لەناو پەرلەمان و ڕێژەی پۆستەکانی لەناو حکومەتدا و کەمتری بەرکەوتووە بەڕێژەی ١.٧٦ ٪ ، بەڵام لە بەرامبەردا شیعە و سوننە لە ڕێژەی خۆیان زیاتریان بردووە بەڕێژەی ٠.٨٨ و٠.٩٥٪، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە کورسییەکانی پەرلەمان بەشێوەیەکی تەواوەتی هاوسەنگ نییە و هاوئاستی ڕێژەی پۆستەوزارییەکان نییە. لێرەدا مەبەست کەمی و زۆری نییە، بەڵکو مەبەستەکە بەستراوەتەوە بە سیستمەکەوە کە تا چ ڕادەیەک بواری دروستکردووە بۆئەوەی پێکهاتەکان بەڕێژەی خۆیان پشکداربن لە دامەزراوە سیاسییەکاندا. مادام ئەم دابەشکارییەی حکومەت لەسەر بنەمای ڕەزامەندی سەرکردەی پێکهاتە سەرەکییەکان بووە و لە پەرلەمانیش دەنگیان پێداوە، گرفتێکی کرداری لە پرۆسەکەدا نابینرێت هەرئەوەندەی کە ئەم دابەشکارییە پێمان دەڵێت سەرەڕای ئەو جیاوازییەش پێکهاتەکان بەو تەوافوق و ڕێکەوتنە ڕازیبوون و هیچ لایەنێکیان لە پەرلەمان بایکۆتی پرۆسەکەیان نەکردبوو. کەواتە لە قۆناغی سەرەتای حکومەتەکەی عەبادیدا حکومەتێکی هاوپەیمانی هاوبەش لەگەڵ پەرلەمانێکی نوێنەرایەتی ڕێژەیی هاوسەنگ بووە و پێکهاتەکان بەڕێکەوتن پرۆسەکەیان دامەزراند بوو. بەڵام لە دوای ئەوەی کە عەبادی بە چەندین پاساوی جیاواز وەزیرەکانی کەمکردەوە بارودۆخەکە گۆڕا وەک لە خشتەی ژمارە (٦ و٧ و ٨) دا خراوەتە ڕوو.

| پێکهاتەی حکومەتەکەی حەیدەر عەبادی دوای کەمکردنەوەی وەزارەتەکانی لە ٢٠١٥/٨/١٦<br>خشتەی ژمارە (٦) | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ت | ناو | پۆست | پێکهاتە | قەوارەی سیاسی | تێبینی |
| ١ | حيدر العبادي | سەرۆک | شيعه | الدعوة | |
| الوزارات السيادية | | | | | |
| ٢ | محمد سالم الغبان(٢٠١٦-٢٠١٤)<br>قاسم الأعرجي (٢٠١٦-٢٠١٨) | ناوخۆ | شيعه | بەدر | |
| ٣ | خالد العبيدي(٢٠١٦-٢٠١٤)<br>عرفان الحيالي (٢٠١٦-٢٠١٨) | بەرگری | سوننه | العراقية | |
| ٤ | هوشيار زێباری(٢٠١٦-٢٠١٤)<br>عبد الرزاق العيسى (بەوەکالەت)<br>(٢٠١٦-٢٠١٨) | دارایی | کورد | پارتی | هوشيار زێباری متمانەی لێوەرگیرایەوە |
| ٥ | عادل عبد المهدي(٢٠١٦-٢٠١٤)<br>جبار اللعيبي (٢٠١٦-٢٠١٨) | نەوت | شيعه | مجلس الاعلى | |
| ٦ | ابراهيم الجعفري | دەرەوە | شيعه | الاصلاح الوطني | |
| ٧ | سلمان حسن الجميلي | پلاندانان | سوننه | المتحدون | |
| الخدمية | | | | | |
| ٨ | عديلة حمودي حسين | تەندروستی وژینگە | شيعه | الدعوه | |
| ٩ | جاسم محمد جاسم (دەرباز) | کۆچ وکۆچ بەران | کورد | گۆران | |
| ١٠ | ملاس محمد كريم الحسيني | بازرگانی | سوننه | تجمع الوحدة العراقية | |
| ١١ | قاسم محمد الفهداوي | کارەبا | سوننه | ائتلاف العراقية | |
| ١٢ | فلاح حسن الزيدان | کشتوکاڵ | السنة | العراقية | |
| ١٣ | محمد اقبال عمر | پەروەردە | السنة | حزب الاسلامی | |
| ١٤ | كاظم حسن الراشد | الاتصالات | شيعه | بدر | |
| ١٥ | نصير العيساوي | پیشەسازی | شيعه | الصدري | استقالەی کرد و پاشان محمد صاحب الدراجی چووە شوینەکەی |
| ١٦ | فرياد ڕەواندزی | ڕۆشنبیری وگەشتوگوزار وشوێنەوار | کورد | یەکێتی | |
| ١٧ | محسن عصفور | سەرچاوە ئاوییەکان | الشيعة | الصدری | |
| ١٨ | طارق كطيفة الخيكاني-٢٠١٤<br>٢٠١٦ لابرا و<br>آن نافع اوسي ٢٠١٦-٢٠١٨له | شارەوانی ونیشتەجێبوون و ئاوەدان | شيعه | الصدري | |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | شوێنی دانرا | کردنەوە | | | |
| ١٩ | محمد شياع السوداني | کار وکاروباری کۆمەڵایەتی | شیعە | الدعوة | |
| ٢٠ | حيدر ناطق الزاملي | داد | شیعە | الفضيله | |
| ٢١ | باقر جبر الزبيدي(٢٠١٤-٢٠١٦)<br>كاظم فنجان الحمامي (٢٠١٦-٢٠١٨) | گواستنەوە | شیعە | مجلس الاعلى | |
| ٢٢ | عبدالحسين عبدالرضا | وەرزش | شیعە | مجلس الاعلى | |
| ٢٣ | حسين الشهرستاني | خوێندنی باڵا و زانست و تەکنۆلۆجیا | شیعە | المستقلون | |

ڕێژەی پێکهاتەکان لە حکومەتەکەی عەبادیدا دوای کەمکردنەوەی وەزیرەکانی لە ٢٠١٥دا. دوایی کەمکردنەوەی وەزارەتەکان دابەشکاری ناو کابینەکە بەم شێوەی خوارەی لێهات کە لە خشتەی ژمارە (٧ )دا ڕوونکراوەتەوە:

| ڕێژە و ژمارەی وەزارەتەکانی حکومەتەکەی عەبادی لە دوای کەمکردنەوەی وەزیرەکانی ٢٠١٥<br>خشتەی ژمارە (٧) | | | |
|---|---|---|---|
| ت | پێکهاتە | ژمارەی وەزارەت | ڕێژەی سەدیی |
| ١ | شیعە | ١٦ | ٦٩.٥٦ |
| ٢ | سوننە | ٤ | ١٧.٣٩ |
| ٣ | کورد | ٣ | ١٣.٠٤ |

ئەگەر سەرنجێکی خێرای ئەنجامی کەمکردنەوەکە بدەین دەبینین ڕێژەی کورد و سوننە کەمی کردووە و ڕێژەی شیعە بەرزبووەتەوە، خشتەی ژمارە (٨) ئەو بەراورد کارییە دەکات و جیاوازییەکان دەخاتە ڕوو:

| بەراوردی نێوان ڕێژەی پێکهاتەکان لە پەرلەمان و حکومەتدا لە نێوان ٢٠١٤ و ٢٠١٥دا<br>خشتەی ژمارە (٨) | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ت | پێکهاتە | ژمارەی کورسی پەرلەمانی پێکهاتەکان ٢٠١٤ | ڕێژەی سەدی کورسی پەرلەمانی ٢٠١٤ ٪ | ژمارەی وەزارەتی پێکهاتەکان لە ٢٠١٤دا | ڕێژەی سەدیی وەزارەتی پێکهاتەکان لە ٢٠١٤دا ٪ | بەراوردی ڕێژەی پێکهاتەکان نێوان پەرلەمان و حکومەت لە ٢٠١٤دا ٪ | ژمارەی وەزارەتی پێکهاتەکان لە ٢٠١٥دا | ڕێژەی سەدیی وەزارەتی پێکهاتەکان لە ٢٠١٥دا ٪ | بەراوردی ڕێژەی پێکهاتەکان نێوان پەرلەمان و حکومەت لە ٢٠١دا ٪ |
| ١ | شیعە | ١٧٤ | ٥٣.٠٤ | ١٩ | ٥٤.٢٨ | ٠.٨٨ + | ١٦ | ٦٩.٥٦ | +١٦.٥٢ |
| ٢ | سوننە | ٧٢ | ٢١.٩٥ | ٨ | ٢٢.٨٥ | ٠.٩٠ + | ٤ | ١٧.٣٩ | ٤.٥٦ − |
| ٣ | کورد | ٦٢ | ١٨.٩٠ | ٦ | ١٧.١٤ | ١.٧٦ − | ٣ | ١٣.٠٤ | ٥.٨٦ − |

له خشتەی ژمارە (٨)دا بۆمان ڕووندەبێتەوە کە کەمکردنەوەی وەزارەتەکان تەنها له قازانجی شیعەدا بووە، چونکە بەڕێژەی لە ١٦.٥٢٪ زیاد لە مافی پێکهاتەی خۆی بردووە کە بەڕێژەی لە ٥٣.٠٤٪ بووە لە پەرلەماندا. بۆیە لاسەنگی دروستکردووە لە پرۆسەکەدا و ڕێژەی دروستی لە نێوان پێکهاتەکاندا تێکداوە لە دوای ئەوەی کە وەزیرەکان کەمکرانەوە. بەم شێوازە هەردوو لایەنی سوننە و کورد زەرەرمەند بوون لەو کەمکردنەوەیەدا و سوننە بە ڕێژەی لە ٤.٥٦٪ی لە مافی خۆی کەمتری پێدراو کوردیش بەڕێژەی لە ٥.٨٦٪ کەمتری بەرکەوت. بەتایبەت دوای ئەوەی وەزیری دارایی هوشیار زێباری لەسەر لیستی پارتی لە ساڵی ٢٠١٦دا متمانەی لیوەرگیرایەوە ئەوکاتە ڕێژەی کورد بەتەواوی کەمیکرد و تەنها بەدوو وەزارەت بەشداربوون لە حکومەتدا. ئەم هەنگاوە ئەوەمان پێدەڵێت کە کابینەکەی عەبادی کابینەی هاوپەیمانێتی نەبوو کە بتوانێت هاوبەشی لەو دامەزراوە سیاسییەدا دروستبکات و هاوسەنگی دروستبکات لە نێوان ڕێژەی پێکهاتەکان لە حکومەت و پەرلەماندا. بۆیە سەرەتایەکی تر دەستپێکرد کە تیایدا زیاتر بەلای پشتگوێخستنی پێکهاتەکانی تردا هەنگاوی دەنا.

**ئەنجامی هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق ٢٠١٨:**

هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەران لە ٢٠١٨/٥/١٢دا ئەنجامدرا، ئەم هەڵبژاردنە لە بارودۆخێکی تاڕادەیەک جیاواز ئەنجامدرا، چونکە ناوچە سوننە نشینەکان تازە لە داعش پاککرابوونەوە و دانیشتوانەکەشی بەتەواوەتی نەگەڕابوونەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان، هەروەها عەبادی وەک سەرکەوتوویەکی نێو بارودۆخەکان دەردەکەوت بەتایبەت دوای ئەوەی کۆتایی داعشی ڕاگەیاند و بەهێز لە ١٦ ئۆکتۆبەری ٢٠١٧دا ناوچەکانی لە دەستی پێشمەرگە وەرگرتەوە و ڕێوشوێنی توندی گرتەبەر دژی هەرێمی کوردستان بەتایبەت دوای ڕیفراندۆمەکە، هەر لەبەر ئەمانەش بوو عەبادی قەوارەیەکی سیاسی دروستکرد و ناوینا «النصر»، ئومێدی دەکرد بتوانێت ئەنجامێکی وا بەدەستبهێنێت کە بتوانێت بۆ جاری دووەم حکومەت دروستبکاتەوە. بەڵام دواتر ئەنجامەکان بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

**ئەنجامی هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق ٢٠١٨/٥/١٢**
**خشتەی ژمارە (٩)**

| ر | قەوارەی سیاسی | کورسی | ڕێژەی کورسییەکان | پێکهاتە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | هاوپەیمانی سائرون | ٥٤ | ١٦.٤١ | شیعە سەدر | یەکێکیان کوردە بەناوی ئازاد حەمید |
| ٢ | هاوپەیمانی فتح | ٤٧ | ١٤.٢٨ | شیعە هادی عامری | یەک کورسیان تورکمانە |
| ٣ | هاوپەیمانی نصر | ٤٢ | ١٢.٧٦ | شیعە عەبادی | ٣ لیستی بچووکی سوننەشی تێدابوو لەوانە خالید العبیدی کە خاوەنی ٧ کورسییە لە موسڵ |
| ٤ | دەوڵەتی یاسا | ٢٥ | ٥٩.٧ | شیعە مالیکی | |
| ٥ | پارتی | ٢٥ | ٧.٥٩ | کورد بارزانی | ٢ عەرەبن طعمة عبد الله حنضل، وصباح خضر حسي لە بازنەی موسڵ کە سوننەن |
| ٦ | ئیتلافی وەتەنیە | ٢١ | ٦.٣٨ | سیکۆلار ئەیاد عەلاوی | زۆربەی لیستەکەی لە سوننەکانە (١٧کورسی) |
| ٧ | ڕەوتی حیکمە | ١٩ | ٥.٧٧ | شیعە عەمار حکیم | |
| ٨ | یەکێتی | ١٨ | ٥.٤٧ | کورد تاڵەبانی | |
| ٩ | هاوپەیمانی بریاری عێراقی | ١٤ | ٢٥.٤ | سوننە ئوسامە نوجەیفی | |
| ١٠ | ئەنبار ناسنامەمانە | ٦ | ١.٨٢ | سوننە | |
| ١١ | بزووتنەوەی گۆڕان | ٥ | ١.٥١ | کورد | |
| ١٢ | نەوەی نوێ | ٤ | ١.٢١ | کورد | |
| ١٣ | هاوپەیمانێتی بەغدا | ٤ | ١.٢١ | سوننە | یەکێکیان کوردە ئالا تاڵەبانی |
| ١٤ | نەینەوا ناسنامەمانە | ٣ | ٠.٩١ | سوننە | |
| ١٥ | قەڵای جەماوەری وەتەنییە | ٣ | ٠.٩٠ | سوننە | |
| ١٦ | بەرەی تورکمانی کەرکوک | ٣ | ٠.٩٠ | تورکمان | |
| ١٧ | هاوپەیمانێتی عەرەبی | ٣ | ٠.٩٠ | سوننە | |
| ١٨ | بزووتنەوەی ئیرادە | ٣ | ٠.٩٠ | شیعە | |
| ١٩ | تەمەدوون | ٢ | ٦٠.٠ | سوننە | |
| ٢٠ | بیارق ئەلخەیر | ٢ | ٠.٦٠ | سوننە | |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢١ | کۆمەڵی ئیسلامی کوردستان | ٢ | ٠.٦٠ | کورد | |
| ٢٢ | یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان | ٢ | ٠.٦٠ | کورد | |
| ٢٣ | لیستی جەماوەری نیشتمانی | ٢ | ٠.٦٠ | سوننە | |
| ٢٤ | عابروون | ٢ | ٠.٦٠ | سوننە | |
| ٢٥ | هاوپەیمانی بۆ دیموکراسیی و دادگەری | ٢ | ٠.٦٠ | کورد | |
| ٢٦ | کەفائات بۆ گۆڕانکاری | ٢ | ٠.٦٠ | شیعە | |
| ٢٧ | نەهجی دیموکراسی | ١ | ٠.٣٠ | سوننە | |
| ٢٨ | تجمع رجال العراق | ١ | ٠.٣٠ | شیعە | |
| ٢٩ | هاوپەیمانی مەدەنی دیموکراسی | ١ | ٠.٣٠ | سوننە | |
| ٣٠ | هاوپەیمانی سەلاحەدین ناسنامەمانە | ١ | ٠.٣٠ | سوننە | |
| ٣١ | حزبی مەدەنی | ١ | ٠.٣٠ | سوننە | |
| ٣٢ | کەمینەکان | ٩ | ٢.٧٣ | | |
| | کۆی گشتی | ٣٢٩ | ١٠٠ | | |

بەپێی ئەنجامی هەڵبژاردنەکان بەتایبەت لەڕووی ئەو لیستانەی کە پێکهاتەکەی زۆرینەی لە یەکێک لە پێکهاتەکان دروستبووە شیعە توانیان ١٨٤ کورسی پەرلەمان مسۆگەر بکەن بەڕێژەی لە ٥٥.٩٢٪ (کە پێدەچێت چەند سوننەیەکیش لە نێوانیاندا هەبێت، بەڵام کاریگەرییان نابێت لەسەر ڕێژەکە)، سوننەکانیش توانیان ٧٣ کورسی ببەنەوە کە (٧)یان لەسەر هاوپەیمانێتییەکەی حەیدەر عەبادی بوون لەسەر بازنەی موسڵ بەڕێژەی لە ٢٢.١٨٪ (پێدەچێت چەند کەسێکی تریشیان هەبێت لە لیستی دەوڵەتی یاسا و لیستەکانی تر، بەڵام ڕێژەکەیان کەمە، هەروەها چەند شیعەیەکیش لەسەر لیستەکەی عەلاوی بوونیان هەیە، ئەوانیش کاریگەر نابن لەسەر ژمارە و ڕێژەی شیعەکان)، کوردیش کە بە چەند لیستێکی جیاواز بەشداریان کرد توانیان ٥٨ کورسی بەدەستبهێنن وەک سێیەم پێکهاتەی عێراق بەڕێژەی لە ١٧.٦٢٪.

پاش دانیشتنی یەکەمی پەرلەمان پێکهاتەی سەرۆکایەتی پەرلەمان بەپێی بنەمای سازان و هاوبەشیکردن بەم شێوەیەی خوارەوە پێکهێنرا:

| سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق ٢٠١٨<br>خشتەی ژمارە (١٠) | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ر | ناو | پۆست | پێکهاته | قەوارەی سیاسی | |
| ١ | محمد ريكان حديد علي الحلبوسي | سەرۆکی ئەنجوومەن | سوننە | هاوپەیمانی ئەنبار ناسنامەمانە | |
| ٢ | حسن كريم الكعبي | جێگری سەرۆک | شیعە | سەدری | |
| ٣ | بشير خليل توفيق الحداد | جێگری سەرۆک | کورد | پارتی | |

**پێکهاتەی حکومەتەکەی عادل عەبدولمەهدی ٢٠١٨:**

پێکهێنانی کابینەکەی عادل عەبدولمەهدی لە قۆناغێکی هەستیاردا بوو، چونکە کورد لەگەڵ عەبادی گرفتی گەورەی هەبوو، هەروەها سوننەکانیش گرفتی یەک دەنگی و کۆدەنگیان هەبوو، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە شیعە خۆیان زۆر ناکۆک بوون لەسەر کاندیدێک بۆ پۆستی سەرۆک وەزیران بۆیە هەڵبژاردنی عەبدولمەهدی خۆی لەخۆیدا بەرئەنجامی ئەو ناکۆکییە بوو، چونکە عەبدولمەهدی وەک کەسایەتی شیعە سەربەخۆبوو، سەر بەهیچ لایەنێکی شیعە نەبوو لەوکاتەدا و ناچار شیعەکان لەسەری ڕێکەوتن بۆ پێکهێنانی کابینەی نوێ، ئەوەبوو پاش گفتوگۆ لەگەڵ لایەنەکانی تر بەم شێوەیەی کە لە خشتەی ژمارە (١١ )دا هەیە کابینەکەی بەناتەواوی بەچوار قۆناغ پێ تەواو نەکرا.

| حكومة عادل عبدالمهدى ٢٠١٨/١٠/٢٤ –٢٠١٨/١٢/١٨– ٢٠١٨/١٢/٢٤– ٢٠١٩/٦/٢٤<br>خشتەی ژمارە (١١) | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ت | ناو | پۆست | پێکهاته | قەوارەی سیاسی | تێبینی |
| ١ | عادل عبدالمهدى | سەرۆک | شیعە | مستقل | ٢٠١٨/١٠/٢٤ |
| الوزارات السيادية | | | | | |
| ٢ | ياسين طاهر الياسري | ناوخۆ | شیعە | | ٢٠١٩/٦/٢٤ |
| ٣ | نجاح حسن الشمري | بەرگری | سوننە | | ٢٠١٩/٦/٢٤ |
| ٤ | فؤاد حسين | دارایی +جێگر | کورد | پارتی | ٢٠١٨/١٠/٢٤ |
| ٥ | ثامر عباس الغضبان | نەوت +جێگر | شیعە | | ٢٠١٨/١٠/٢٤ |
| ٦ | محمد علي الحكيم | دەرەوە | شیعە | | ٢٠١٨/١٠/٢٤ |
| ٧ | نوري صباح الدليمي | پلاندانان | سوننە | | ٢٠١٨/١٢/١٨ |
| الخدمية | | | | | |
| ٨ | نوفل بهاء موسى | کۆچ و کۆچبەران | مەسیحی | | ٢٠١٨/١٢/٢٤ |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٩ | محمد هاشم عبد المجيد | بازرگانی | سوننە | | ٢٠١٨/١٠/٢٤ |
| ١٠ | لؤي الخطيب | کارەبا | شیعە | | ٢٠١٨/١٠/٢٤ |
| ١١ | صالح حسين جبر الحسني | کشتوکاڵ | شیعە | | ٢٠١٨/١٠/٢٤ |
| ١٢ | شيماء خليل عبدالله نجم الحيالي | پەروەردە | سوننە | | ٢٠١٨/١٢/٢٤ |
| ١٣ | نعيم ثجيل الربيعي | الاتصالات | شیعە | | ٢٠١٨/١٠/٢٤ |
| ١٤ | صالح عبد الله الجبوري | پیشەسازی | سوننە | | ٢٠١٨/١٠/٢٤ |
| ١٥ | عبد الأمير الحمداني | ڕۆشنبیریی و گەشتوگوزار و شوێنەوار | شیعە | | ٢٠١٨/١٢/١٨ |
| ١٦ | جمال عباس العادلي | سەرچاوە ئاوییەکان | شیعە | | ٢٠١٨/١٠/٢٤ |
| ١٧ | بنكين ريكاني | شارەوانی و نیشتەجێبوون وبیناسازی | کورد | | ٢٠١٨/١٠/٢٤ |
| ١٨ | باسم عبد الزمان الربيعي | کار و کاروباری کۆمەڵایەتی | شیعە | | ٢٠١٨/١٠/٢٤ |
| ١٩ | فاروق امين | داد | کورد | | ٢٠١٩/٦/٢٤ |
| ٢٠ | عبد الله العيبي باهض | گواستنەوە | شیعە | | ٢٠١٨/١٠/٢٤ |
| ٢١ | احمد رياض العبيدي | وەرزش | سوننە | | ٢٠١٨/١٠/٢٤ |
| ٢٢ | قصي عبد الوهاب السهيل | خوێندنی باڵا | شیعە | | ٢٠١٨/١٢/١٨ |
| ٢٣ | علاء العلوان | تەندروستی و ژینگە | شیعە | | ٢٠١٨/١٢/١٨ |

**ڕێژەی پێکهاتەکان لە حکومەتەکەی عادل عەبدولمەهدیدا ٢٠١٨:**

بەپێی خشتەی ژمارە ١١ بەرکەوتەی هەر پێکهاتەیەکی سەرەکی بەم شێوەیە بوو، کە لە خشتەی ژمارە ١٢ دا خراوەتە ڕوو:

| ڕێژەی پێکهاتەکان لە حکومەتەکەی عادل عەبدولمەهدی ٢٠١٨ خشتەی ژمارە (١٢) | | | |
|---|---|---|---|
| ت | پێکهاتە | ژمارەی وەزارەت | ڕێژەی سەدی وەزارەت |
| ١ | شیعە | ١٣ | ٥٦.٥٢ |
| ٢ | سوننە | ٦ | ٢٦.٠٨ |
| ٣ | کورد | ٣ | ١٣.٠٤ |
| ٤ | مەسیحی | ١ | ٣.٤ |

ئەگەر بێتوو بەراوردێک بکەین لە نێوان ڕێژەی نوینەرایەتی هەر پێکهاتەیەک و بەرکەوتەیان لە حکومەت ئەوا جیاوازییەکان بەم شێوەیەی کە لە خشتەی خوارەوەدا خراوەتە ڕوو دەردەکەوێت:

| بەراوردی نێوان بەرکەوتەی پێکهاتەکان وکورسیەکانیان لە پەرلەمان و حکومەتدا ٢٠١٨<br>خشتەی ژمارە ١٣ | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ت | پێکهاتە | ژمارەی کورسی پێکهاتەکان پەرلەمانی ٢٠١٨ | ڕێژەی پێکهاتەکان لە پەرلەمان ٢٠١٨ | ژمارەی وەزارەتی پێکهاتەکان لە حکومەتی عەبدولمەهدیدا ٢٠١٨ | ڕێژەی پێکهاتەکان لە حکومەتی عەبدولمەهدیدا ٢٠١٨ | بەراوردی ڕێژەی نێوان پەرلەمان و حکومەت ٢٠١٨ |
| ١ | شیعە | ١٨٤ | ٥٥.٩٢ | ١٣ | ٥٦.٥٢ | ٦٠.٠ + |
| ٢ | سوننە | ٧٤ | ١٨.٢٢ | ٦ | ٢٦.٠٨ | ٩٠.٣ + |
| ٣ | کورد | ٥٨ | ١٧.٦٢ | ٣ | ١٣.٠٤ | ٥٨.٤ − |

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە سوننە بەڕێژەی لە ٣.٩٠٪ زیاد لە ئاستی خۆی بردووە لە وەزارەتەکان و کوردیش بە ڕێژەی لە ٤.٥٨٪ کەمتری بەرکەوتووە لە ئاستی خۆی ئەگەر بەراوردیان بکەین لەگەڵ ئەو کورسییانەی کە هێناویانە لە پەرلەمان. هەروەها پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کە پۆستەکانی سەرۆکایەتی کۆمار و سەرۆکایەتی پەرلەمان بەهاوبەشی دابەشکراون لە نێوان پێکهاتەکان بەجۆرێک هاوسەنگی دروستکردووە لە نێوان هەر سێ سەرۆکایەتییەکە. بەڵام لە سەرۆکایەتی کۆمار تەنها سەرۆک هەیە و هیچ جێگرێکی بۆ خۆی دانەناوە، پێدەچێت هۆکار کەمی ڕێژەی کورد لە بەرامبەر شیعە و سوننە لە حکومەت بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ویستراببێت ئەو هاوسەنگییە بەتەواوەتی بێت لەکۆی گشتی پۆستەکان. چونکە ڕێژەی کەمییەکە کە بریتییە لە ٤.٥٨٪ بخرێتە بەر سەرۆکی کۆمار کە هیچ جێگرێکی نییە و سوننە و شیعە لێی بێ بەشن. بەهەر حاڵ لە ڕوانگەی نێوان کورسییەکانی پەرلەمان و پۆستە وەزارییەکان کورد کەمتری لە ڕێژەی خۆی بەرکەوتووە، بەڵام ئەو خاڵە نەک نەبووەتە کێشە لە نێوان پێکهاتەکان بەتایبەت کورد و شیعە یان سوننە، بەڵکو جێگەی سەنجی لایەنەکان نییە بەتایبەت لەلایەن کوردەوە. بۆیە دەتوانین بڵێین لەڕووی ڕێژەوە کورد کێشەی نییە و لە حکوومەتیشدا وەک هاوبەش مامەڵە دەکات و سەرجەم پێهاتەکان لە کابینەکەدا بەپشک و بەشی خۆیان ڕازین وەک بەشێک لە هاوبەشی دەسەڵات.

حکومەتەکەی عادل عەبدولمەهدی ڕووبەڕووی ناڕەزایی شەقام و لایەنە

سیاسییەکان بوویەوە، ئەوەبوو دوای زۆربوونی ناڕەزاییەکان لایەنەکان بەتایبەت شیعە و مەرجەعییەتەکەیان بڕیاریاندا حکومەتێکی کاتی دروستبکرێت و حکومەتەکەی عادل عەبدولمەهدی کۆتایی پێ بهێنرێت. بۆ جێگرتنەوەی عەبدولمەهدی چەند کەسایەتییەکی شیعی ڕاسپێردران، یەکەمیان عەلی عەلاوی بوو، سەرەڕای ئەوەی لە سەرەتادا شیعەکان لەسەری کۆک بوون، بەڵام دڵخوازی هەموویان نەبوو بۆیە لەماوەی دیاریکراوی خۆیدا نەیتوانی حکومەتەکە پێکبهێنێت و شکستی هێنا. دووەم کەسایەتی شیعە عەدنان زورفی بوو ئەویش هەوڵی زۆریدا بۆئەوەی حکومەتێک دروستبکات، بەڵام نەیتوانی و بەشکست کۆتایی بەهەوڵەکانی ئەویش هات. سێیەم کەسایەتی موستەفا کازمی بوو کە لە ٩ ی٤ی ٢٠٢٠ لەلایەن سەرۆک کۆمارەوە بە مەرسومی فەرمی ڕاسپێردرا بۆ پێکهێنانی کابینەکەی، ئەویش دوای گفتوگۆی لەگەڵ پێکهاتە سەرەکییەکان توانی لە کۆتا ڕۆژەکانی ماوەی مانگەکەی کابینەکەی پێکبهێنێت و حکومەتە کاتییەکەی دروستبکات وەک ئەوەی کە لە خشتەی ژمارە (١٤)دا خراوەتە ڕوو.

**پێکهاتەی حکومەتەکەی موستەفا کازمی ٢٠٢٠:**

شەوی ٦لەسەر ٧ی ئایاری ٢٠٢٠ دوای هەوڵێکی زۆری لایەنە بەشداربووەکانی کابینەکەی کازمی کە لە ٩ی نیسانی ٢٠٢٠ ڕاسپێردرابوو بۆ پێکهێنانی کابینەی نوێ. لە کۆی ٢٠ وەزارەت کە پێشکەشی کرد ١٥ وەزارەت متمانەی وەرگرتوو و ٥ وەزارەتیشیان کاندیدەکانیان ڕەتکرانەوە و ٢ وەزارەتیش کە دەرەوە و نەوت بوون دواخران.

پێکهێنانی ئەم کابینەیە زۆر لە کابینەکانی پێش خۆی دەچێت لەڕووی گفتوگۆی لایەنەکان و جۆری پێکهاتەکەی کە هیچ جیاوازییەکی بەرچاو و گەورەی نییە. چونکە ئەو ڕێژەیەی کە پێکهاتە سەرەکییەکان هەیان بووە لە کابینەکەی عادل عەبدولمەهدی بەهەمان شێواز بۆیان دانراوە و هەریەکەیان پشکی خۆی بۆ دیاریکراوە. شیعە ١٣، سوننە ٦، کورد ٣، یەک وەزارەتیش بۆ کریستیانەکان دانرا.

کەواتە ئەم دابەشکارییەی دەسەڵات بەهەمان شێوازی کابینەکەی عادل عەبدولمەهدی بووە. بەشێوازێک کە دابەشکارییەکە لە هەموو جۆری وەزارەتەکاندا هەبووە ئەوەی کە پێی دەوترێت سیاددیی و خەدەمی و ...هتد. بۆ نمونە کورد وەزارەتێکی سیادی لابووە لە پێشدا ئێستاش وەزارەتێکی سیاددی هەیە و بەهەمان شێوەش بۆ شیعە و سوننەش هەروایە.

تەواونەکردنی کابینە وەزارییەکەش شتێکی نوێ نەبوو، لە دوای ٢٠٠٣وە بەدەگمەن دەبینرێت کابینەیەکی وەزاری بەیەک جار و بەتەواوەتی لە یەک کۆبوونەوەی پەرلەمان هەموو پۆستە وەزارییەکان پڕکرابێتەوە و کابینەکە بێ گرفت تەواو بوویێت.

بۆ نموونە لە خوولی دووەمی مالیکی لە ٢٠١٠دا وەزارەتەکانی بەرگری و ناوخۆ و ئاسایشی نیشتمانی مایەوە و مالیکی خۆی بەڕێوەی دەبردن بۆماوەی زیاتر لە دوو ساڵ. بەهەمان شێوە لە سەردەمی حەیدەر عەبادیدا حکومەتەکەی پێ تەواو نەکرا نەک هەرئەوەندە، بەڵکو هێندە پەلەی بوو چاوەڕێی کوردی نەکرد کە لە کۆبوونەوەدا بوون لە سلێمانی هەتا وەڵامی کۆتایی لە شاندی کوردی وەرگرێت ئەو لە پەرلەمان لە٨ی ئەیلولی ٢٠١٤ متمانەی بۆ حکومەتەکەی وەرگرت بەناتەواوی، پاشان کابینەکەی لە ٢٠١٤/١٠/١٨ تەواوکرد، دوای کەمتر لە ساڵێک(٢٠١٥) ژمارەی وەزیرەکانی کەمکردەوە. کابینەکەی عادل عەبدولمەهدی ١٤ وەزیری متمانەیان وەرگرت پاشان کابینەکەی لە چەندین کاتی تردا تەواوکرد، کە تەواویش بوو کابینەیەکی ناکارای هەبوو. بەهەمان شێوە موستەفا کازمی توانی  لە دوو کاتی جیاوازدا متمانە بۆ کۆی وەزیرەکانی وەربگرێت و کابینەکەی تەواو بکات. سەیری خشتەی ژمارە ١٤ بکە. هەموو ئەم ناتەواوی کابینانە لە سەرەتای کاریانەوە بەڵگەیەکی تەواوی ناسەقامگیری پرۆسەی سیاسییە لە دوای ٢٠٠٣وە کە نەتوانراوە تەنانەت سەرکردەی پێکهاتە ساسییەکان پێکەوە لەچوارچێوەی ڕێکەوتنی خۆیان پرۆسەی متمانەی کابینەکان بەتەواوەتی بەڕێوەبەرن کە ئەمە بەشێکی گرنگە لە پرۆسەی سازانی نێوان پێکهاتەکان.

کەواتە چۆنیەتی دروستبوونی ئەم کابینەیە بەهەمان شێوازی ئەوانی پێش خۆی بووە و جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەوانی تردا نەبووە. ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێت کە داهاتووی ئەم کابینەی کازمی هەمان ئەنجامی کابینەکانی پێشووی دەبێت لەڕووی کارکردن بۆ سەرپێخستنی پرۆسەی سیاسیی و سازانی نێوان پێکهاتەکان بەتایبەتی یەکێک لەو گریمانانەی کە لەوەدەچێت ببێتەخاڵی لاوازی کازمی ئەوەیە کە خاوەن کوتلەی پەرلەمانی نییە، هەمان ئەو کێشەی کە ڕووبەڕووی عادل عەبدولمەهدیش بوویەوە، بۆیە دەبێت بەردەوام لە بەردەم فشاری کوتەلە بە هێزەکان و کوتلە سەرەکییەکاندا بێت و نەتوانێت بەتەواوەتی ئەوە بەدیبهێنێت کە لە پێناویدا دروستبووە. ئەگەرچی مالیکی کە خاوەنی کوتلەیەکی بەهێز و گەورەش بوو ئەنجامێکی پۆزەتیڤی نەبوو بۆ پرۆسەی سیاسی و پراکتیزەکردنی هاوبەشی لە دەسەڵاتدا لە ماوەی ٨ ساڵی حوکمڕانیدا، بگرە بەپێچەوانەشەوە بوو.

بۆیە گرنگە ئەوە بزانرێت سەرەڕای قەیرانە کەڵەکەبووەکانی کابینەکانی ڕابردوو کازمی لەمکاتەدا لە بەردەم گەرمبوونی قەیرانی نوێی ناوخۆیی و هەرێمیی و نێودەوڵەتیدایە. هەرچەندە کازمی مەقبولیەتێکی هەیە لەلای ئەمریکییەکان و بەریتانییەکان، بەڵام کارەکانی داهاتوویی و سیاسەتەکانی لە بەرامبەر ئێران لە عێراق سەنگی مەحەکە و ئەوەش لەو ماوەیەی کە ماوێتی زۆر زەحمەتە بەدیبهێنێت. خشتەی خوارەوەش کۆی کابینە وەزارییەکەی موستەفا کازمی دەخاتە ڕوو.

**پێکهاتەی حکومەتەکەی مصطفى الكاظمي ٢٠٢٠**
**خشتەی ژمارە (١٤)**

| ت | ناو | پۆست | پێکهاتە | قەوارەی سیاسی | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | مصطفى الكاظمي | سەرۆک | شیعە | مستقل- | |
| | **الوزارات السيادية** | | | | |
| ٢ | عثمان علي فرهود مشير الغانمي | ناوخۆ | شیعە | | ٢٠٢٠/٥/٧ |
| ٣ | جمعة عناد سعدون خطاب | بەرگری | سوننە | | ٢٠٢٠/٥/٧ |
| ٤ | علي حيدر عبدالأمير علاوي | دارایی | شیعە | | ٢٠٢٠/٥/٧ |
| ٥ | إحسان عبدالجبار إسماعيل | نەوت | شیعە | | ٢٠٢٠/٦/٦ |
| ٦ | فؤاد محمد حسين | دەرەوە | کورد | | ٢٠٢٠/٦/٦ |
| ٧ | خالد بتال نجم عبدالله | پلاندانان | سوننە | | ٢٠٢٠/٥/٧ |
| | **الخدمية** | | | | |
| ٨ | إيفان فائق يعقوب | کۆچ و کۆچبەران | کریستیان | | ٢٠٢٠/٦/٦ |
| ٩ | علاء أحمد حسن | بازرگانی | سوننە | | ٢٠٢٠/٦/٦ |
| ١٠ | ماجد مهدي حنتوش علي | کارەبا | شیعە | | ٢٠٢٠/٥/٧ |
| ١١ | محمد كريم جاسم | کشتوکاڵ | شیعە | | ٢٠٢٠/٦/٦ |
| ١٢ | علي حميد مخلف محسن | پەروەردە | سوننە | | ٢٠٢٠/٥/٧ |
| ١٣ | أركان شهاب أحمد كاظم | الاتصالات | شیعە | | ٢٠٢٠/٥/٧ |
| ١٤ | منهل عزيز محمود عبدالرحمن | پیشەسازی وکانزاکان | سوننە | | ٢٠٢٠/٥/٧ |
| ١٥ | حسن ناظم عبد حمادي | رۆشنبیری و گەشتوگوزار و شوێنەوار | شیعە | | ٢٠٢٠/٦/٦ |
| ١٦ | مهدي رشيد مهدي | سەرچاوە ئاوییەکان | شیعە | | ٢٠٢٠/٥/٧ |
| ١٧ | نازنين محمد وسو شيخ محمد | شارەوانی و نشتەجێبوون و بیناسازی | کورد | | ٢٠٢٠/٥/٧ |
| ١٨ | عادل حاشوش جابر جاسم | کار و کاروباری کۆمەڵایەتی | شیعە | | ٢٠٢٠/٥/٧ |
| ١٩ | سالار عبدالستار محمد حسين | داد | کورد | | ٢٠٢٠/٦/٦ |
| ٢٠ | ناصر حسين بندر حمد | گواستنەوە | شیعە | | ٢٠٢٠/٥/٧ |
| ٢١ | عدنان درجال مطر | وەرزش | سوننە | | ٢٠٢٠/٥/٧ |
| ٢٢ | نبيل كاظم عبد الصاحب | خوێندنی باڵا | شیعە | | ٢٠٢٠/٥/٧ |
| ٢٣ | حسن محمد عباس سلمان | تەندروستی و ژینگە | شیعە | | ٢٠٢٠/٥/٧ |

لەم کابینەیەدا کە بۆ ماوەیەکی کاتی دروستکراوە لەژێر فشاری شەقام و لایەنە سیاسییەکان، وەک ئاماژەمان پێکرد هەمان سیستەم و دابەشکاری حکومەتەکەی عادل عەبدولمەهدی پەیڕەوکراوە، بەجۆرێک ڕێژەی پێکهاتەکان وەک خۆیەتی و هیچ دەستکاری نەکراوە وەک لە خشتەی ژمارە ١٥ دیارە و لەگەڵ خشتەی ژمارە ١٢ هیچ جیاوازییەکی نییە کە لەسەرەوە خراوەتەڕوو. بۆیە لەڕووی بەراوردکارییەوە لەگەڵ حکومەتەکەی عەبادیدا هەمان دەرئەنجامی بەراوردکاری هەیە کە لەگەڵ حکومەتەکەی عادل عەبدولمەهدیدا کراوە لە خشتەی ژمارە ١٣دا.

| ڕێژەی پێکهاتەکان لەکابینەکەی موستەفا کازمیدا ٢٠٢٠<br>خشتەی ژمارە (١٥) | | | |
|---|---|---|---|
| ت | پێکهاتە | ژمارەی وەزارەت | ڕێژەی سەدی |
| ١ | شیعە | ١٣ | ٥٦.٥ |
| ٢ | سوننە | ٦ | ٢٦.٠ |
| ٣ | کورد | ٣ | ١٣.٠ |
| ٤ | مەسیحی | ١ | **٣.٤** |

**دەرئەنجام و کۆتایی:**

ئەوەی لایپهارت پێی وابوو کە هاوبەشی لە دەسەڵات و نوێنەرایەتی ڕێژەیی دەبێتە هۆی دروستبوونی سەقامگیری و ئاشتەوایی بەشێوەیەکی کرداری لەوماوەیەدا ٢٠١٤ بۆ ٢٠٢٠ لە سێ کابینەی جیاوازدا بەشێوەیەکی کرداری بەدی نەهات هەرچەندە ڕەنگدانەوەی بەشداری لە حکومەت و پەرلەمان بەم شێوەیە بووە:

| **لە نێوان ساڵانی (٢٠١٤ – ٢٠١٨) دا**<br>**خشتەی ژمارە(١٦)** | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | **سەردەمی حیدەر عەبادی** | | **سەردەمی عادل عبدولمەهدی** | | **سەردەمی موستەفا کازمی** | |
| | ئەنجومەنی نوێنەران ٢٠١٤ | حکومەت ٢٠١٥ | ئەنجومەنی نوێنەران ٢٠١٨ | حکومەت ٢٠١٨ | حکومەت ٢٠٢٠ | |
| شیعە | ٥٣.٠٤ | ٦٩.٥٦ | ٥٥.٩٢ | **٥٦.٥٢** | **٥٦.٥٢** | − + |
| سوننە | ٢١.٩٥ | ١٧.٣٩ | ٢٢.١٨ | ٢٦.٠٨ | ٢٦.٠٨ | + + |
| کورد | ١٨.٩٠ | ١٣.٠٤ | ١٧.٦٢ | ١٣.٠٤ | ١٣.٠٤ | = − |
| | | | | | | |

ئەگەر سەیرێکی ئەم خشتەیە بکەین دەبینین لە ئەنجومەنی نوێنەران ڕێژەکەی بەرزبووەتەوە لە ۲۰۱۸دا بەڕێژەی ۲.۸۸٪ ، بەڵام لە حکومەتدا ڕێژەکەی دابەزیوە بەڕێژەی ۱۳.۰٤٪ ، ئەویش بەهۆی ئەوەی لە ۲۰۱٥دا عەبادی وەزیرەکانی پێکهاتەکانی تری کەمکردەوە لە بەرامبەردا شیعەکانی زیاد کرد، بەڵام لە سەرەتایی کابینەکەیدا لە ۲۰۱٤ دا ڕێژەکە بریتی بوو لە ٥٤.۲۸٪ (وەک لە خشتەی ژمارە ۷ و۸دا دیارە)، ئەگەر ئەوەی سەرەتا وەرگرین ئەوا شیعە لە ۲۰۱۸دا بەڕێژەی ۲.۲٤٪ زیادی کردووە. سوننەش لە هەردوو بارەکەدا زیادی کردووە بەجۆرێک ۲۰۱۸ بۆ سوننە زۆر لە ۲۰۱٤ باشترە بۆیان و بەرەوپێشچونێک لە پەرلەمان و حکومەتدا دەبینرێت. بەڵام بەپێچەوانەوە کورد لە ئەنجوومەنی نوێنەران و کابینە وەزارییەکەدا کەمی کردووە و ڕێژەکەی دابەزینی بەخۆیەوە بینیوە. بۆیە لە ۲۰۱۸دا ئەوەی زیانی بەرکەوتبێت و نوێنەرایەتی و پشکداری لە بەغدا کەمی کردبێت بریتی بووە لە کورد.

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە دابەشکاریی و هاوبەشی لە پۆستەباڵاکاندا بەهەمان ڕێژەی کورسییەکانی پەرلەمانە بەهەندێک جیاوازی کەم یان زیادی بچووک کە کاریگەری ناکاتە سەر پرۆسە سیاسییەکە و ئەوەش نەبووەتە کێشە لە نێوان لایەنەکاندا، بەڵام ئەوەی کێشەیە شێوازی مامەڵەکردن و جۆری ئەو سیاسەتەیە کە پیادەدەکرێت لەژێر سایەی حکوومەتی هاوبەش و ڕێژەی تەواوەتی پێکهاتەکان. بەڵێ لە پەرلەمان ڕێژەی هەموو پێکهاتەکان هەیە، بەڵام هەندێکجار حساب بۆ سازان ناکرێت و بە مەنتقی زۆرینە و کەمینە پرۆسەکە بەرێوەدەبرێت کە ئەمە سەرچاوەی ناسەقامگیریی و ناکۆکی لایەنەکانە کە نزیکترینیان یاسای قەرزبوو(قانون تمويل العجز المالي)، کە لەڕێکەوتی ۲۰۲۰/۱۱/۱۲ دا لە پەرلەمان بەزۆرینە بەبێ ڕەچاوکردنی خواستی پێکهاتەی کوردی تێپەڕینرا. ئەم هانگاوە و هاوشێوەکانی لە پرۆسەی تەوافوقیدا جێگەی هەڵوێستە لەسەرکردنە بەتایبەتی لە عێراقدا لە دوای ۲۰۰۳ وە لەسەر بنەمای تەوافوق بیناکراوەتەوە، بەجۆرێک زۆرینە ستەمکاری دروست نەکات ڕێگربێت لە دیکتاتۆریەت. بەڵام دوای ۱۷ ساڵ عێراق لەڕووی پراکتیکییەوە کەیسێکی سەرکەوتووی تەواو تەوافوقی پیشان نەداوە، بەردەوام گرفت و قەیرانی هەبووە و هەیە لەسەر ئاستی پێکهاتە سەرەکییەکان و چۆنیەتی مامەڵەکردنیان لەگەڵ پرۆسەی سیاسی.

سیاسەتی پشتگوێخستن و نادیدەگرتنی خواستی پێکهاتە سەرەکییەکان وایکردووە بەردەوام تەوافوق و هاوبەشی لەدەسەڵاتدا ڕەنگدانەوەی ئەرێنی و پراکتیکی لە پرۆسەی سیاسیدا نەبێت و هەمیشە ناسەقامگیری بەردەوامی هەبێت سەرەڕای ئەوەی کە سازان وەک پرۆسە و میتۆد و پراکتیک سەلمێنراوە کە دەبێتە هۆی سەقامگیری لە کۆمەڵگە دابەشبووەکاندا.

کۆی پرۆسەکە ئەوەمان بەڕوونی پێ دەڵێت، کە تەنها شیعە توانیویەتی بەردەوام بێت لە پاراستنی نیوە+١ی ئەنجوومەنی نوێنەران و ئەنجوومەنی وەزیران بەتایبەت لە سەردەمی دەستکاریکردنی کابینەکەی عەبادی لە ساڵی ٢٠١٥دا، کە ڕێژەی شیعە بەرزبوویەوە بۆ لە ٦٩.٥٦٪ کە ئەمەش لەڕووی سیاسیی و پراکتیکییەوە گرنگی ستراتیجی بۆ شیعە هەبوو کە بتوانێت بەردەوام بێت لە پاراستنی ناوەندی بڕیاری حکومەت و پەرلەمان و پێگەی خۆی پێ بەهێز بکات، لەهەمانکاتدا سوننە و کوردیش ڕێژەی بەشدارییان بەجۆرێک بێت بەهەردووکیانەوە نەتوانن بەرامبەر شیعە بووەستن لە بڕیارێکدا لە ئەنجوومەنی وەزیران یان لە پەرلەمان دژی دەرچوونی یاسایەک بن وەک ڤیتۆ بەرامبەر بە شیعە. هەرچەندە شێوازی بەشداری سوننە و کورد بەشدارییەک بووە لەسەر بنەمای ڕێکەوتن لە حکومەت و هەڵبژاردن لە پەرلەمان، بەڵام وادەردەکەوێت لە زۆربەی کاتدا وەک میوان و هێزی بێ کاریگەر مامەڵەیان لەگەڵدا کرا بێت. لەو بوارەشدا نموونە زۆرن لە پرۆسەی سیاسی عێراقدا لەڕووی ململانێ و وەلانانی یەکترییەوە بەتایبەت وەلانانی سوننە و کورد وەک دەرکردنی بڕیاری کۆتایی هێنان بەبوونی هێزە بیانییەکان لە عێراقدا لەلایەن پەرلەمانەوە لە ٢٠٢٠/١/٥دا کە بە تەنها لەلایەن شیعەوە لە پەرلەمان دەرکرا و سوننە و کورد ناڕازی بوون بەو هەنگاوە، بەڵام هیچیان پێنەکرا بۆ ڕاگرتنی ئەو هەنگاوەی شیعەکان و ئەوان توانیان زۆرینەی خۆیان بەکاربهێنن بۆ دەرکردنی بڕیارێک کە خۆیان بەتەنها ویستیان لەسەر بوو.

ئەمانە ئەوەمان لەلا پشت ڕاستدەکەنەوە کە سەرکردەکانی پێکهاتەکان کە ئاراستەی سیاسیی و کاری پەرلەمان و حکومەتیان لەبەردەستدا بوو لەوماوەیەدا ویست و ئیرادەی هاوبەشی ڕاستەقینەیان لەلا دروست نەبووە بۆ بەڕێوەبردنی دامەزراوە سیاسییەکان و هێنانەکایەی ئاشتی کۆمەڵایەتی لە نێوان پێکهاتەکانی عێراقدا، بەواتایەکی تر دابەشبوونەکان زۆرتر بوون هەرچەندە لەڕووی پرکراتیکییەوە ڕێژەی پێکهاتەکان لە پەرلەمان نزیکبووە لە بوونیان لە کۆمەڵگە و بەهاوبەشی حکومەتیان پێکهێناوە لەڕێگەی ڕێکەوتنەوە، بەڵام بەردەوام نا ئارام بووە.

بۆیە دەتوانین بڵێین گرفتەکە لە نەبوونی ویستی پێکەوەیی و کاری هاوبەشی ڕاستەقینەیە لە نێوان شیعە و سوننە و کورددا، هەریەکەیان پشکی خۆی بەردەکەوێت لە پرۆسەکەدا، بەڵام کاریان پێچەوانەی ئاراستەی یەکترە.

# سەرچاوە و پەراوێزەکان


Arend Lijphart, “Consociationalism After Half a Century,” in Consociationalism and Power-Sharing in Europe: Arend Lijphart’s Theory of Political Accommodation, ed. Michaelina Jakala, Durukan Kuzu, and Matt Qvortrup (Cham: Springer International Publishing, 2018), 1–9, https://doi.org/10.1007/978-3-319-67098-0_1. P.8

2 Allison McCulloch and Joanne McEvoy, “Understanding Power-Sharing Performance: A Lifecycle Approach,” Studies in Ethnicity and Nationalism 20, no. 2 (October 2020): 109–16, https://doi.org/10.1111/sena.12326. P.111

٣ بۆ ئەم خشتەیە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:
http://www.bbc.co.uk/news/world-middle-east-٢٧٤٧٤٥١٨ هەروەرها
https://www.electionguide.org/elections/id/٢٤٢٥/ هەروەها ماڵپەری
کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق کە ئەنجامی سەرجەم پارێزگاکانی بڵاو کردەوە.

٤ بڕیاری دادگای باڵای فیدراڵی لەم لینەکەی خوارەوە https://www.iraqfsc.iq/news.٣٤٩٦/

٥ دیمانە لەگەڵ زانا ڕۆستایی ئەندامی شاندی کوردی بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ شیعە بۆ پێکهێنانی کابینەکەی عەبادی.

٦ دیمانە لەگەڵ زانا ڕۆستایی ئەندامی شاندی کوردی بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ شیعە بۆ پێکهێنانی کابینەکەی عەبادی.

٧ بۆ دروستکردنی ئەم خشتەیە و خشتەی پاشتریش سوودم لە پرۆتۆکۆلی پەرلەمان وەرگرتووە، هەروەها بەڕێز سامان عەبدوڵلا وەزیری دەوڵەت لە حکومەتەکەی عەبادی پشتڕاستی زانیارییەکانی بەشی پێکهاتەکان و قەوارە سیاسییەکانی کردووەتەوە.
http://ar.parliament.iq/LiveWebsites/Arabic/Container.aspx?MinutesOfMeetingsID=3631
http://ar.parliament.iq/LiveWebsites/Arabic/Container.aspx?MinutesOfMeetingsID=4629

٨ بۆ ئەم خشتەیە سوودم لە سایتی کەناڵی ڕووداو و ئەلجەزیرە وەرگرتووە وەک سەرچاوەیەکی هەواڵی لەم لینکەی خوارەوە:
https://www.rudaw.net/sorani/middleeast/iraq/190520182 هەروەها سەیری ئەم لینکەش بکە
https://studies.aljazeera.net/ar/reports/2018/06/180628112900961.html

٩ بۆ دروستکردنی ئەم خشتەیە سوودم لە ماڵپەڕی فەرمی ئەنجومەنی نوینەرانی عێراق وەرگرتووە لەم لینکەی خوارەوە:

الرئيس – مجلس النواب العراقي (parliament.iq)
١٠ بۆ دروستکردنی ئەم خشتەیە سوودم لەم پرۆتۆکۆلانەی ئەنجومەنی نوێنەران و ماڵپەری حکومەت وەرگرتووە:
مجلس النواب يمنح الثقة للسيد عادل عبد المهدي رئيس مجلس الوزراء و ١٤ وزيرا – مجلس النواب العراقي (parliament.iq)
محضر جلسة رقم (١٩) الثلاثاء (٢٠١٨/١٢/١٨) م – مجلس النواب العراقي (parliament.iq)
محضرجلسة رقم (٢٣) الإثنين (٢٠١٨/١٢/٢٤) م – مجلس النواب العراقي (parliament.iq)
محضر جلسة رقم (٢٦)الاثنين (٢٠١٩/٦/٢٤) م – مجلس النواب العراقي (parliament.iq)
http://www.cabinet.iq/uploads/SixthIraqiGovernment/index.htm
١١ مەرسومی کۆماری ژمارە ١٢ لە ڕێکەوتی ٢٠٢٠/٤/٩دا دەرچووە.
١٢ بڕوانە گفتوگۆی ناو ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق لەم پرۆتۆکۆلانەی خوارەوە:
محضر جلسة رقم (١) الخميس (٢٠٢٠/٥/٧) – مجلس النواب العراقي (parliament.iq)
محضر جلسة رقم (٣) السبت (٢٠٢٠/٦/٦) م – مجلس النواب العراقي (parliament.iq)
١٣ بڕوانە خشتەی ژمارە ١١ کە بەوردی هەموو ئەو کاتانەی تێدا دیاریکراوە کە حکومەتەکەی عادل عەبدولمەهدی تێدا تەواوکراوە.
١٤ بۆ ئەم خشتەیە سوودم لە پرۆتۆکۆلی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق وەرگرتووە لەم لینکانەی خواروە:
محضر جلسة رقم (١) الخميس (٢٠٢٠/٥/٧) – مجلس النواب العراقي (parliament.iq)
محضر جلسة رقم (٣) السبت (٢٠٢٠/٦/٦) م – مجلس النواب العراقي (parliament.iq)
١٥ محضر جلسة رقم (٢٢) الخميس (٢٠٢٠/١١/١٢) م – مجلس النواب العراقي (parliament.iq)
١٦ قرارات وتوصيات الجلسة الاستثنائية الاحد/ ٥ كانون الثاني/ ٢٠٢٠ – مجلس النواب العراقي (parliament.iq)

# کوردستانی سوور لە گەمەی سۆڤییەتدا



**نووسینی: عادل صدیق عەلی**

لەدایکبووی ١٩٨٤ هەڵەبجە ، ماستەر لە مێژووی هاوچەرخ. سێ بەرهەمی چاپکراوی هەیە. چەند وتاری لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بڵاوبووەتەوە.

## بەشی یەکەم/ زەمینەی دروستبوونی کۆماری کوردستانی سوور

### باسی یەکەم/ مێژووی پەیوەندییەکانی کورد و ڕووسیا:

زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکانی بەتایبەت سەدە و نیوێک و سەدەی ڕابردوو، لەوە دەدوێن کە کورد لە هەرێمی قەفقاس ژیاوە، واتە پێش ئەوەی هەرێمەکە لەلایەن ڕووسەکانەوە داگیربکرێت و، سنوورەکانی سێ ئیمپراتۆریی عوسمانی و ڕووسیا و پاشایەتی ئێران دیاری بکرێن(١). ئەوکاتیش کوردستان دابەش ببوو بەسەر دەوڵەتانی ئێرانی و عوسمانیدا، گەلی کورد لەلای سەرووی ئێران و لەلای ڕۆژهەڵاتی عوسمانییەوە هاوسنوور بوو لەگەڵ قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ڕووس(٢).

بەداگیرکردنی ناوچەکە لەلایەن ڕووسیاوە، کە تێکشکانی پاشایەتی ئێران و پاشان عوسمانی لە ئەنجامی زۆر شەڕی خوێناویدا لە سەردەم و قۆناغی جیاجیادا لێکەوتەوە، بەشێکی کوردستان خرایە سەر ئیمپراتۆریەتی ڕووسیا(ڕووسیا بە درێژایی سەدەی نۆزدە، دوو شەڕی گەورەی لەگەڵ ئێراندا واتە(١٨٠٥-١٨١٣)و چوار شەڕی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی ١٨٠٥-١٨١٣، ١٨٣٨-١٨٣٩، ١٨٥٣-١٨٥٦، ١٨٧٧-١٨٧٨ کردووە). لە ئەنجامی ئەو شەڕانەدا کە زۆرجار پارچەیەکی کوردستان دەبووە گۆڕەپانی شەڕە دڕندانە و کاولکارەکانیان، گەلی کوردیش تووشی زیانێکی هەمەلایەنەی بەتایبەتی گیانی و ئابووری بووە، ناوچە کوردنشینەکان لە ئاکامی شەڕەکانیاندا و بەپێی پەیمانەکانیان، چەندینجار دەستبەدەست کراون، دواین جار، بەپێی پەیمانی (بریست لیتۆفیسک)، قارس و ئەردەهان لەلایەن بەلشەفییەکانەوە، بەبێ ڕەزامەندی و پرسکردن بە دانیشتوانیان کە زۆربەیان کوردبوون، درانەوە بە کەمالییەکان(٣).

شەڕەماڵوێرانکەرەکانی ڕووسیا و عوسمانی و ئێرانی پاشایەتی لە سەدەی نۆزدەیەمدا بگرە لە پاش یەکەمین جەنگی جیهانیشەوە زۆربەی هەرە زۆریان لەسەر خاکی کوردستان ڕوویانداوە. کورد زیانێکی یەکجار زۆری گیانی و ماڵی لێکەوتووە چەند جارێک سنوورەکانی نێوان ئەم سێ دەوڵەتە داگیرکەرە بەهۆی ئەم شەڕانەوە هەر لەسەر خاکی کوردستان گۆڕدراون، هەردەمێک دەسەڵاتی یەکێکیان بەسەر هەندێک ناوچە و هەرێمی کوردستانەوە بووە، بەوچەشنەی کە خۆیان ویستوویانە لەگەڵ دانیشتوانەکەیدا جوڵاونەتەوە، دانیشتوانەکەیان دەرکردووە یان ناچاریان کردوون بۆ شوێنێکی دیکە بگوازنەوە، بۆ تێکدانی دیمۆگرافیا و ڕەوشی ئەتنیکیی و قەوارەی ناوچە و هەندێ لەو هەرێم و ناوچانە بۆ وێنە: قارس، ئەردەهان، خۆی، ماکۆو سەڵماس...هتد(٤).

سەرچاوە ڕووسییەکان هەتا کۆتاییەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی، باسیان لە دابەشبوونی کوردستان بەسەر سێ ئیمپراتۆری ڕووس و ئێران و عوسمانیدا دەکەن، بگرە گەڕیدە و مێژوونووس و سیخوڕ و پیاوانی لەشکریی و ڕۆژهەڵاتناس و... تا ساڵی ١٩٣٠،

واته ساڵی هەڵوەشاندنەوەی کوردستانی سوور لەلایەن ڕژێمی ستالینەوە، هەموویان دان بەوەدا دەنێن کە بەشێکی کوردستان دەکەوێتە چوارچێوەی ڕووسیا (سۆڤیەت)ەوە(٥).

لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا وەک چۆن گەلی کورد لەژێر کاریگەری بانگەوازی جیهاد و بەناوی ئیسلامەتییەوە کەوتە پشتیوانیکردن لە دەوڵەتی عوسمانی، ڕووسەکانیش کەوتنە پشتگیریکردن لە میلیشیا ئەرمەنییەکان بۆ ئەنجامدانی شەڕی قڕکردن لە کوردستان(٦). فەرماندە سەربازییەکانی ڕووس کە لەژێر کاریگەری سەرکردە سەربازییە ڕەگەزپەرست و کوشتارچییەکان و کەنیسەی ڕووسی ئەرسەدۆکسیدا بوون هەربۆیە لە دوای تێکشکاندنی عوسمانییەکان لە کوردستان وێرانکاریی و تاڵان و ئابڕووبردنی »کوردانی کافر و بکوژانی ئەرمەن»یان دەستپێکرد، شەڕی لەناوبردن لە شاری (قامیش)وە دەستیپێکرد بۆ وان و بایەزید و بە خۆی و ڕەواندز و خانەقین دا تێپەڕی، ڕووسەکان خەڵکی ناوچەکەیان ناچاری دەربەدەری کرد، بە تەنها لە بایەزید و دەوروبەری دەیەکی دانیشتوانەکەی مابوونەوە و سەدان گوند وێرانکران، هێزە کرێگرتە ئەرمەنی و ڕووسییەکان لە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەری کۆمۆنیستی و لەکاتی پەرینەوەیان لە بەرەی ئەرزڕووم- زەنجان هەزاران ئافرەت و منداڵی کوردیان کوشت، ڕۆژانی ١٤و١٥ی مایسی ١٩١٥ شاری وان گەورەترین قەسابخانەی کوردەکانی بەدەستی ئەو هێزە ئەرمەنیانەی کە پێشی هێزەکانی ڕووسی کەوتبوون بەخۆوە بینی، ڕووس بەڵێنی دابوو شاری وان بگۆڕێ بۆ پایتەختی ئەو دەوڵەتەی بەڵێن بوو بۆ ئەرمەنەکانی دروستبکات، نزیکەی (٢٥٠)هەزار لەو ئەرمەنانە کۆبوونەوە کە بچنە پاڵ دەوڵەت و لەشکری ئەرمەنی، بە پشتیوانی لەشکری ڕووسی دەوڵەتی ئەرمەنیان ڕاگەیاند و نەخشەی هێرش و پاککردنەوەی ویلایەتی بەدلیس و دیاربەکر ڕاگەیەنرا، بەڵام هێزەکانی ڕووسیا لە بەرامبەر دژە هێرشی عوسمانییەکان شکان.

ڕاپۆرتەکانی ئینگلیز باس لە کوشتار و لەناوبردنی خەڵکی خانەقین کردووە بەدەستی ڕووسەکان، بەگوێرەی ئەو ڕاپۆرتانە نزیکەی (٥٠٠)کەسیان لە خەڵکی ئەو شارە کوشتووە، ئەوە سەرەڕای قوربانییە زۆرەکانی گوندەکانی دەوروبەری، سەدان کورد لە ترسی کوشتاری بە کۆمەڵ هەڵهاتن بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئینگلیز، ڕەواندزیش بە هەمان دەردی سریبرینیکای بۆسنە و هێرزەگۆڤینیای ساڵی ١٩٩٧ لێ بەسەرهات کە هێزەکانی سڕبیا ئەنجامیاندا، (ئەندرانیک) ئەفسەری ئەرمەنی تینوو بەخوێنی کورد نزیکەی (٦٠٠٠) منداڵ و ئافرەتی ئەو شارەی کوشت، بەشێوەیەک لە کۆی (٣٠٠٠) منداڵ تەنها (٦٠) منداڵ مابوونەوە. ڕووس و ئەرمەنەکان (٣٠) گوندیان لە برادۆست وێرانکرد، هەزاران کەس لە خەڵکی بادینان لە ترسی ئابڕووی خۆیان بەرەو موسڵ هەڵهاتن و بەشێکیان لە شەقامەکانی موسڵ لە برساندا مردن(٧).

**باسی دووەم/ دامەزراندنی کۆماری کوردستانی سوور:**

دوای سەرکەوتنی شۆڕش لە ڕووسیا(١٩١٧)، کە بە زیندانی گەورەی گەلان ناودەبرا، یەکێک لە هەنگاوە یەکەمینەکانی بەلشەفییەکان جاڕنامەی مافەکانی گەلانی ڕووسیا بوو. لەگەڵ ڕەتکردنەوەی سیاسەتی چەوساندنەوەی نەتەوەیی و ئەفراندنی بێمتمانەیی و دوژمنایەتی لە نێوان گەلانی ڕووسیادا، کە دەسەڵاتدارانی سەردەمی تساریزم پەیڕەویان دەکرد، جاڕنامەکە یەکسانی و سەروەری گەلانی ڕووسیای ڕاگەیاند و دانی بەوەدانا کە ئەو گەلانە مافی ئەوەیان هەیە بە ئازادی چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن بە مافی جیابوونەوە و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیانەوە. هەروەک هەموو جیاکارییەکی لە نێوان گەلانی ڕووسیادا قەدەغەکرد و مافی گەشەکردنی ئازادیدا بە کەمینە نەتەوەیی و ئیتنیکییەکانی وڵات. بەپێی ئەو جاڕنامەیە دەبوایە لە ماوەیەکی کورتدا ڕێکاری پێویست بۆ جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانە دەربکرێن. جاڕنامەکە بە ئیمزای لینین و ستالین بوو(٨). ئەڵبەت بەڕەچاوکردنی هۆکارەکانی مێژوویی و ئیتنۆگرافیی و جوگرافی، سنووری ئیداریی و نەتەوەییان بۆ دیاریکرا(٩).

کوردیش یەکێک بوو لەو کەمە نەتەوایەتییانەی کە دەبوو قەوارەیەکی بۆ دروستبکرێت، بەڵام کوردانی سۆڤیەت لە ساڵانی دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر لەوپەڕی نەهامەتی و نارەحەتیدا دەژیان، ئەوەش بەهۆی ئەو وێرانکاریی و قات و قڕیی و برسێتییەی کە لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆ و هاتنە ناوەوەی بەریتانیا بۆ باکۆ، هەروەها هێرش و پەلامارەکانی سوپای تورکیا بۆ سەر ئەرمینیا و ئازربایجان لە ساڵی ١٩١٨ ڕووبەڕوویان بوویەوە(١٠).

لە سەرەتادا ئازەرییەکان ناڕازی بوون لە دروستکردنی قەوارەیەک بۆ کورد، بەڵام لە کۆتاییدا یەکێک لە سەرکردە بەلشەفییە ناسراوەکان و یاوەری لینین و ستالین، کیرەف، کە لە ساڵی ١٩٢١ کرا بە سکرتێری پارتی کۆمۆنیستی ئازربایجان کاربەدەستانی ئازربایجانی ناچار کرد (١٩٢٣) قەزای کوردستان دابمەزرێنن(١١)، کە پایەتەختەکەی شاری لاچین بوو(١٢).

ناوچەکە، کە بە کوردستانی سوور یان قەزای کوردستان(بە ڕووسی ئویەزد) ئەناسرا، یەکەیەکی کارگێریی و ئەتنیکی بوو لە ئازربایجانی سۆڤیەتی لە نێوان ساڵانی ١٩٢٣-١٩٢٩. ئەم هەرێمە ناوچەیەکی فراوانی لەسەر سنوورەکانی ئازربایجان و ئەرمینیا(ئەرمەنستان) گرتبووەخۆ و ناگۆرنە قەرەباغی لە ئەرمینیا جیادەکردەوە(١٣).

دامەزراندنی قەزای کوردستان یان کوردستانی سوور لە ئازربایجان بەپێی ئەو بڕیارە بوو، هۆی دواکەوتنی دامەزراندنیشی هەتا ساڵی ١٩٢٣ بۆ دوو هۆی سەرەکی دەگەڕایەوە:

١ـ تا نیسانی ساڵی ١٩٢٠ دەسەڵاتی سۆڤیەتی لە ئازربایجان سەرنەکەوتبوو.
٢ـ ئازەرییەکان نەیاندەویست قەوارەیەکی نەتەوەیی بۆ کورد لەسەر خاکی ئازربایجان دروست ببێت. ئەوان ئەوەیان بەمەترسی لەسەر دوارۆژی وڵاتەکەیان دەزانی و گومان لەوە نەبوو کە ئەو قەوارەیە ڕۆژێک دێت دەبێتە بنەمایەک بۆ دەوڵەتێکی کوردی، لێرەوە بوو دژی ئەو بیرۆکەیە وەستانەوە(١٤).

لەلایەکی دیکەوە لە پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەرەوە گۆڕانکاری بەسەر زۆر شتدا هات، ئەو گۆڕانکارییانەش دوو ئەنجامی لێ بەدەست هات: ئەو کوردانەی کە بەردەوام لە کۆچ و ڕەودا بوون شوێن و جێگای خۆیان بۆ دیاریکرا، لە نێوان ساڵانی ١٩٢٣-١٩٢٩ لە سەردەمی لینیندا خوێندنگای تایبەت بە زمانی کوردی کرایەوە، هەروەها ڕۆژنامە و بڵاوکراوە بە زمانی کوردی بڵاوکرایەوە(١٥).

کوردەکانی سۆڤییەت بەگشتی لە ناوچە کشتوکاڵییەکانی ئەرمینیا و ئازربایجان و جۆرجیا و ژمارەیەکی تر لە کۆمارەکانی تری یەکێتی سۆڤییەت نیشتەجێ ببوون(١٦). ئەوەبوو لە ناوچەیەکی ئەم بەشەی کوردستاندا لە ئابی ١٩٢٣ کۆماری کوردستانی سووریان دامەزراند و(حسێن گاجییێڤ)یش وەک سەرۆکی کۆمیتەی بەڕێوەبەرێتی (حکومەتی خۆجێیی) کوردستانی سوور(١٧) و ئەلیاسۆف بە بەڕێوەبەری کاروباری پەروەردە و فێرکردنی کوردستان سوور دانران(١٨).

بێگومان ئەوە بوو بە کەشوهەوایەکی لەبار کە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە خۆیان بە کورد بزانن و کوردبوونی خۆیان لەو خاکەی(کوردستان) کە تێیدا دەژین سەلماند(١٩). کۆمارەکە لە شەش ناوچەیەک پێکهاتبوو، کە پێیان دەگووت دایرە(بازنە)، ئەوانیش بریتی بوون لە: کەلەبجاڕ، قوتوورلی، کوردحاجی، موورادخانلی، قەرەقشلاخ و قوبادلی(٢٠). دانیشتوانی ئەم ناوچانە کوردی زمان و بە دیالێکتی کرمانجی دەدوان(جگەلە قوبادلی)(٢١). پاشان ئەم قەزایە گۆڕا و بووبە هەرێمی نەتەوەیی کوردستان و خاوەنی ئۆتۆنۆمی(٢٢).

سنوورەکەشی بەم شێوەیە بوو، باکووری ناوچەی کوردستانی سوور بەهێڵی سەراورد(خط الراس) زنجیرە چیاکانی مراڤ داغی ئەم ناوچەیە لە ناوچەی گەنجە جیادەکاتەوە (واتە لە باکوورەوە زنجیرە چیاکانی مراڤ داغ کوردستان لە ناوچەی گەنجە جیادەکاتەوە هەورامی)و بە هێڵی سەراورد زنجیرە چیاکانی کانگوور- ئالانگیز کوردستان لەگەڵ ناوچەی نور=بائێزدی سەر بە ئەرمینیا هاوسنوورە و لە باشووری ڕۆژئاوایشەوە کوردستان هاوسنووری ناوچەکانی شارئورا-دەریلاگیز (دارالگیز)و زەنگەزوری کۆماری ئەرمەنستانی سۆڤیەتە.

سنوورەکانی کوردستان لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە بە ڕووباری ئاکیردا دەڕوات، تا سنوورەکانی ناوچەی پێشووی جەبرەئیل کە لە گوندی(ئەفەندیلەر)ەوە دەستپێدەکات تا

لەو شێنەی کە لقی لای چەپی ئەم ڕووبارەوە، واتە میل خیلۆڤ، دەڕژێتە ئەم ڕووبارە و سەرەنجام کوردستان لەگەڵ ناگورناقەرەباغ هاوسنوورە و، لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە، واتە لەو شوێنەی کە ڕووباری میل خیلۆڤ دەڕژێتە ڕووباری ئاکیرەوە تا زنجیرە چیاکانی موراڤداغ(٢٠). دەشتوانین بەم شێوەیە سنوورەکەی دیاری بکەین، مەڵبەند یان قەزای کوردستان کەوتبووە نێوان ناگۆرناقەرەباغ و ئەرمینیاوە، واتە لە ڕۆژهەڵاتەوە قەرەباغ و لە ڕۆژئاواشەوە ئەرمینیای سۆڤیەتی، لە باشوورەوە ناوچەی زەنگیلان و جوبرانلی لەسەر سنووری ئێران و لە باکووریشەوە چەند ناوچەیەکی ئازربایجان. مەڵبەندی کوردستان، کە ناوەندەکەی ئەبداڵیار(٢٤) بوو.

**ناوچەی کوردستان لەڕووی جیۆگرافییەوە دەکرێ بەسێ بەشەوە:**

١ـ دەوروبەری ڕووباری ئاراس کە دەشتە و کشتوکاڵی باشی لێ دەکرا، وەک: برنج و لۆکە، لە زستانانیشدا دەبووە لەوەرگای ئەو مەڕ و ماڵاتانەی لە زۆزانەکانەوە دادەبەزین.

٢ـ بناری شاخەکان، کە بە لەوەرگا و پاوانی زۆر دەوڵەمەند بوو، هەروەها خاوەنی زەوی کشتوکاڵیش بوو.

٣ـ چیاکان، کە بەزستانان ڕێژەیەکی کەمی خەڵکی لێ دەمایەوە، بەڵام هاوینان دەبوونە لەوەڕگا بۆ شوێنی مەڕ و ماڵاتەکانیان(٢٥).

ژمارەی دانیشتوانی کوردستانی سوور بەپێی گێڕانەوەکانی می.پێچێلینا کە یەکێک بووە لە ئەندامانی ئەو تیمەی ساڵی ١٩٢٤ سەردانی ناوچەکەی کردووە نزیکەی (٣٥–٤٠) هەزار کەس بووە(٢٦) ، بەڵام سەرژمێری ١٩٢٥ ژمارەکەی بە (٥٢٤٢٦)کەس داناوە، کە لەو ڕێژەیە ٧٢٫٣٪ واتە (٣٧١٨٢)کەسیان کورد بوون. ئەوەش بڵێین لە هەر شەش دایرەکە، قوبادلی نەبێت، کورد زۆرینە بوون(٢٧). دوای ئەم سەرژمێرییە هیچ سەرژمێرییەکی دیکە لەو ناوچەیە ئەنجام نەدرا(٢٨). لەڕووی مەزهەبیشەوە وەک پێچێلینا ئاماژەی بۆ دەکات، کوردانی ئەم ناوچەیە شیعە مەزهەب بوون(بەهۆی کارتێکردنی فارسەکانەوە)، ئەوە لەکاتیکدا کوردانی یەریڤان یان سوونني شافیعی بوون یاخود ئێزدی(٢٩).

دروستکردنی کۆماری کوردستانیش لەو ناوچەیەدا ژمارەیەک فاکتەری لە پشتەوە بوو، لەوانە:

١ـ زۆرینەی دانیشتوانی ناوچەکە کوردبوون.

٢ـ بانگەشەی بەلشەفییەکان سەبارەت بە یەکسانی و ئازادی گەلان و مافی چارەی خۆنوسینیان، بێگومان کوردیش یەکێک بوو لەو گەلانە.

٣ـ بۆ ڕاکێشانی کوردی پارچەکانی دیکەی کوردستان بەتایبەتی باشووری کوردستان، کە ئەو کات لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیادا بوو.

٤ـ ئازەریی و ئەرمەنییەکان کێشەیەکی زۆریان لەسەر ناوچەی ناگورناقەرەباغ هەبوو،

بە دروستکردنی ئەو کۆمارە کوردییە لە نێوان ئەو دوو وڵاتەدا تاڕادەیەک چارەسەر ئەو کێشەیە کرا لەو ماوەیەدا.

٥ـ داواکاری خەڵکی ناوچەکە بۆ دروستکردنی کۆمارێکی کوردی وەک تەواوی گەلانی تری سۆڤیەت.

٦ـ ئەو بەڵێنانەی کە ڕووسەکان هەر لە سەرەتای سەدەی نۆزدەوە بە سەرۆک هۆز و کەسایەتییە دیارەکانی ناوچەکەیان دەدا کە ئەگەر ناوچەکەیان ببێتە بەشێک لە ڕووسیا ئەوا ئەوان جیاواز لە ئێران و عوسمانییەکان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن و دەسەڵاتی زیاتریان پێ دەدەن(٣٠).

دواتر لە ساڵی ١٩٢٥ لیژنەیەکی تایبەت پێکهات بۆ تاوتوێکردنی بارودۆخی قەزای کوردستان، ئەو ڕاسپاردانەی کە ئەم لیژنەیە پێشنیازی کرد و جێبەجێ کرا ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە گەشەکردنی ئابووریی و ڕۆشنبیری قەزاکە. لە گرنگترین ئەو کارانەی کە ئەنجامدرا، بریتی بوون لە:

١ـ دەرکردنی ڕۆژنامەی(کورستانی سۆڤیەتی).

٢ـ کردنەوەی پەیمانگایەکی پەروەردەیی هونەری لە شاری شوش.

٣ـ کردنەوەی پەخشی کەناڵێکی ڕادیۆ بە زمانی کوردی.

٤ـ بڕیاردرا کە منداڵان بە زمانی دایک بخوێنن.

٥ـ جگەلە کتێبی قوتابخانەکان، چەندین کتێبی کوردی ئەدەبی و سیاسی چاپکران.

٦ـ دەستبەکاربوونی هەموو دامودەزگا کارگێڕییەکانی قەزاکە(٣١).

باسی سییەم/ هەڵوێستی هەرێمی بەرامبەر دروستکردنی کوردستانی سنوور:

یەکەم/ ئەرمینیا:

ئەرمەنییەکان ئەمەیان بە هەوڵێکی ئازەرییەکان دەزانی بۆ بەکارهێنانی کورد لە دژی ئەرمەن و دابڕاندنی هەرێمی نەگۆڕنەقەرەباغ لە ئەرمەنستان. لەهەمانکاتدا هەوڵێکی مۆسکۆ بوو بۆ لەنێوبردنی دوا پێگەی سەربەخۆیی گەلی ئەرمەن لە ناوچە چیاییەکانی باشووری قەفقاز.

**دووەم/ یەکێتی سۆڤیەت:**

بۆ مۆسکۆ دەبوایە کوردستانی سوور ڕێگربێت لە بەریەککەوتنی ئازەریی و ئەرمەنەکان و دەروازەیەکیش بێت بۆ گەیاندنی پەیامەکانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر و پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بە کوردانی ڕۆژهەڵاتی نزیک.

سێیەم/ ئازربایجان:

ئازەرییەکان پێیانوابوو کوردستانی سوور ئامێرێکە بەدەست مۆسکۆوە بۆ فشارخستنە سەر ئازربایجان بۆئەوەی ناچارییان بکات گوێڕایەڵ و ملکەچی مۆسکۆ بن

له بوارەکانی نەوت و پەیوەندی لەگەڵ جیهانی تورکیدا. ترسێکی دیکەی ئازەرییەکان لەم هەرێمە لەو ڕاستییەوە سەرچاوەی گرتبوو ک لە ٨٥٪ی سەرچاوەکانی ئاوی ئازربایجان لەنێو خاکی کوردستانی سووردا بوو(٣٢). لەلایەکی ترەوە، بۆ ئازەرییەکان هەبوونی دەڤەرێک بەناوی کوردەوە مەترسییەکی هەرە گەورە بوو، چونکە ئەو ناوە ئاماژە بوو بۆ هەبوونی گرووپێکی ئیتنیکی جیاواز لە ئازەرییەکان، لەکاتێکدا هەموو یەکە کارگێڕییەکانی تری ئەو کۆمارە سۆڤێتییە ناوی ئیتنیکییان هەڵنەگرتبوو. ئەوان لەوە دەترسان ئەمە ببێتە بنکەیەک بۆ کوردەکانی قەفقاز  بۆئەوەی لە داهاتوودا لەسەر خاکی ئازربایجان قەوارەیەکی نەتەوەییان بۆ درستبکرێت(٣٣).

هەربۆیە ئازەرییەکان لە یەکەم ڕۆژی دامەزراندنی کوردستانی سوورەوە لە هەوڵی ئەوەدابوون لەنێوی ببەن، لەوپێناوەشدا کۆسپ و تەگەرەی زۆریان خستە بەردەم کامڵبوونی دامودەگاکانی ئەم هەرێمە کوردییە. واپێدەچێت لەکاتی خۆیدا دەسەڵاتی سۆڤیەت لە مۆسکۆ ئازەرییەکانی ناچار کردبێت هەرێمی کوردستانی سوور دابمەزرێنن، بۆیە هەرگیز لە دڵەوە کاریان بۆ گەشەکردنی نەدەکرد. سیاسەتەکانی کاربەدەستانی کۆماری ئازربایجان بەرامبەر بەو هەرێمە بەتەواوی ئەو بۆچوونە پشتڕاست دەکاتەوە کە ئەوان لە یەکەمین ڕۆژەوە لە هەوڵی سڕینەوەیدابوون(٣٤).

بەنمونە ئەوەی زۆر سەیر بوو سەرۆکی هەرێمە کوردییەکە کەسێکی ئازەری بوو بەناوی حسێن گاجییڤ! دامودەزگاکانی هەرێمەکە لە شاری شوشێ بوو کە دەکەوتە دەرەوەی سنوورەکانی کوردستانی سوور. بیانووشیان ئەوە بوو کە لە هەموو هەرێمەکەدا باڵەخانەیەکی وەها نییە بۆ ڕاییکردنی کاروبارەکانی دەوڵەتی دەستبدات. واتە هیچ دامودەزگایەکی دەوڵەتی لەم هەرێمەدا نەبووە. هەروەک هیچ هەوڵێکی جددی نەدرا بۆ ئامادەکردنی کادیری پێویست لە ماوەی ئەو شەش ساڵەدا کە کوردستانی سوور لە ژیاندا بوو. بۆ مەبەستێکی نادروست بەکاردەهێنرا، چونکە زۆر گەلی تری ناو یەکێتی سۆڤیەت، بەتایبەتی لە ئاسیای ناوەڕاست لە ئاستی کۆمەلایەتی کورددا بوون، سەرباری ئەوەش لە ماوەیەکی کورتدا کادری پێویستیان بۆ ئامادەکرا و دامودەزگای دەوڵەتییان بۆ دامەزرێنرا(٣٥). هەر لەو چوارچێوەیەدا کەمکردنەوەی ڕێژەی کوردی هەرێمەکە لە ١٠٠٪ بۆ ٧٣٪ دانیشوان یەکێکی دیکە بوو لە هەنگاوەکانی ئازەرییەکان لە دژی کۆمارەکە، هەر بۆ ئەو مەبەستەش بەپێی هەندێک لە سەرچاوەکان ڕێگەیان نەدا بەو دوو هەزار کوردەی لە دوای سەرکوتکردنی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیرانەوە(١٩٢٥) هەڵهاتبوون و پەنایان بردبووە بەر ئازربایجان لە کوردستانی سوور جێگیر ببن، بەڵکو ناچارکران لە گوندێکی نوێ بەناوی نەریمان ئاباد نیشتەجێ ببن. لە بەرامبەردا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژمارەی ئازەرییەکان لە هەرێمەکە زیادی دەکرد، لە ماوەی یەک ساڵدا(١٩٢٥-١٩٢٦) ڕێژەی

کوردیان لە ٨٠٪ وە هێنایە خوارەوە بۆ ٧٣٪، واتە بەڕێژەی لە ٧٪ ڕێژەی کورد لەو هەرێمە کەمی کرد. جیالەوانەش ئازەرییەکان بەمەبەستەوە ناوچەی قوبادلی کە ٩٨٪ی ئازەری بوون و ئەوانی دیکەش ئەرمەن، بۆ ئەوە خستیانە سەر کۆماری کوردستانی سوور هەتا ڕێژەی دانیشتوانی کورد لەناو کۆمارەکەدا بهێننە خوارەوە(٣٦).

هەوڵی تواندنەوەی کورد و بەتورک کردنیان پرۆسەیەکی بەردەوامی ئازەرییەکان بوو. بۆ گەیشتن بەو ئامانجە ڕێگە نەما نەیگرنەبەر. بەر لە هەموو شتێک شکاندنی کەسێتی کورد و تەماشاکردنیان بەچاوێکی نزم و پێناسەکردنیان بە کۆچەر، نەخوێندەوار و دواکەوتوو وایان لە بەشێکی زۆری کوردانی ئەو وڵاتە کردبوو شەرم لە کوردبوونی خۆیان بکەن. پێدەچێت ئەمە خەسڵەتێکی گشتی تورک زمانەکان بێت لە هەر شوێنێک بن، تورکی تورکیا لەم بوارەدا پێشەنگ و ڕێنیشاندەرە بۆ هەموو ئەوانی دیکە، ئازەریش چ ئەوانەی قەوقاز و چ ئەوانەی ئێران بە هەمان شێوە لە کورد دەڕوانن و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکەن، تەنانەت کەمینەیەکی لاوازی وەک تورکمانەکانی عێراق بەهەمان چاو سەیری کورد دەکەن(٣٧).

### بەشی دووەم/ هەڵوەشانەی کوردستانی سوور و چارەنووسی کوردانی سۆڤیەت

### باسی یەکەم/ هەڵوەشاندنەوەی کۆمار:

دوای مردنی لینین و گەیشتنی ستالین بەدەسەڵات ، ڕەوشی گەلانی سۆڤیەت بەتەواوی بەرەو خراپی گۆڕا، یەکێک لەو نەتەوانە کورد بوو(٣٨) ، بەتایبەت لە کۆتایی بیستەکانی سەدەی ڕابردوودا ڕەوتی مامەڵەکان لەگەڵ کورددا ڕووی لە خراپبوون و تێکچوون کرد(٣٩) ، ڕەگەزپەرستانی تورک بە پلەی یەکەم و دوای ئەوانیش ئازەریی و ئەرمەنییەکان ڕۆڵی بەرچاویان گێڕا لە فشار خستنە سەر سۆڤیەتییەکان بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆماری کوردستانی سوور(٤٠) ، ئەو ڕەوشەش دەرەنجامی گەشەکردنی خواستی نەتەوەخوازی بوو لەناو سەرکردەکانی ئازربایجان و ئەو بارودۆخەی کە هاتبوویە پێشەوە لە سیاسەتی دەرەوەدا، کە پەیوەست بوو بە پەیوەندییە دۆستانەکانی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و تورکیاوە(٤١). بۆ تورکەکان وڵاتێکی وەها دەستی نەدەدا، سۆڤیەتیش نەیدەویست پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیا تێکبدات(٤٢).

جەعفەر باقرۆڤ بە سیاسەتێکی میکیاڤیلییانە کوردانی ناو سنووری ئازربایجانی بەرەو توانەوە پەلکێش کرد، بەوکارەشی خزمەتێکی گەورەی بە کەمالیستەکان لە تورکیا کرد(٤٣) ، لەوچوارچێوەیەدا دەسەڵاتدارانی ئازربایجان هەوڵەکانیان خستەگەڕ بۆ لەناوبردنی ئەم ناوچە ئۆتۆنۆمییەی کوردان لە کۆمارەکەیاندا(٤٤) ، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە کیرەف بوو بە بەرپرسیاری پارتی کۆمۆنیست لە لینینگراد، ڕاستەوخۆ هەوڵی ئازەرییەکان بۆ لەناوبردنی کوردستانی سوور دەستیپێکرد(٤٥). سەرەنجام قەزای کوردستان بە بڕیاری

کۆنگرەی سەرانسەری سۆڤێتییەکانی ئازربایجان لە ٨ی نیسانی ١٩٢٩ هەڵوەشێنرایەوە، ئەویش دوای ئەوەی دەسەڵاتدارانی یەکێتی سۆڤییەت بڕیاری دروستکردنی هەرێم یان ناوچە(ئۆکروگ)یان لە جێگەی مەڵبەند یان قەزا(ئویەزد)دا. بەڵام جێبەجێکردنی بڕیارەکەیان بۆ دەسەڵاتدارانی ناوچەیی بەجێهێشتبوو. دەسەڵاتدارانی ئازربایجان ئەم هەلەیان قۆستەوە و کوردستانی سووریان هەڵوەشاندەوە و دایرەکانیان بەسەر هەرێمی قەرەباغدا دابەشکرد، کە یەکێک بوو لەو هەشت ناوچەیەی تر. بەوشێوەیە دەسەڵاتدارانی ئازربایجان دوای ئەوەی چەند ناوچەیەکی ئازربایجانشینیان خستە سەر قەرەباغ، توانیان هەرێمی ئۆتۆنۆمی ناگۆرنە قەرەباغ دروستبکەن، کە بەشێکی بەرچاوی ئازەری بێت.

هەرچەندە لەگەڵ ئەو نیازە شاراوەی ئازەرییەکان بەرامبەر بە کوردستانی سوور، لە١٩٣٠/٥/٢٥ کۆمیتەی جێبەجێکردنی ناوەندی ئازربایجانی سۆڤیەتی بڕیاری دروستکردنەوەی هەرێمی کوردستانیدا. ئەم هەرێمە جگە لە ناوچەکانی مەڵبەندی کوردستان، ناوچەی زەنگیلان و جوبرایلیشی لەسەر بوو، بەم پێیە لە باشوورەوە سنووری بەتەواوی بە سنووری ئێرانەوە دەبوو. ئەمجارەیان شارۆچکەی لاچین بوو بە ناوەندی مەڵبەندەکە. لەڕاستیدا لاچین هەر ئەبداڵیار بوو، کە ساڵی ١٩٢٦ دوای ئەوەی فراوانتر کرا، ناوەکەی بۆ لاچین گۆڕا. بەڵام ئەم هەرێمەش هەتا ٨ی ئابی ١٩٣٠ مایەوە و دواتر بەیەکجاری هەڵوەشێنرایەوە(٤٦). بەوشێوەیە کوردستانی سوور کە وەک خەڵاتی لینین بۆ کورد تەماشا ئەکرا، لەلایەن ستالینەوە لێیان وەرگیرایەوە(٤٧).

بەبڕوای د.جەبار قادر، هۆکارێکی تری لەناوبردنی کوردستانی سوور پەیوەندی هەبووە بە سەرکوتکردنی جوڵانەوەکانی کوردییەکان لە هەموو پارچەکانی کوردستان لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوو، بەو واتایەی یەکێتی سۆڤیەت دەستی لەوە شوشت کورد وەک هێزێکی شۆڕشگێڕ لە ڕۆژهەڵاتی نزیک ببنە پێگە بۆ یەکێتی سۆڤیەت و بڵاوکردنەوەی بیر و پەیامی بەلشەفی.

لەکۆتاییدا ئازەرییەکان لەژێر پەردەی گۆڕانکاری کە هەموو یەکێتی سۆڤیەتی گرتبوویەوە، قەزای کوردستانیان لەنێوبرد. ئەگەرچی پەیمانی ئەوەیان دابوو کە جارێکی تر دروستی بکەنەوە، بەڵام دواتر لە سەردەمی ستەم و دیکتاتۆری ڕەشی ستالیندا بەیەکجاری لەبیرکرا(٤٨).

**باسی دووەم/ ڕێ و شوێنەکان لە دژی کوردانی سۆڤیەت دوای ڕووخانی کۆمار:**

هەر دوابەدوای لەناوبردنی کوردستانی سوور، بەکارهێنانی وشەی کوردی قەدەغەکرا، لەگەڵیشیدا بەشێوەیەکی ڕەسمی دەستکرا بە کەمکردنەوە ژمارەی دانیشتوانی کورد، لەکاتێکدا لە ساڵەکانی بەڕێوەبردنی خۆجێیەتی کورد ژمارەی دانیشتوانی کورد نزیکەی

٤٨هەزار کەس بوون، بەڵام بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٧٩ تەنانەت یەک کوردیش لەو ناوچەیە نەمابوویەوە، ئەوە لەکاتێکدا ئەگەر زۆری منداڵبوون لە خێزانە کوردەکان و گەشەی سرووشتی لەیەکبدەینەوە، دەبوو هەتا کۆتایی شەڕی دووەمی جیهانی ژمارەی کوردانی ناوچەی کوردستانی سوور لە ١٠٠ هەزار کەس کەمتر نەبێت. سەرباری ئەوەش لەژێر فشاردا زۆربەی زۆری کوردانی ئازربایجان زمانی دایک و کلتوور و دابونەریتی خۆیان لەدەستدا. هەمان چارەنووس ڕووبەڕووی کوردانی نیشتەجێی تورکمانستانیش بوویەوە، بەپێی هەندێک لە خەمڵاندنەکان لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوودا نزیکەی ١٠٠ هەزار کورد لەو وڵاتە ژیاوە، بەڵام سەرژمێرییەکانی دواتر دەریخست ژمارەی کورد لەو وڵاتە زۆر کەمیکردووە لە هەموو ئەو ناوچانەی کە پێشتر تیایدا ژیاون(٤٩).

لەوەش زیاتر فشاری تورکەکان گەیشتە ئاستێک، سۆڤیەتییەکان لە ساڵی ١٩٣٥دا ڕێگرییان کرد لە بەستنی کۆنفرانسی کوردناسی لە باکۆ، دواتریش هەموو قوتابخانە و پەیمانگا و دامەزراوە کلتوورییەکان داخران. ئەو داخستنە بەشێوەیەک بوو تا ڕووخانی سۆڤیەت ڕێگە نەدرا کە ئەو جۆرە کۆنفرانسانە ببەسترێت. تەنانەت بەلشەفییەکان پێیانوابوو هەموو ئەو کۆنفرانسانەی کوردناسی کە لە دەرەوە بەستراون دەستی ئیمپریالیزمیان لە پشت بووە. بەوهۆیەشەوە ڕێگەشیان نەداوە بە هیچ یەکێک لە کاربەدەستانی باڵای وڵات کە بەشداری کۆڕ و کۆنفرانسە کوردییەکان بکەن.

سۆڤێتییەکان لە سەرەتادا ڕێگرییان دەکرد لە ئاڵوگۆڕی بڵاوکراوە کوردییەکان، دواتر هەستان بە داخستنی ڕۆژنامەی (ڕێیا تازە)و دوورخستنەوەی نوسەران و ڕۆشنبیرانی کورد بەبیانووی هەڵوێستی نیشتمانی و نەتەوایەتیان یاخود پەیوەندییان بە نوسەرانی کوردی دەرەوە، دواتر لەوە زیاتر پێیان لێناو بواریان نەدا بە هیچ یەکێک لە چاپکراوە سۆڤێتییەکان کە بابەت و وتار لەسەر کورد و ئەلفوبێی کوردی بڵاوبکەنەوە. هەر لەو ڕوانگەیەشەوە دەتوانین بڵێین بەرهەمی زۆربەی کوردناسەکانی سۆڤیەت بەرلەوەی زانستییانە و مێژوویی و بابەتیانە بن ئایدۆلۆژیانە و بەمەبەست بووە، بەگشتی سۆڤیەت توانی بزووتنەوەی کورد لە پەیوەندی گرتنی بە ڕۆژئاواوە دابڕێ و دووری بخاتەوە(٥٠).

**باسی سێیەم/ چارەنووسی کوردانی سۆڤیەت دوای هەڵوەشانەوەی کۆماری کوردستانی سوور:**

لە ڕووی کارگێڕییەوە، پاش هەڵوەشاندنەوەی کوردستانی سوور، هەر ناوچە و شارێکی کوردستانیان بەناوی»دابەشکردنی سستەمێکی بەڕێوەبەرایەتی نوێی ئازربایجان»ەوە، خستە سەر ناوچە یان هەرێم و شارەکانی تری ئازربایجان. بەم چەشنە ناوی کورد و کوردستان، یا بەواتایەکی تر قەوارەکەیان لە فەرهەنگی سۆڤیەتی و ئازربایجانی سۆڤیەتیدا

سڕییەوە(٥١). لەلایەکی تریشەوە لە ناوەڕاستی سییەکانەوە ئیدی کۆتایی بە پیادەکردنی سیاسەتی کلتووره هەمەجۆرەکان هات و لەوکاتەوە سیاسەتی مەرکەزییەت پیادەکراوە، بەشێوەیەک هەموو بڕیارەکان لە سەرەوە دادەبەزینە خوارەوە، بەوەش دوبارە کیشەی نێوان ڕووسەکان و کەمینە نەتەوایەتییەکان سەریهەڵدایەوە کە یەک لەوانە کورد بوو(٥٢). دانیشتوانی کوردی ئەو وڵاتە کەوتنە بەر شاڵاوی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی جیاوازی ڕەگەزیی و تواندنەوەوە، بەوهۆیەشەوە ژمارەیەکی زۆریان لە ترساندا ناو و ناسنامە و نەتەوەی خۆیان گۆڕی، بۆئەوەی دەرنەکرێن، یان لەناو نەچن یان ئیشوکاری خۆیان لەدەست نەدەن یان بتوانن بخوێنن و کاربکەن و لە نیشتمانەکەی خۆیاندا بمێننەوە. ژمارەیەکی ئێجگار زۆر کورد بەم چەشنە هەتا ئەمڕۆش لەبەر نەبوونی قەوارە و بواری خوێندن توێندراونەتەوە، بەڵام ئەمەش واتە بێ دەنگبوون و تواندنەوەیان. شانبەشانی ئەم هەنگاوانە قوتابخانە و ڕۆژنامە و بەڕێوەبەرایەتی و، بەگشتی دەستکەوتەکانی گەلی کوردیان نەهێشت.

کوردەکانی سۆڤیەت لە کارەساتی تریش نەپارێزراون(٥٣)، ڕاگواستنی کوردەکان لەودیوی قەوقازەوە بۆ ناوچەکانی تری یەکێتی سۆڤیەت ڕۆڵی هەبوو لە تواندنەوەیان. بەنمونە لە ساڵی ١٩٣٧ دەستکرا بە ڕاگواستنی بەشێک لە کوردانی ئەودیو قەوقاز(وەک ڕەگەزێکی نەخوازراو) بۆ کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست و کازاغستان. دواتر لە ساڵی ١٩٤٤ کورد و تورک و هەمەشییەکان لە خاکی جۆرجیاوە ڕاگوێزران بەرەو هەمان ناوچە(٥٤). بیانووشیان بۆ ئەم تاوانە گەورەیە ئەوەبوو» گوایە بەرەی قەفقاز، لەبەر «کۆمەڵانی گومانلێکراو»یان»بڕوا پێ نەکراو»، کە کوردیش خرابووە ئەو خانەیەوە(بە بەهانەی ئاری بوون و هاوهەستییان لەگەڵ ئەڵمانەکاندا یان هاوئاینییان لەگەڵ تورکیادا)و، لەبەر نزیکبوونەوەی هێزەکانی تورکیا و ئەڵمانیا، دەبوو پاکبکرێنەوە و دووربخرێنەوە، نەوەک بە دەستپێکردنی شەڕ یارمەتی ئەڵمانەکان و تورکەکان بدەن.

بەوهۆیەشەوە کوردەکانیان لە ئازربایجان و ئەرمینیاوە گواستەوە، زۆربەیان بۆ ئاسیای ناوەڕاست و کازاغستان و ئۆزبەکستان و سیبیریا. گواستنەوەکەشیان بەشێوەیەکی نامرۆڤانە و بێ ئاگاداری پێشوەخت  و بەشەو بوو، بە گەمارۆدانی گوند و شارەکوردنشینەکان و بردنیان بە ئۆتۆمبیلی سەربازی بۆ ئێستگەکانی شەمەندەفەر و گواستنەوەیان بە شەمەندەفەری تایبەت بە ئاژەڵ و بارهەڵگر، بەبێ ئەوەی بهێڵن شتومەک و پێویستی ناوماڵ و سامانیان لەگەڵ خۆیاندا ببەن. کاتی کۆکردنەوە و ناردن و لە ڕێگا، ژمارەیەکی زۆریان لەبەر ڕەخنە و ناڕەزایی دەربڕین لەلایەن سەربازەکانی سوپای سوورەوە گوللەباران کران، یان خۆیان لە شەمەندەفەرەکان فڕێداوەتە خوارەوە، ژمارەیەکی زۆریشیان لە ڕێگادا بەهۆی سەرما و برسێتی و نەبوونی خواردن و... گیانیان لەدەستداوە، بەتایبەت بەساڵاچووان و منداڵان.



**کوردانی سۆڤیەت لەکاتی ڕاگواستنیان**

کارەساتی ژیانی ئەو کوردە ڕاگوێزراوانە لە شوێنی نوێی نیشتەجێبوونیان، بەهۆی بارودۆخی نامرۆڤانە و ڕانەهاتنەوە لەگەڵ کەشوهەوای بەتایبەتی سیبیریادا، ئەوانی ڕووبەڕووی کارەساتێکی گەورە کردەوە، لە تاراوگە و ئۆردوگا زۆرەملێکاندا، دەستبەسەر و لەژێر کۆنترۆڵ دەزگاکانی پاراستنی سۆڤیەتدا بوون، گەشتکردنیان لێ قەدەغەکرابوو، هەروەک پاسپۆرت و ناسنامەشیان لێوەرگیرابوویەوە(٥٥). لەمبارەیەوە لازاریف دەڵێت:" کوردە ڕاگوێزراوەکان لەژێر چاودێرییەکی توندا بوون، مافی سەردان و دەرچوونیان نەبوو، لە بازنەی ئەو ناوچانەی کە تیایدا نیشتەجێ کرابوون، هەروەها بێ بەشکرابوون لە مافە دەستوورییەکان. تەنانەت زۆرێکیان ناچار دەبوون دەستەبەرداری ڕەگەزی و نەتەوەیی خۆیان ببن و بچنە سەر ڕەگەزی ئازەری یاخود کازاغی یان هەر ڕەگەزێکی تری ناوچەکە، ئەوەش بۆ خۆدوورخستنەوە لە چەوساندنەوە یاخود بۆئەوەی مافی چوونە دەرەوەیان هەبێت بۆ خوێندن(٥٦)".

ستالین ڕاستەوخۆ بڕیاری گوللەبارانکردنی دەستگیراوانی نەدەدا، پێویستی بە هێزی کرێکار بوو، پێش مردنیان دەبوو کار بۆ کۆمەڵگەی سۆسیالیزم بکەن، کوشتنی یەکجارەکییان کەڵکێکی ئەوتۆی نەبوو، دەبوو کێڵگە بکێڵن، ئاژەڵ بەخێو بکەن، ڕێگە ڕابکێشن، بیابانە چۆڵەکان ئاوەدان بکەنەوە دواتر بمرن. بۆیە دەتوانین بڵێین میتۆدەکانی ستالین لە هیتلەر و سەدام و ئەتاتورک ژیرانەتر بوون.

بەکورتی، گوللەباران کردن و برسیکردن و نەخۆشخستن و بێکار کردن و لە

سەرمادا ڕەقبوونەوە و خۆکوژیی و لە خەم و ئازاردا مردن و سوکایەتیکردن بە هەموو شێوەکانییەوە، وەک ناچارکردن بە ڕەفتارکردن وەک ئاژەڵ، بگرە تا دەستدرێژیکردنە سەر شەرەف و نامووس، ناو و نەتەوە و دابونەریت گۆڕین و دەرکردن و داگیرکردنی نیشتمان و گۆڕینی ناوی گوند و کانی و شاخ و هەرد و ڕووباری وڵات، گۆڕستانی مردووەکان خاپوور بکەن، سەردانی کەسوکار و ناشتنی تەرمی مردووەکان، هەمووی مۆڵەتی ڕەسمی بێ و نێرینەکان بدزن و بێ سەروشوێنیان بکەن(٥٧).

بێ دەوڵەتی کورد وای لە ستالین کرد نەک هەر کوردستانی سوور هەڵوەشێنێتەوە، بەڵکو ئەو هەموو کارەسات و تراژیدیایانە بەسەر گەلی کورددا بهێنێت بەتایبەتی ڕاگواستنی کوردانی ئەو وڵاتە بۆ کۆمارەکانی دیکەی سۆڤیەت(٥٨). لە ناوخۆدا گوێ بە سکاڵاکانی کوردانی ئەو وڵاتە لەسەر خراپی ڕەوشی ژیانیان نەدەدرا(٥٩) و، بەهۆی نەبوونی دەوڵەتیشەوە نوێنەری نەبوو لە نەتەوەیەکگرتووەکان ئەوەش وایکردبوو نەتوانێت نارەزایی دژی سیاسەتەکانی سۆڤیەت دژی کوردانی ئەو وڵاتە دەرببڕێ(٦٠).

بەکورتی، ئەو سیاسەتەی کە سەرانی سۆڤێت بەرامبەر بە هاوڵاتیانی کوردی ئەو وڵاتە هەر لە سەرەتاوە گرتیانەبەر، بەرامبەر بە هیچ گەلێکی دیکە بەو چەشنە نامرۆڤانە و گڵاونەبووە(٦١). سەرانی یەکێتی سۆڤیەت و دواتریش ڕووسیا هەرگیز بواریان نەداوە بە کورد دەستی بە هیچ پۆستێکی گەورە و بچووکی وڵات بگات، ئەم حاڵەتە لە کۆمارەکانی جۆرجیا و ئەرمینیا و ئازربایجانیش هەر بەوشێوەیە بوو(٦٢).

ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت گۆڕانکاری گەورەی بەسەر بارودۆخی کوردانی ئەو وڵاتەدا هێنا، کە بوو بەمایەی تێکچوونی پەیوەندییە نەتەوایەتییەکان لە ناوخۆی وڵاتدا بەتایبەتیش کە کاتێک یەک نەتەوە پێگەی یەکەمی بۆ خۆی قۆرخکرد لەناو کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران، ئەمانە بوون بەهۆی تێکچوونی بارودۆخی کەمەنەتەوایەتییەکان بە کوردیشەوە(٦٣)، سەرباری ئەوەش زۆربەی کەمەنەتەوەکانی ئەو وڵاتە مافەکانیان بۆ گەڕێنرایەوە لەکاتێکدا زۆرێک لەو نەتەوانە خاوەنی خاک و نەتەوە نەبوون، تەنها کورد نەبێ کە ئەو مافەی پێ ڕەوانەبینرا، ئەوە لەکاتێکدا دەسەڵاتدارانی ڕووسیا زۆرباش ئاگاداری کێشەی کورد بوون لەو وڵاتەدا. لەوەش زیاتر، لەبەرئەوەی کوردستانی سوور دەکەوێتە چوارچێوەی ئەو ناوچەیەی کە ئەرمینیا و ئازربایجان شەڕی لەسەر دەکەن. کوردانی ئەو ناوچەیە قوربانی یەکەمی ململانێکانی نێوان ئەرمینیا و ئازربایجان، ژمارەیەکی زۆریان ئاوارەی ڕووسیا بوون، بەشێوەیەک لەو یەک ملیۆن و دووسەد هەزار ئاوارەی ناوچەی ناگورنەقەرەباغ، نزیکەی (١٨٠-٢٠٠) هەزاریان کورد بوون(٦٤) ، کە ئەمرۆ بەشێکی زۆریان لە ناوچەکانی: کرانسدار و ستارفروید و هەرێمەکانی یارسلاف و تامبوف و شاری مۆسکۆی پایتەخت دەژین(٦٥).

## دەرئەنجام

دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر کۆمەڵێک گۆڕانکاری گرنگ لە هەلومەرجی ناوخۆیی و دەرەکی سیاسەتی سۆڤیەتی تازە لەدایکبوودا هاتە ئاراوە، یەکێک لەو ڕووداوە گرنگانە بریتی بوو لە دروستکردنی قەوارەیەک بەناوی کوردستانی سوور، قەوارەکە ئەگەرچی تەمەنی کورت بوو(١٩٢٣-١٩٢٩)، بەڵام کۆمەڵێک کاری گرنگی لەسەر ئاستە جیاوازەکان ئەنجامدا، سەرباری ئەوەش دروستکردنی قەوارەیەک بەناوی کوردستانەوە بۆخۆی بابەتێکی گرنگ بوو. بەداخەوە هەلومەرجە ناوخۆیی و هەرێمی و نێودەوڵەتییەکە وەک هەموو جارەکانی دیکە لە بەرژەوەندی کورد نەبوو، هەرئەوەش وایکرد کۆمارە ساواکە بەرگەی ئەو هەموو تەنگ و چەڵەمە و فشارە ناوخۆیی و هەرێمیانە نەگرێت و سەرئەنجام دوای شەش ساڵ لە مانەوەی ڕووبەڕووی هەڵوەشانەوە ببێتەوە. لەوەش زیاتر دوای ڕووخانی کۆمار کوردانی ئەو بەشەی خاکی کوردستان ڕووبەڕووی کۆمەڵێک سزای توند کرانەوە کە دواجار بە کارەسات بۆ خەڵکانی دانیشتووی کۆمارەکە شکایەوە، کارەساتێک کە هەموو شێوە و سنوورەکانی جینۆسایدی تێپەڕاند، بەشێوەیەک خاکەکەیان کرایە سوتماک و خەڵکەکەی کرایە ئاردی ناو دڕک و وەک گۆشتی قوربانی بەسەر ناوچەکانی ئاسیای ناوەند و تەنانەت سیبریا پەرت و دابەشکران. هەرئەوەش نا کۆمەڵێک ڕێ و شوێنی توندیان وەک سزا لە شوێن و جێگا نوێکانیان بەسەردا سەپاندن کە هەر جۆرە لادانێک لێیان یەکسان بوو بە مەرگ، بەوهۆیەشەوە دەیان هەزار مرۆڤی کورد بوونە قوربانی سیاسەتەکانی ستالین و تەنانەت بەشێک لە ئازار و مەینەتییەکانی کوردانی ئەو وڵاتە هەتا ئەمڕۆش بەردەوامە. بەوشێوەیە کوردانی ئەو وڵاتە نەک هەر خاکەکەیان، بەڵکو خودی خۆشیان بوونە قوربانی سیاسەتە چەوت و دیکتاتۆرییەکانی ستالین و دامودەزگاکانی سۆڤیەت.




**کوردستانی سوور**
**(کوردستانی سۆر) ئەنفالێکی بزر و لەبیرکراوی کورد**

## سەرچاوە و پەراوێزەکان:


١. د.ئەفراسیاو هەورامی: کوردستانی پشت قەفقاس(دۆسیەی تاوانەکانی ڕژێمی سۆڤیەت بەرامبەر بە کوردەکانی ئەو وڵاتە)، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٤٢٢.
٢ نەوشیروان مستەفا ئەمین: کورد و عەجەم، چ٢، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٢١٨.
٣ د.ئەفراسیاو هەورامی: س.پ، ل٤٢٢ ؛ نەوشیروان مستەفا ئەمین: س.پ، ل٢١٨-٢١٩ ؛ م.أ. هسرتیان: کورد الاتحاد السوڤیتي، ت. د.جبار قادر، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژمارە(٢٤)، ٢٠١٣، ص٣٤١ ؛ مجموعة من المشتشریقین السوفیت: موضوعات من الکردولوجیا السوفیتیة، ت.د.اسماعیل حصاف، ط١، مطبعة خانی(دهۆک)، هولیر، ٢٠٠٨، ل١٠-٣٨ ؛ د.عەبدوڵلا عەلیاوەیی: کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆدەهەمەوە هەتا جەنگی یەکەمی جیهان، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٦٣.
٤ ئەفراسیاو هەورامی: س.پ، ل٥٨.
٥ ئەفراسیاو هەورامی: س.پ، ل٤٤٢.
٦ د.عوسمان عەلی: چەند لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد، و.کامەران بابان زادە، ب١، چ١، چاپخانەی ڕێنوێ، ٢٠١٠، ل٣١٢.
٧ د.عوسمان عەلی: س.پ، ل٣١٤-٣١٥
٨ د.جەبار قادر: ئازەرییەکان لە یەکەم، ل٧٧ ؛ د.ڕەشاد میران: کورد لەمێژە لە ناوچەکانی قەفقاز نیشتەجێیە لە کتێبی(کوردستانێکی ونبوو)، چاپخانەی کارۆ، لە بڵاوکراوەکانی کوردستانی نوێ، ٢٠١٦، ل١٠٨-١٠٩.
٩ د.ڕەشاد میران: کورد لەمێژە، ل١٠٩.
١٠ م.س.لازاریف و ئەوانی تر: مێژووی کوردستان، و.هوشیار عەبدوڵلا سەنگاوی، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٤٠١.
١١ د.جەبار قادر: ئازەرییەکان لە یەکەم، ل٧٨.
١٢ د.ڕەشاد میران: کورد لەمێژە، ل١٠٨-١٠٩.
١٣ د.جەبار قادر: ئازەرییەکان لە یەکەم، ل٧٨.
١٤ د.جەبار قادر: ئازەرییەکان لە یەکەم، ل٧٧-٧٨.
١٥.شترۆهمایەر و ل.یاڵچین هێکمان: کورد لە سوریا و ئازربایجان و ئەرمەنستان، و.ڕێبوار تۆفیق بەنگینە، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای هۆشیاریی و پێگەیاندنی کادیران، سلێمانی، ٢٠١١، ل٣٢.
١٦ م.س.لازاریف و ئەوانی تر: س.پ، ل٤٠١.
١٧د.ئارام عەلی: دامەزراندنی کوردستانی سوور هیچ پەیوەندی بە خواست و نیازی دەسەڵاتدارانی ئازربایجانەوە نەبوو لە کتێبی(کوردستانێکی ونبوو)، چاپخانەی کارۆ، لە بڵاوکراوەکانی کوردستانی نوێ، ٢٠١٦، ل٩٦.
١٨ د.ئارام عەلی: س.پ، ل٩٦ ؛ مێ.پێچێلینا: گەشتێک بە کوردستانی سۆڤیەتدا، و.د.ڕشاد میران

لە کتێبی (چەند بابەتێکی ئیتنۆکۆمەڵایەتی)، ب١و٢، چ١، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٦، ل٢٨٢.
١٩ ئەفراسیاو هەورامی: س.پ، ل٧٧.
٢٠ ئارام عەلی: س.پ، ل٩٦ ؛ کلکشار نۆرەمار: ڕەوشی کوردی ئەرمەنستان لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، و.دلاوەر عوسمان، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە(٦٨٩٠)، هەینی و شەممە ٥و٢٠١٦/٢/٦، ل٧ ؛ عەلی ئەسغەر فەریدی: کوردستانی سوور لە کێشمەکیشی نێوان ئازربایجان و ئەرمەنستاندا، فۆکەس، ژمارە(١)، تەموزی ٢٠١٦، ل٧١.
٢١ مێ.پێچێلینا: س.پ، ل٢٨٢.
٢٢ م.س.لازاریف و ئەوانی تر: س.پ، ل٤٠١-٤٠٢.
٢٣ ئەفراسیاو هەورامی: س.پ، ل٧٢-٧٣.
٢٤ لاچین هەتا ئەو ساڵە بریتی بوو لە ئاواییەک بە ئەبداڵیار ئەناسرا. (د.جەبار قادر: ئازەرییەکان لە یەکەم ڕۆژی دامەزراندنی کوردست.انی سوورەوە لە هەوڵی ئەوەدابوون لەناوی ببەن لە کتێبی(کوردستانێکی ونبوو)، چاپخانەی کارۆ، لە بڵاوکراوەکانی کوردستانی نوێ، ٢٠١٦، ل٧٨)
٢٥ مێ.پێچێلینا: س.پ، ل٢٨٣-٢٨٤.
٢٦ ه.س، ل٢٨٢-٢٨٣ ؛ پ.ی.ئەڤیر یانۆڤ: کورد لە جەنگی ڕووسیا لەگەڵ ئێران و تورکیادا (بارودۆخی سیاسی کوردی تورکیا و ئێران و ڕووسیا)، و. د.ئەفراسیاو هەورامی، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیرو هۆشیاری، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٣٢١.
٢٧ د.ئارام عەلی: س.پ، ل٩٦ ؛ کلکشار نۆرەمار: س.پ، ل٧ ؛ عەلی ئەسغەر فەریدی: س.پ، ل٧٢.
٢٨ عەلی ئەسغەر فەریدی: س.پ، ل٧٢.
٢٠ مێ.پێچێلینا: س.پ، ل٢٨٣.
٣٠ د.ئەفراسیاو هەورامی: س.پ، ل١٠٦-١٠٧.
٣١ م.س.لازاریف و ئەوانی تر: س.پ، ل٤٠٢.
٣٢ د.جەبار قادر: ئازەرییەکان لە یەکەم، ل٧٩.
٣٣ ه.س، ل٨٢
٣٤ ه.س، ل٨٠.
٣٥ ه.س، ل٨٣.
٣٦ عەلی ئەسغەر فەریدی: س.پ، ل٧٢
٣٧ د. جەبار قادر: ئازەرییەکان لە یەکەم، ل٨٠-٨١.
٣٨ د.ڕەشاد میران: کورد لەمێژە، ل١٠٩.
٣٩ م.س.لازاریف و ئەوانی تر: س.پ، ل٤٠٢.
٤٠ د.ئەفراسیاو هەورامی: س.پ، ل١٠٨.
٤١ م.س.لازاریف و ئەوانی تر: س.پ، ل٤٠٢.
٤٢ کلکشار نۆرەمار: س.پ، ل٧.
٤٣ ه.س، ٧. عەلی ئەسغەر فەریدی: س.پ، ل٧٢.

٤٤ د.ڕەشاد میران: کورد لەمێژە، ل١٠٩.
٤٥ د.جەبار قادر: ئازەرییەکان لە یەکەم، ل٧٩.
٤٦ د.ئارام عەلی: س.پ، ل٩٦–٩٧. عەلی ئەسغەر فەریدی: س.پ، ل٧٢.
٤٧ عەلی ئەسغەر فەریدی: س.پ، ل٧٢.
٤٨ د.جەبار قادر: ئازەرییەکان لە یەکەم، ل٨٢.
٤٩ م.س.لازاریف و ئەوانی تر: س.پ، ل٤٠٢–٤٠٣.
٥٠ د.ئەفراسیاو هەورامی: س.پ، ل١٠٧–١١٣.
٥١ ه.س، ل٤٤٣.
٥٢ م.شترۆهمایەر و ل.یاڵچین هێکمان: س.پ، ل٣٣ ؛ د.ئارام عەلی: س.پ، ل٩٧–٩٨
٥٣ د.ئەفراسیاو هەورامی: س.پ، ل٤٤٣.
٥٤ م.س.لازاریف و ئەوانی تر: س.پ، ل٤٠٣ ؛ م.أ. هسرتیان: م.س، ص٣٤٥ ؛ م.شترۆهمایەر و ل.یاڵچین هێکمان: س.پ، ل٣٢.
٥٥ د.ئەفراسیاو هەورامی: س.پ، ل٤٤٤.
٥٦ م.س.لازاریف و ئەوانی تر: س.پ، ل٤٠٣.
٥٧ د.ئەفراسیاو هەورامی: س.پ، ل١٧٦.
٥٨ ه.س، ل٤٣٦.
٥٩ د.ئەفراسیاو هەورامی: س.پ، ل١٧٧.
٦٠ ه.س، ل٤٣٢.
٦١ ه.س، ل١١٣.
٦٢ ه.س، ل٢٢٨.
٦٣ م.س.لازاریف و ئەوانی تر: س.پ، ل٤١٠.
٦٤ د.ئەفراسیاو هەورامی: س.پ، ل٤٤١ ؛ د.جەبار قادر: ئازەرییەکان لە یەکەم، ل٨٤.
٦٥ م.س.لازاریف و ئەوانی تر: س.پ، ل٤١١.

# دیالێکتێن زمانێ کوردی و نڤسینا ب دیالێکتا زازاکی (کردی- دملی- کرمانجی)



ئامادەکردنی: سەعید ڤەڕۆژ
پیتگوێزی و ڕێکخستنی: د.هێمن عومەر

## ١. زمان و دیالێکت

بێگومان پرسا زمان و دیالێکتان، بابەتەکە گەلەک گرینگ و کەڤنارەیا خەباتا زمانزانستییە. گاڤا کو مژار زمان بە، ئاواییێن جودایێ زمان ژی کو وەک دیالێکت یان ژی لەهجە تێنە بناڤکرن و دەرتێ پێشیا مە. هەتا ئیرۆ ل سەر ڤێ بابەتێ گەلەک گەنگەشە چێبوونە، د دەرهەقێ ڤێ مژارێ دا پێناسەیێن جهێ جهێ هاتنە کرن، لێ بەلێ ڕوونکرن و پێناسەیەکە ماقول کو هەر کەس ل سەر هەمفکر بە چێنەبوویە.

پەیدابوونا جهێتی و گوهەرینا زمان، تایبەتییەکە دیرۆکی و ئەساسییێ زمانە. ژ رۆژا کو زمان پەیدا بوونە و هەتا ئیرۆ، هەر جورە تێکەلییا ناڤبەرا کۆمێن مرۆڤان، بوونە سەبەبێ گوهەرینا زمان. پەیدابوونا زار، کۆم و کۆمکێن کولتورییێن جیاواز. تێکەلییا کۆمەییێن مرۆڤان؛ تێکەلییا تاریخی، ئابووری، پێکهاتنا بوویەرێن خوەزایی و کۆمەلی، بوونە سەبەبێ دانوستاندن و گوهەرینا زمان و کولتورێن جییاواز ژی. ژ بەر کو زمان د ناڤ دەمێ دا دگوهەرە. وەکی کو زمانزانێ ناڤدار (فەردیناند دیسۆسێر) ژی دبێژە: "د ناڤا دەمێ دا گوهەرینا زمان، بوویە سەبەبێ پەیدابوونا دیالێکتێن جهێ"(١) ل گۆری ئاستا تێکلییا کۆم و کۆمکێن مرۆڤان؛ وەکی تێکلییا وانا ب هەڤرا ژینێ، دینی، تجاری، سییاسی و کولتوری، دانوستاندنێن وانێن زمانی ژی چێبوونە. د داوییا ڤان تێکلییان دا زمانەک، هەم ل گۆر جی-هەرێمان و هەم ژی ل گۆر رەوشا وەلاتێن جودا د ناڤا خوەدا دگوهەرە؛ بەرییا هەر تشتی ژی بلێڤکرنا هن پەیڤ و شێوەیێن وان دگوهەرە. جارنا ئەڤ گوهەرین ئەوقاس زێدە دبە، کو ئاخافتڤانێن عەینی زمانی پر ب زەحمەتی هەڤدو تێدگیژن یان ژی تێناگیژن. ل گۆر جی و وارێن جودا، ب ڤێ ئاوایی گوهەرینا زمانەکی، ب پەیڤا دیالێکت (لەهجە، زاراڤا) تێتە بناڤکرن. لێ بەلێ تاریفەکە ستانداردێ دیالێکتێ نینە.

زمانزانێ ئالمانی لودویگ پاول(٢) ژی دبێژە، "د ناڤبەرا 'زمان و "دیالێکت" دا هیچ سنۆرەکە قەتعی و 'خوەزایی نینە. ئەم دکارن دو شێوەیێن جودایێن زمانەکی، ژ ئالییێ کولتوری ڤە وەک دیالێکتەک و ژ ئالییێن دن ڤە ژی وەک دوو زمانێن جودا تارف بکن. بۆ نموونە "زمان و دیالێکت"، ل گۆر ناساندن و خوسووسیەتێن وان، مومکینە کو هەتانی رادەیەک کەیفی بە ژی."(٣) جۆن لوینس(٤) ژی دبێژە: "د ناڤبەرا دیالێکتێن زمانەکی دا یان ژی د ناڤبەرا دیالێکتێن زمانێن جیران دا دیارکرنا سینۆرەکە موتلەق مومکین نینە."(٥) هن زمانزان ژی دیالێکت، وەک "شێوەیەکە ئاخافتنا" زمان تەعریف دکن. ب کورتایی ئەم دکارن ببێژن کو ل سەر پێناسە و چارچۆڤەیا "دیالێکت"ێ، فکرەک سابیت و سنۆرەکە موتلەق نینە.

## ٢. د دەرهەڤێ زمان و دیالێکتێن کوردی دا، چ هاتنە گۆتن؟

چاوا کو ل ژۆرێ ژی هاتە گۆتن، وەکی هەموو زمان و دیالێکتان، بێگومان ل سەر زمان و دیالێکتێن کوردی ژی فکرێن جودا هەنە. ئەم دخوازم ل ڤێ دەرێ هنەک بەحسا تەسنیفکرنا دیالێکتێن کوردی بکن و د دەربارێ ڤێ یەکێ دا چ هاتییە گۆتن، بینن بیرا وە. ژ بۆ ڤێ یەکێ، ب گرانی ئەمێ ژ نڤیساندنا شەرەفنامەیێ ڤر دا، بەحسا نێرینا هن نڤیسکار و کوردۆلۆگێن کو ل سەر زمان و دیالێکتێن کوردی خەبتینە بکن. هەتا ئیرۆ ل سەر هەموو دیالێکت و شێوەیێن کوردی خەباتەکا ب سەروبەر و تێرهاتی بدەست مە نەکەتییە یان ژی خەباتێن وسا زاف کێم چێبوونە. بەلکی خەباتێن ئەکادەمیک ئێن کو ژ ئیرۆ شووندا بێنە کرن، ببن سەبەبێ نیشاندان و ڤەکرنا رێچەکە نوو. لێ بەلێ گەرەک ئەم ڤێ ژی دیار بکن، کو خەباتا مەیا ئیرۆیین ژ تونەبوونێ دەست پێ نەکرییە. هەتا ئیرۆ ل سەر زمان و دیالێکتێن کوردی گەلەک تشت هاتنە گۆتن و نڤیساندن. ئەز دخوازم ب کورتایی هنەک بەحسا وان گۆتنان، چاڤکانی و خەباتان بکم.

ئەگەر ئەم ب ئاوایەکی کرۆنۆلۆژیک بەحسا ڤان بەرهەم و گۆتنان بکن، ل پێشییا هەموویان شەرەفنامە تێ. د شەرەفنامەیا شەرەفخان بەگی دا، چار دیالێکتێن زمانێ کوردی هاتنە ژمارتن: ١-کورمانچ، ٢- لۆر، ٣- کەلهور، ٤- گۆران(٦).

ل پەی شەرەفنامەیێ، سیاحەتنامەیا ئەولیا چەلەبی تێت. دەما ئەم ل سیاحەتنامەیا ئەولیا چەلەبی دنێرن، ئەم دکارن بێژن کو د دەربارێ کوردۆلۆژییێ دا ئاگادارییێن گرینگ تێدا هەنە، لێ بەلێ ل ڤێ دەرێ ب پرانی ئەمێ ژ ئالییێ زمان ڤە لێ بنێرن. "د سالا ١٦٥٥ان دا سەییاح ئەولیا چەلەبی و مەلەک ئەحمەد پاشا، ب موناسەبەتا سەفەرەک بەر ب (وان) ێ ڤە، رێ دکەڤن و گەلەک جیێن کوردستانێ دگەرن. چەلەبی د دەرهەڤێ ڤێ سەفەر و گەرا خوەدا پرتوکەک دنڤسینە و ناڤێ پرتوکا خوە ژی دکە سیاحەتنامە. د سیاحەتنامەیێ دا، شانزدە (١٦) دیالێکتێن کوردی تێنە ژمارتن و ناڤێ وان ژی وسا تێتە رێزکرن: مەحموودی، ئاڤنکی، زازایی، لۆلۆیی، جیلۆیی (هەکاری)، شیرڤانی، جزرەوی، پسانی، سنجاری، هەریری، ئەردەلانی، سۆرانی، خالتی، چەکڤانی، ئیمادی، رۆژکی."(٧) وسا خویا دکە کو چەلەبی ناڤێ عەشیران، مەنتیقا، شێوە و دیالێکتان تەڤلیهەڤ کرییە. ئەگەر ئەم ڤانا وەک دیالێکت تەسنیف بکن تەنێ لۆرانی، سۆرانی، ئەردەلانی و زازاکی دمینن. ئەو پەیڤێن دن ژی، ئەم دکارن پرانییا وان وەک ناڤێ عەشیر و شێوەیێن کورمانجی قەبوول بکن.

خەباتا پەدەگۆگێ ئەرمەن هاچاتور ئابۆڤیان(٨) (١٨٠٩-١٨٤٨) تەئسیرەک گران ل سەر ئیرانۆلۆگێن روسی کرییە. ژ بەر ڤێ یەکێ ئابۆڤیان وەک باڤێ کوردۆلۆژییا روسیایێ تێتە قەبولکرن. ئابۆڤیان ژی دیالێکتێن زمانێ کوردی ب ناڤێ کورمانجی و زازاکی وەک دوو شاخان پارڤە دکە.

پشتی ئابۆڤیان، پیتەر لێرخ(٩) (١٨٢٨-٢٨٨٤) یەک ژ هیمدار و سازکەرێن کوردۆلۆژییا سۆڤیەتێ تێتە قەبولکرن. ل گۆر بەلگەیێن ئیرۆ، "مەتنێن پێشینێ زازاکی، وی ب خوە، ل گۆر دەڤۆک و گۆتنا کوردێن کو د شەرێ روسیا-عوسمانییان دا ئەسیر کەتبوون، دایە بەرهەڤ کرنە. سالا ١٨٥٧-٥٨ێ، ئەڤ نقیس و مەتنێن بەرهەڤکری د سانت پترسبورگ دا هاتنە چاپکرن و بەلاڤکرن. فەرهەنگا پێشینا زازاکی-روسی ژی، سالا ١٨٥٨ێ هاتیە چاپکرن. هەمان دەمی ئالبەرت ڤۆن لۆک ژی، هن مەتنێن فۆلکلۆرا کوردی ب دیالێکتا کورمانجی و زازاکی بەرهەڤ کرنە و سالا ١٩٠٣ ل بەرلینێ دانە چاپکرن و بەلاڤکرن) (١٠)".

مێجەر سۆن(١١) ژی د دەرهەقێ زمانێ کوردی و فەرقێن ناڤبەرا دیالێکتێن وی دا دبێژە: "ژ غەینێ لەهجەیا موکری و شاخێن وێ، د کوردستانێ دا لەهجە و شێوەیێن دن ژی هەنە و هەموو ژی خوە وەک کوردێن خاس قەبوول دکن. ژ ڤان لەهجەیان یەکا هەری گرنگ ژی زازاکییە. زازا د ناڤ کوردان دا گروپەکە گەورەیە و ل دەرودۆرا دێرسیم، ئەزرگان و هن جیێێن ئەنەدۆلیایێ دا دژین. پرانییا وان د هەرێمێن چیاییدا دژین، پر توند و دژوارن. ب لەهجەیەکە ئارییا ساف قسە دکن. لەهجەیا وان هەم ژ لەهجەیا موکری و هەم ژ لەهجەیێن دنێن کوردی جودایە. وسا تێ فێمکرن کو لەهجەیا وان، لەهجەیەکە خوەسەرە و د پر کەڤنارە دا ژ فارسییا کەڤنارە ڤەقەتیایە. وەکی زمانێن ئاری، دڤێ ل سەر ڤێ لەهجەیێ ژی خەبات بێتە کرن. لەهجەیا زازاکی؛ ژ فارسی بێتر نێزیکی زمانێ کوردییە." (١٢)

س. ج. راولسۆن(١٣)، د بەندا "کوردستان"ا ئینسکلۆپیدیا بریتانییێ دا، دەرهەقێ زمانێ کوردی وەها دبێژە: "ئیرۆ زمانێ ئەساسییێ کوردان کورمانجییە، زازاکی و گۆرانی ژی دیالێکتێن جودا نە.(١٤)."

محەمەدئەمین زەکی بەگ ژی، ژ مادسۆن گرانت(١٥) نەقل دکە و دبێژە: "ژ سەدسالا ٣ یا بەری زایین و ڤر دا ژ زمانێ کوردی سێ دیالێکت پەیدا بوونە: دیالێکتا کورمانجی، بابانی و زازاکی (دنبلی).(١٦)" و هەر وەها (زیا گۆکئالپ)ێ کو ب ئەسلێ خوە ژ قەزا چێرموگا دیاربەکرێیە، دیالێکتێن زمانێ کوردی ب ڤێ ئاوایێ پۆلین کرنە: ١- کورمانجی، ٢- زازاکی، ٣- سۆرانی، ٤- گۆرانی و ٥- لووڕی(١٧).

سەرنووسەرێ کۆڤارا کوردستان (محەمەد میهری) ژی دبێژە: "د رەسەنییا خوە دا زمانێ کوردی دوو قسمە: کوردی و گۆرانی. گۆرانی ژی د ناڤا خوە دا دبە دوو شاخ: هەورامانی و زازا(١٨)."

رۆگەر لەسکۆتێ(١٩) و جەلادەت عالی بەدرخانێ کو "گرامەرا کوردمانجی" ئامادە کرنە، د دەربارەیێ دیالێکت و شێوەیێن زمانێ کوردی دا دبێژن: "١- کورمانجی، ٢-

سۆرانی، ٣- دوملی (زازاکی)، ٤-گۆرانی ( و گەلەک شێوەیێن وانێن هەرێمی)(٢٠)" هەنە.

کەمال بادلی دبێژە چار برێن زمانێ کوردی هەنە: "١- کورمانجی (کوردمانج، کورماج، کرمانج، کرماچ)، ٢- لووری (لور، لۆر، لەر)، ٣- گۆرانی (هەورەمانی، ئەورەمانی، زازا-دملی)، ٤-کەلهوری یان ژی سۆرانی»(٢١).

پرۆفیسۆر مارف خەزنەدار، تەسنیفکرنا مامۆستا تۆفیق وەهبی ئەساس قەبوول دکە و دیالێکتێن زمانێ کوردی وسا تەسنیف دکە: "١-کورمانجی (أ-کورمانجییا سەروو، ب-کورمانجییا خواروو-سۆرانی)، ٢-گۆرانی/ هەورامانی/ زازایی، ٣- لۆری (بەختیاری، فەیلی، کەلهوری، لەکی ژی وەک دەڤۆکێن ڤێ دیالێکتێ قەبوول دکە)(٢٢)."

زمانزان (قەناتێ کوردۆ) د پرتوکا خوەیا گرامەرا زوانێ کوردی (کورمانجی و سۆرانی) دا، زمانێ کوردی ل سەر چار دیالێکتان پارڤە دکە: ١- کورمانجی، ٢- زازا، ٣- لووری و ٤- گۆرانی(٢٣).

جگەرخوین ژی د گەلەک نڤیس و هەلبەستێن خوە دا زازاکی وەک دیالێکتەک کوردی قەبوول دکە و د پرتوکا خوەیا ئاوا و دەستوورا زمانێ کوردی (١٩٦١) دا ژی هەمان نێرینێ تەکرار دکە.

(ئا. بالی) ژی د پرتوکا خوەیا ب ناڤێ رێزمانا کوردی دا، سێ دیالێکتێن زمانێ کوردی دژمێرە: "١- کورمانجی، ٢- سۆرانی، ٣- زازاکی(٢٤)."

ژ ڤان ئاگادارییان ژی دیار دبە کو ئەم کوردییا کەڤنارە وەک مالباتەک قەبوول بکن کورمانجی، سۆرانی، لووری، هەورامی/ گۆرانی و زازاکی ژی دکەڤن ناڤا ڤێ مالباتێ. مرۆڤ دکارە ببێژە کو د ناڤ ڤان دیالێکتان دا ژی بتایبەت هەورامی، گۆرانی و زازاکی هین بێتر نێزیکێ هەڤدونن.

ژ ڤان ئاگادارییان دیار دبە کو زمانێ کوردی ژی د ناڤا خوەدا ل سەر گەلەک دیالێکتان پارڤە دبە. هەلبەت ب ئاوایەکی موتلەق دیارکرنا دیرۆکا ژهەڤبوونا زمانەک و دیالێکتێن وی نە هێسانە، لێ بەلێ ئەم دکارن ببێژن کو ئەڤ زمان هەموو د ناڤ هەڤ دا وەک پارچەیەک ئازبەتا زمانێن کوردی تێنە قەبوولکرن. زمان و شێوەیێن وییێن گوهەری ئان ژی دیالێکتێن وی، بەرهەمێن دیرۆکی و کولتوورییێن کۆمەلی (جڤاکی) نە. ژ ئالییێ دیرۆکی و کۆمەلناسی ڤە ژی، کۆک و ریچکێ ئەتنیکییێ ئاخافتڤانێن کۆما زمانێ کوردی و دیالێکتێن وی دگیژن هەڤ و یەکە. ئەوێن کو چەند دیالێکتێن زمانێ کوردی و هن خسوسیەتێن وی بزانن، ئەو دێ ببینن کو فەرقا ناڤبەرا دیالێکتێن کوردی، ژ فەرقا ناڤبەرا دیالێکتێن زمانێن دن کێمتر نەبە، زێدەتر نینە.

**٠٣. پەیڤا زازا و زازاکی، دمل و دملکی، کرد و کردکی، کرمانج و کرمانجکی د کیژان مانایێ دا هاتنە بکارئانین**

دەما کو ئەم بالا خوە ددن بەلگە و نڤیسارێن دیرۆکی، ژ بۆ زازاکی/ دملی/ کردی/ کرمانجکی و ئاخافتڤانێن وێ، هەم د ناڤا خوە دا و هەم ژ تەرافێ گەلێن بیانییان ڤە پەیڤ و گۆتنێن جودا جودا هاتنە گۆتن و نڤیساندن.

ئیرۆ ئاخافتڤانێن زازاکی، جی ب جی خوە ب ناڤێ "زازا"، "دملی"، "کرد" و "کرمانج" ددن ناساندن؛ زمان و دیالێکتا خوە ژی ب ناڤێ "زازاکی"، "کردکی"، "دملی" یان ژی "کرمانجکی" ددن ناساندن.  دەربارەیێ ڤێ (زیا گۆکئالپ) دبێژە: "قەومێن کوردان ناڤێن جودا جودا ل خوە و ل هەڤوودو کرنە. میسال؛ ئەوێن کو کورمانجی دپەیڤن ژ خوە را نابێژن "کورد"، دبێژن ئەم "کورمانج"ن و ژ "زازایان" را دبێژن "دونبولی". ئەوێن کو ب زازاکی دپەیڤن ژ خوە را دبێژن "کرد" و ژ کورمانجان را دبێژن "کرداسی". ترک ژی، ژ "کورمانجان" را دبێژن "کورد" و ژ "دونبولی"یان را ژی دبێژن "زازا". بیزاتەی ئاخافتڤانێن زازاکی و کورمانجی ب خوە، پەیڤا "زازا" بکارنایینن(٢٥).

دەما ئەم بالا خوە بدن نڤیسێن دەستپێکی یێن "زازاکی"، ئەڤ تەسبیتا (زیا گۆکئالپ) راست دبە. هەم د خەباتا (پیتەر لێرخ) و هەم ژی مەولوودا مەلا ئەحمەدێ خاسی دا ژ بۆ خوە ناساندنێ پەیڤا "کرد" هاتییە بکارئانین. مامۆستا خاسی د داوییا مەولوودا خوە دا وسا دبێژە: "تەمام ب ڤراشتشی مەولوودێ کردی ب یاردمێ خالقی و بەرەکەتە پێغەمبەرێ ما(٢٦)."

قسمەکی دێرسمی یێن کو ب دیالێکتا دملی دپەیڤن ژ خوە را دبێژن "کرمانج"، ب گشتی ژ کورمانجان را ژی دبێژن "کرداس" و ژ دیالێکتا وان را ژی دبێژن "کرداسی" یان ژی "کرداسکی"(٢٧)

(نووری دێرسمی)، زازاکییا دێرسمێ وەک زمانێ خاسێ کوردان قەبوول دکە و دبێژە: "زمانێ زازاکییێ کو دێرسمی دپەیڤن، بێگومان زمانێ باڤکالێ وانێن ماد و ئارییانە(٢٨)."

کەمال بادلی دبێژە: "زازایێن تورکیەیێ، خوە وەک کوردێن ئەسل قەبوول دکن و ژ خوە را دبێژن کرد و ژ کوردێن دن را یانی ژ کورمانجا را -د مانا پچووک دیتنێ دا- دبێژن کرداسی(٢٩)."

پرۆفیسۆر (مەهردار ئیزەدی) ژی د دەرهەقێ ڤێ بابەتێ دە گۆتنا (باسیل نیکتین) نەقل دکە و دبێژە: "ژ بەر کو ئاخافتڤانێن دملی تیپا /ز/ پڕ زێدە بکارتینن، کورمانجان ژ وان را گۆتییە "زازا".(٣٠)

ڤلادیمێر مینۆرسکی، پەیڤا "دملی " و "دەیلەمی" پەڤ گرێدە و دبێژە ل گۆر گۆتنا ئاندرەاس د ناڤبەرا "زازا و دەیلەمییێن بەرێ دا مرۆڤاتی هەیە."(٣١) دڤێ ئەم ژ بیر نەکن

کو د نڤیسار و کتێبێن جودا دا، گەلەک فۆرمێن جودا جودایێن نڤیساندنا پەیڤا "دملی" هەنە: "دملی"، "دومبلی" "دالامی"، "دەیلەمی"، "دنبلی" و "دملی". د گەلەک جییان دە ژی فۆرمێن پەیڤا "دملی"، وەک ناڤێ عەشیرەک دەرباس دبە. مەسەلا د شەرەفنامەیێ دە "دنبلی"، وەک ناڤێ عەشیرەکا ئێزدییا دەروودۆرا موسل و شامێ دەرباس دبە(٣٢). ئیرۆ ژی د هن هەرێمان دا ب ناڤێ "دومبلی"، "دمبلی" و "دوملی" عەشیر هەنە.

رۆبەرت ئۆلسۆن ژی پەیڤا "زازا"، "دەیلەم" و "گۆران" وەک پەیڤێن ب هەڤرا تێکلدار قەبول دکە و دبێژە: زازا ژ زمانێ خوە را دبێژن دملی و ئەڤ ژی ئیحتمالا تێکلییا وان و دەیلەمییێن باکوورێ ئیرانێ دهێنە بیرا مرۆڤ. لەهجەیا کوردییا زازاکی، ژ کورمانجییێ -کو پرانییا عەشیرەتێن کوردستانا باکوور پێ دپەیڤن- زێدەتر نێزیکێ لەهجەیا گۆرانییە(٣٣)."

پەیڤا "زازا" و "دملی"، د هن چاڤکانییان دا ژی ل شوونا جی و عەشیران دا هاتنە نڤیساندن. هن نڤیسکار و چاڤکانیێن دن ژی پەیڤا "زازا"، ب پەیڤا "زەڤەزان (زۆزان)"، "زەڤەزانییە"، "زاڤزان"، "زەوەزان"، "زەوزان"، "زۆزانییە" و "زووزان" ڤە گرێ ددن(٣٤).

وەختا کو مەسەلەیا "زازا" یان ژی "زازاکی"، "کورد" یان ژی "کورمانجی" تێ رۆژەڤێ، مرۆڤ بەحسا هن نڤیسکارێن ئیدۆلۆژییا فەرمییا تورکان نەکە، بەلکی مانیپولاسیۆنێن ئیرۆیین ژی راست نەین تێگەهیشتن. دەرهەقێ ڤێ مژارێ (نەزمی سەڤگەن) دبێژە: "زازاکی زمانەکی تەڤلیهەڤە و ب ئەسلێ خوە ژی، ژ ترکی پەیدا بوویە."

پەیدابوونا پەیڤا "زازا" ژی، ب ترکێن ئۆغوز ڤە گرێددە و دبێژە: "زا"، ناڤێ لاوەکی ئۆغوزخان بوو. قەومێن دەستپێکێ ژ بۆ کو گۆتنا پەیڤێن یەک هەجە ب شداندی تەلەففوز دکرن، ناڤێ "زا"یێ لاوێ ئۆغوزخان ژی ب ئاوایێ "زا-زا/زازا" هاتییە گۆتن(٣٥)". (هایری باشبوگ) ژی ل سەر ڤێ مەسەلێ، گۆتنێن نێزیکێ سەڤگەن تیکرار دکە و دبێژە: "هن مرۆڤ ژ قەستیکا ڤە، ب نییەتەکە خەراب و پێشینهکوم "زازا"یان د ناڤ مەفهوما "کورد"ان دا موتەعالا دکن. لێ بەلێ ئەڤ حکوم، ل هەمبەرێ ریئالیتەیا تاریخی تام تەزاتێک تەشکیل دکە کورمانجی ژی و زازاکی ژی دوو لەهجەیێن جودایێن ترکی نە. ل گۆر فکرا مە ناڤێ "زازا/ زا-زا"، ب گوهەرینا ناڤێ "سو/ ئاو"(سو-سو) پەیدا بوویە(٣٦)."

مرۆڤ دکارە نموونەییێن وها هینا درێژ و زێدە بکە، لێ ئەز دبێژم قەی ژ بۆ زەلالکرن و ئاشکەراکرنا ڤی بەشێ خەباتا مە، ئاگادارییێن ل ژۆرێ، تێکلییا دیرۆکی و مانایا بکارئانینا ڤان پەیڤان ب زەلالی دیار دکە.

ل ژۆرێ چاوا کو گەلەک لێکۆلینەران ژی گۆتییە، ئەم دکارن ببێژن کو زمانێ کوردی ژی وەکی هەموو زمانێن دنیایێ د ناڤ خوە دا دیالێکت ب دیالێکت ژ هەڤ جودا دبە. دڤێ هەبوونا دیالێکتێن جودا نە وەک تشتەک نێگەتیف، وەک خەزینەیەکە دەولەمەندا

زمان بێتن دیتن. هەبوونا دیالێکتێن جودا "تەنێ خسوسییەتێک زمانێ کوردی نییە؛ د دنیایێ دا نەتەوەیێن کو زمانێ وان هەری سەڕاست و دەولەمەندە، دەورە ب دەورە ئەدەبیاتەک وانێ سەد سالان هەیە، هین ژی لەهجەیێ وان هەنە، زندینە و وەک وەختێن بەرێ تێنە ئاخافتن(٣٧)." فەرق و نێزیکاییا زمان و دیالێکتێن دن و ب تایبەت ژییێ زمانێن کۆما ئاری چقاس بە، یێ زمانێ کوردی و دیالێکتێن وی ژی کێم-زێدە ئەوقاسە. نێزیکاییا ناڤبەرا دیالێکتێن کوردی ژ فەرقا ناڤبەرا وان گەلەک زێدەترە. ژ ئالیێ دیرۆکی و کولتوری ڤە ژی، کۆک و رووچکێ ئەتنیکییێ ئاخافتڤانێن ڤی زمانی و دیالێکتێن وی دچە سەر هەڤ و یەکە.

**٤. جی و وارێن کو ئاخافتڤانێن زازاکی تێدە بەلاڤ بوونە**

ئیرۆ د بارەیێ هەژمارێن ئاخافتڤانێن زازاکی دا فکرێن جودا جودا هەنە. ل گۆر گۆتنا هن لێکۆلینەر و نڤیسکاران ب نێزیکی ٢.٥-٣ میلیۆن ئاخافتڤانێن زازاکی هەنە و هن ژی هەژمارەکە هین زێدەتر دبێژن. لێکۆلینەر و نڤیسکار ئۆسمان ئایدن ژی دبێژە: "ل گۆر سەرژمێرییا سالا ٢٠٠١ێ، ژ ٪٦.٥٤ێ نفووسا کوردستانا باکوور، ب لەهجەیا دملی (زازاکی) دپەیڤن(٣٨)." دیارە کو دەرهەقێ ڤێ بابەتێ فکرێن جودا هەنە. بێگومان هەتا کو ب تایبەتی د گوند و باژارێن کوردان دا و ب گشتی ژی د هن باژار و مەترۆپۆلێن تورکیێ دا، ب رێبازەکە راست و ئاشکەرا نفووسا ئاخافتڤانێن زمان و دیالێکتێن کوردی نەیە تەسپیتکرن، نەخشەیا دیالێکتێن کوردی چێنەبە، دیارکرنا نیسبەتا ئاخافتڤانێن زازاکی گەلەک زەحمەتە. چمکی گەلەک عەشیر و جیێن کو ب نفووسا خوە گشک زازا تێنە قەبوولکرن، وان دەران ساف نە زازا نە، میقدارەک گرینگێ نفووسا کورمانجان ژی ل وێ دەرێ هەیە.

دەما کو ئەم بالا خوە ددن جیێن بەلاڤبوونا نفووسا عەشیرەتان و زمانێ وانێ ئاخافتنێ، ئەڤ یەک هین ب زەلالی دیار دبە. "د کوردستانێ دا گەلەک عەشیر هەنە ل هەرێمەک ب دملی (زازاکی)، ل هەرێمەکا دن ب کورمانجی، ل هەرێمەکا دن ژی ب سۆرانی و هەورەمانی دپەیڤن. مەسەلا: عەشیرا حەیدەران، ل هەرێما دێرسمێ ب زازاکی، ل وانێ کورمانجی و ل باشوورێ کوردستانێ ژی سۆرانی دپەیڤن؛ عەشیرا لۆلان، ل هەرێما دێرسیمێ زازاکی، ل وانێ و هەکاری ژی کورمانجی دپەیڤن؛ عەشیرا دەمەنان ل دێرسمێ ب زازاکی، ل هەرێما سێواس، وان و هەکارییێ ژی کورمانجی دپەیڤن؛ عەشیرا شادییان ل دێرسیم، چەولیک، موش و قەرەقۆچانا خارپێتێ کورمانجی و ل قەزا مادەنێ ژی زازاکی دپەیڤن؛ عەشیرا ئیزۆلی ل بینگۆل، دێرسم، ئەلازیز، مەلاتییێ و سوێرەکێ ب کورمانجی و قەزا پوتورگەیا مالاتییێ ژی زازاکی دپەیڤن؛ عەشیرا خۆرمەکان، ل

چەولیکێ هن گوندێن وان ب زازاکی و هنێن دن ژی ب کورمانجی دپەیڤن..(٣٩)“ یانی ئەم دبینن کو جیێن ئاخافتڤانێن دیالێکتێن کوردی نە یەکپارەیە.

محەمەد میهری ل سەر سەحا ئیرۆیینا بەلاڤبوونا زازایان وەها دبێژە: ”زازا؛ بنەجیێن قسمەک ویلایەتێن وەک ئەرزەرۆم، خارپێت، دیاربەکر، بەدلیس و ئازەربایجانێ نە(٤٠).“ ئەو ویلایەت و قەزایێن کو ب تەمامی یان ژی قسمەکی وان ب زازاکی دپەیڤن ئەڤن: پرانییا نفووسا ناڤا باژارێ چەولیک و قەزایێن وێ؛ ل ئالیێ باکوور پرانییا نفووسا دێرسیمێ؛ قسمەکە موهیمێ ناڤا سووکا دیاربەکر و پرانییا قەزایێن وییێن وەکی پیران، هێنە، گێل، چێرمووک، چنگووش، قسمێکە لجێ و قولپ و هن گوندێن ئەرغەنی؛ قسمەکە هندکێ ناڤا سووکا خارپێت و قسمەکێ گرینگێ قەزایێن وییێن وەکی پالە، مادەن، خولێمان و ١٥-٢٠ گوندێن هەرێما قەرەبەگان؛ د ناڤا سووکا ئەرزنگانێ دا قسمەکە هندک و د هەرێما قەرەدەرەیا ناڤبەرا تەکمان و پوولوومورێ دا نێزیکێ ٣٠ گوند؛ ل سەمسوورێ تەنێ قەزا گەرگەر (ئالدووش) و ل ئورفایێ ژی پرانییا قەزا سۆرەگێ؛ ل مووشێ قسمەکە هندکێ قەزا ڤارتۆ و ل بەدلیسێ ژی نێزیکێ ١٥ گوندێن مۆدکان ب زازاکی دپەیڤن. هەروەها ل هن قەزایێن باژارێن وەکی سێرت، ئەرزەرۆم، سێواس و ...هتد ژی کۆلۆنییێن ئاخافتڤانێن زازاکی هەنە. ئەم دکارن ببێژن کو ژ دەرڤایێ جیێن ل ژۆرێ هاتنە هەژمارتن، ل دیاسپۆرا و مەترۆپۆلێن تورکیێ ژی نفووسەکا گرینگا ئاخافتڤانێن زازاکی هەنە.

٥. نڤیسینا ب دیالێکتا زازاکی و بەرهەمێن وێ یێن ئەدەبی

وەختا کو بابەت دیالێکتێن زمانێن کوردی و ب تایبەت ژی زازاکی بە، گەرەک ئەم هنەک ژی بەحسا نڤسین و دۆکیۆمێنتێن زازاکی ژی بکن. چونکو نیشانەک دەولەمەندییا زمان ژی، نڤیس و حەجمێ نڤیساندنا زمانە. ژ ئالییێ نڤیساندنێ ڤە دیالێکتا زازاکی لاوازە، قاسێ کورمانجی و سۆرانی پێشڤە نەچوویە. ئیرۆ د بەر دەستێ مە دا بەرهەمێن کو شکلێ کەڤنارەیێ زازاکی و تەکامولا وێیا دیرۆکی دیار بکە نینن. دگەل ڤێ یەکێ، نڤیس و دۆکیومێنتێن زازاکییێن کو ل بەر دەستێ مە هەنە، نە پڕ کێمن. هەکە ئەم نڤیسێن هەورامانی و گۆرانی ل سەر خانەیێ زازاکی نەحەسبینن و ژ ئیرۆ شوون دا ژی دۆکیومێنتێن نوویێن زازاکی ژ جیێن تاری دەرنەکەڤن رۆناهییێ، دۆکیومێنتێن کو د ناڤبەرا سالێن ١٨٥٦-١٨٥٨ ان دا ژ ئالیێ (پیتەر لێرخ) ڤە هاتنە بەرهەڤکرن و چاپکرن، وەک نڤیس و دیکۆمەنتێن پێشینێن زازاکی تێنە قەبوولکرن. ب ئاوایێ بەرهەمێن ئەدەبی، پرتوکا پێشینا ب زازاکی ژی، مەولوودا (١٨٩٩) ی مەلا ئەحمەدێ خاسییە.

د ڤان ماتریالێن فۆلکلۆریکێ زازاکییێن کو ژ ئالیێ (پیتەر لێرخ) ڤە هاتنە بەرهەڤکرن، هەم پەیڤا ”کرد“ و هەم ژی ”زازا“ هاتنە نڤیساندن. پەیڤا ”کرد“، پێناسینا وان ب خوەیە. پیتەر لێرخ د مەسەلا ”قاوخێ نێرب و هێینی“ دا، گۆتنا خەلەف ئاغا ب ڤی ئاوایێ نەقل

دکە: "خەلەف ئاغا ژ عەسکەرێ خوە را گۆت: بنێرن ئاغالەران، ئەم دچن قاوخە، نەترسن، عەسکەرێن دەقما بەگ زافن، هەما گش ترکن، نکارن ب مە را قاوخە بکن، ئەم گش جوانمێردێ کردانن، مێرێ عەشیرانن، نەترسن، ئەم وایە دچن، هەتا کو سەرێ من نەچە ژ چ کەسی را تشتەکی تونە" (٤١)

وەختا کو ئەم بالا خوە ددنە ڤان مەتنان، هەکە هن کێمانییێن ئەلفبێیا نڤیساندنێ تونە بن، وەکی زمانێ مەنتقا نێربا ئیرۆیە، قەت نەگوهەرییە(٤٢).

ئەگەر ئەم بەحسا نڤسین و پەیدابوونا ئەدەبیاتەکە ب دیالێکتا زازاکی/ کردی/ دملی بکن، دڤێ ئەم ڤێ بابەتێ ب سەر دوو بەشان ڤە ژ هەڤ جودا بکن:

**٥.١. نڤیسینا مەتنێن کلاسیکێن دینی: مەولوود**

دەما بەحسا نڤیسین و ئەدەبیاتا ب زازاکی ببە، دیار دبە کو چاڤکانییێن سەرەکە یێن نڤیسینا زازاکی مەتنێن کلاسیکێن دینی نە، کو ئەم ژ وان را دبێژن مەولوود. مەولیدا زازاکی، هەم د مەدرەسەیێ و هەم ژی د ناڤ خەلکێ دا هاتییە/تێتە خوەندن. ل گۆر زانینا مەیا ئیرۆ، پرتوکا پێشینا زازاکی مەولوودا مەلا ئەحمەدێ خاسییە(٤٣). مەولوودا خاسی، د سالا ١٨٩٩ان دا ل باژارێ دیاربکر د چاپخانەیا لیتۆگرافییایێ دا هاتییە چاپکرن. بەرهەمێن قەلەما مەلا ئەحمەدێ خاسی، نە تەنێ مەولوودە، وی، ب زمانێ ترکی، عەرەبی و کورمانجی هەلبەست ژی نڤیساندنە(٤٤). مەولوودا خاسی ب ڤێ ئاوایێ دەست پێ دکە:

**"ئەز ب بیسمیللاهی ئیبتدا کەنا**

**رازقێ عامان و خاسان پییا کەنا**

**رەببی حەمد و شوکری ئانجاخ تۆرێ بێ**

**کیبر و مەدح و فەخر پێرۆ تۆرێ بێ**

**چەندە رەی بێ ماسیوا بێ حەمدێ ما**

**لا بەلێ نێرێ حیسابان چەندێ ما**

**حەمد و شوکرێ تۆ ئەدا قەت نێبەنێ**

**ما سەرا رەببی ت زانێ ڤینەنێ**

**حالێ میسکین و فەقیر و ناقسان**

**روورەش و زەر سیاهێ زەی هەسان.»**(٤٥)

هەلبەستا وییا ل سەر سەیدێ کارازی ژی ب ڤێ ئاوایێ دەست پێ دکە:

**"درێژ کە خاسییا، نەزمەک جەدیدە**

**د پشتی چەند سەلام و چەند تەحییات**

**ل سەر کارازییێ کو ناڤ سەیدە**

**دخوینە ئەو ژبەر ئینجل و تەورات**
**ل تەختێ خوە کو روونێ قەیسەرە**
**ل هەسپێ خوە سوار بە عەنتەرە ئەو**
**ل سەیرا رۆژ و شەڤ ئیسکەندەرە ئەو**
**ب وەچێ خوە ل جاهز بوویە دەهـ قات**
**بەسە خاسی سەید میرێ مەلانە**
**وەلێ عاشق بوویە ل کەچکێ فلانە**
**نکارە زەفت کە بۆنجیێن قولانە**
**وەلەو سانجول بکی وان تو ژ پۆلا."** (٤٦)

پشتی مەولوودا مەلا ئەحمەدێ خاسی، پرتوکا دوویەمینا کو ب زازاکی هاتییە نڤیسین، مەولوودا (مەلا عوسمان ئەفەندییێ بابژ) ە کو وێ دەمێ مفتییێ (سۆرەک)ێ بوو. مەولوودا بابژی، د سالا ١٩٠٣ان دە هاتییە نڤیسین لێ بەلێ د سالا ١٩٣٣ان دا ب ئالیکارییا مەلا نەزیر، ژ ئالییێ جەلادەت بەدرخان ڤە هاتییە چاپکرن. جەلادەت بەدرخان د دەرهەقێ چاپکرنا مەولوودا عوسمان ئەفەندییێ بابژ دبێژە: ژ زوو ڤە دلێ من دخوەست کو ئەز هنەک ب زارێ دملی را عەلاقەدار بم... مەتنا مەولوودا عوسمان ئەفەندییێ بابژ ل نک من هەبوو لێ بەلێ چەند رووپەل ژێ کێم بوون و د هنەک جیان دە ژی نەدهات خوەندن... من دخوەست ئەز یەکی ببینم کو ب دملی باش زانیبە." (٤٧) هەڤناسینا وی و مەلە نەزیر، رێیا چاپکرنا ڤێ مەولوودا دملی ڤەدکە و د ئەنجاما خەباتا هەڤبەش دا، مەولوودا بابژ، د سالا ١٩٣٣ان ل شامێ تێتە چاپکرن. د ناڤبەرا چاپبوونا مەولوودا ئەحمەدێ خاسی و عوسمان ئەفەندییێ بابژ دا، ٢٩ سالا دەرباس دبن.

بەشەکێ ژ مەولوودا عوسمان ئەفەندییێ بابیژ وەهایە:

**"ب نامێ واحیدێ تۆ عەرد و ئازمێن**
**ک ما دەست کەرد ب تۆ گروە رەنگین**
**شما حەمدێ خو ئەڵلایی رێ بیارین**
**شەو و رۆژ قاپیدێ ئەی د بقارین**
**پێغەمبەری رێ سەلەواتی بوانین**
**تم و تم دەردێ جێ ڤەر د بنالین**
**مسالێ نا دنێ زانی ت مەردم**
**ت جتێرێنی، گروەی تۆ ژی تۆخم**
**کە تۆ زانان ک تۆ دنیا سەنین ئۆ**
**بزانێا دنێ جایێ جوو نییۆ."** (٤٨)

### ٥.٢ بەرهەمێن نڤیسینا زازاکی د شکل و قالبێ ئەدەبیاتا مۆدێرن دا

پشتی نڤسین و چاپکرنا ڤان هەر دو بەرهەمێن کلاسیکێن دینی (مەولوود)، ئەم دبینن کو دەمەکە درێژ یانی هەتا سالێن ١٩٦٣ان، ژ غەینی چەند نووچە و کورتەنڤیسان ب دیالێکتا زازاکی تشتەک نەهاتییە نڤسین. ئەم دکارن ببێژن کو نڤیس و نڤیساندنا زازاکی (دملی/ کردکی/ کرمانجی) د ڤان دەمێن نێزیک دا یانی ژ سالێن ١٩٧٧ان شوون ڤە رۆژ ب رۆژ زێدەتر بوویە.

ژ ڤان سالان شوون ڤە، د ناڤ روویپەلێن رۆژنامەیا رۆژا وەلات (١٩٧٧) و کۆڤارا تیرێژ (١٩٧٩) دا هنەک هەلبەست (وەرگەر)، چیرۆک و نڤیسێن فۆلکلۆریکێن زازاکی هاتنە چاپکرن. ڤێ دەمێ ژی کورت ئاژۆتییە، ب تەڤی کودەتایا لەشکەری یا ١٢یێ سالا ١٩٨٠ان قوت بوویە. ئاخافتن ژی د ناڤ دا، هەر جۆرەیێ نڤیسا ب زمان و دیالێکتێن کوردی هاتە قەدەخەکرن. د ڤێ پێڤاژۆیێ دا گەلەک رەوشەنبیرێن کورد ناچار مان کو ژ ترکیێ دەربچن. گەلەک ژ ڤان رەوشەنبیر، سییاسەتمەدار و نڤیسکارێن کورد چوون دەولەتێن جور ب جوریێن ئەورووپایێ و خەباتێن خوەیێن کولتوری- سییاسی ل وێ دەرێ دەوام کرن. د وێ هەنگامەیێ دا نڤسینا ب دیالێکتێن کورمانجی و زازاکی ل دەرڤەیێ وەلات، ب چاپکرنا کۆڤار و رۆژنامەیێن جور ب جور، پرتوکێن نوو دەوام کر و بێتر پێش کەت.  د رۆژنامەیا ئارمانج و کۆڤارا هیڤییا ئەنستیتویا کوردییا پاریسێ دا، نڤیس و گۆتارێن گرینگ ئێن ب دیالێکتا زازکی هاتن بەلاڤکرن. دگەل رۆژنامە و کۆڤارێن وەرکینۆ، ل سەر بابەتێن جور ب جور پرتوکێن نوو ژی هاتن چاپکرن.

د سالا ١٩٩٢ان دە، ب راکرنا قەدەخەیا ل سەر نڤسین و چاپکرنا بەرهەمێن ب زمانێ کوردی، دەمەکە نوو دەست پێ کر. ژ ڤێ دەمێ شوون ڤە، ئێدی پەی دەرپەی هەم د ناڤا وەلات و هەم ژی ل دەرڤەیێ وەلات نڤسین و چاپکرنا ئەسەرێن ب زازاکی بێتر بوو. دەما کو بەحسا خەبات و نڤیساندنا زازاکی دبە، حەوجەیە ئەم بەرییا هەر تشتی خەباتا کۆڤار و گروبا ڤاتەیێ بینن بیرا خوە. بێگومان ب دیالێکتا زازاکی تەنێ د کۆڤارا ڤاتەیێ دا نایێ نڤیساندن، د کۆڤارێن وەکی وار، بیر، شەوچلا، نەوەپەل، ئەورۆ، ئارییە، وارە، تژا سۆدری و ود. دە ژی نڤیسێن ب دیالێکتا زازاکی هاتنە و تێنە چاپکرن و بەلاڤکرن... ئیرۆ د گەلەک مالپەرێن ئینتەرنێت و کۆڤاران دا نڤیس و خەباتێن ل سەر زازاکی تێنە چاپکرن و بەلاڤکرن.

**ل گۆری بابەتا وان پرتوکێن زازاکی (دملی/ کردکی/ کرمانجی)یێن چاپبوویی:**

١- زمان: ئەلف: فەرهەنگ (٢٠ کتێب)، بێ: گرامەر (١٢ کتێب)

٢- فۆلکلۆر (١٠ کتێب)

٣- ئەدەبیات:

ا) شیعر/هەلبەست (٤٦ پرتوک)

ب) چیرۆک (٥٣ کتێب): ١. چیرۆکێن گەلێری، ٢. چیرۆکێ مۆدێرن و نوو، ٣. چیرۆکێن وەرگەراندی

ج) رۆمان (١١ پرتوک)

د) چیرۆک: (٣٦ کتێب)

٤- لێکۆلین و لێگەرین

٥- بیۆگرافی (٣ پرتوک)

٦- هەڤپەیڤین (٣ پرتوک)

٧- ئانتۆلۆژی

٨- وەرگەرا بەرهەمێن جور ب جور

٩- بیرئانین (٣ پرتوک)

١٠- پرتوکێن دەرسان (٣ پرتوک ژ بۆ پۆلا ٥، ٦، ٧)

١١- کتابێ دینی (٢٣ کتێب)

١٢- پرتوکێن ژ بۆ پەروەردەییا زارۆکان (٣٥ پرتوک)

١٣- بیبلیۆگرافیا (٢ پرتوک)(٤٩)

١٤- کۆڤار و رۆژنامە

١٥- مالپەر و سۆسیال میدیا

ئەڤ جۆرەیێ نڤیسینا بەرهەمێن مۆدێرنێ زازاکی، گەلەک دەرەنگ، ژ سالێن ١٩٧٧ان شوون ڤە دەست پێ کرییە. بەرهەمێن نڤیساندییێن دیالێکتا زازاکی، پێشییێ د کۆڤار و رۆژنامەیان دا هاتنە بەلاڤکرن و پاشێ ل گۆر بابەت و ناڤەرۆکا خوە، پەی دەرپەی پرتوکێن نوو هاتنە چاپکرن. ل ژۆرێ وەک نموونە هنەک جۆرەیێن نڤیسینا بەرهەمێن زازاکی هاتنە دیارکرن. ژ غەینی کۆڤار و رۆژنامەیێن پەریۆدیک، ئەم دکارن ببێژن کو ب ئاوایەکی گشتی د بابەتێن جور ب جور هەتا ئیرۆ نێزیکێ ٤٠٠ پرتوک ب زازاکی هاتنە چاپکرن.

د داوییێ دا کو ئەم بالا خوە بدن هەژمار و جۆرەیێ پرتوکێن چیرۆک، شیعر، رۆمان، زمان و بەرهەمێن دنێن نڤیساندی یێن زازاکی/ کردی/ دملکی/ کرمانجی، ئەم دکارن ببێژن کو ئەدەبیاتەکێ نووزایی ب دیالێکتا زازاکی دەست پێ کرییە. لێ بەلێ دڤێ ل سەر تەما، جۆرە و پێشخستنا ڤێ ئەدەبیاتێ خەبات و گەنگەشییێن هین بەرفرەهـ بێنە کرن.

# سەرچاوە و پەراوێزەکان


1Prof. Dr. Doğan Aksan, Her Yönüyle Dil, Türk Dil Kurumu Yayınları: 439, 1995, Ankara, r. 145

2 Ludwig Paul

3 Ludwig Paul, I. Uluslararası Zaza Dili Sempozyumu, Bingöl Üniversitesi Yayınları, 2011, r. 20

4 John Loyns

5 Prof. Dr. Doğan Aksan, Her Yönüyle Dil, Türk Dil Kurumu Yayınları: 439, Ankara, 1995, r. 146

6 Şeref Xan, Şerefname, Hasat Yayınları, 4. Baskı, İstanbul, 1990, r. 20, . Mc. Carus-Minorsky, Kürtlerin Menşei ve Kürt Dili İncelemeleri, Sönmez Neşriyat ve Matbaacılık, İstenbul,1963, r. 48

7 Martin Bruinessen, Studıa Kurdıca, Onyedinci Yüzyılda Kürtler ve Dilleri: Kürt Lehçeleri Üzerine Evliya Çelebi'nin Notları, sayı: 1-3, Paris Kürd EnstitüsüYayınları, Nisan-1985, r. 18

8 Haçatur Abovyan

9 Peter J.A. Lerch

10 Joye Blau, Kürtçe Dilbilim ve Sözlük Çalışmaları, Studia Kurdica, No: 1-3, Paris, Nisan 1985, r. 65

11 Major E. B. Soane

12 M. Emin Zekî Beg, Kürtler ve Kurdistan Tarihi, 4. Baskı, çeviren: Vahdettin İnce, Mehmet Dağ, Reşat Adak, Şükrü Aslan, Nûbihar Yayınları, İstanbul, 2012, r. 297

13 Sir H. C. Rawilson

14 Neqilkar: Bilal N. Şimşir, Kürtçülük(1787-1923), Bilgi Yayınları, 3. Baskı, İstanbul, 2009, r. 519

15 Madson Grant

16 M. Emin Zekî Beg, Kürtler ve Kurdistan Tarihi, 4. Baskı, çeviren: Vahdettin İnce, Mehmet Dağ, Reşat Adak, Şükrü Aslan, Nûbihar Yayınları, İstanbul, 2012, r. 290

17 Ziya Gokalp, Kürt Aşiretleri Hakkında Sosoyolojik Tetkikler, Sosyal Yayınları, İstanbul, Nisan 1992, r. 27

18 Mihmed Mîhrî (M.M), Mukaddimet-ûl Îrfan, Necmî İstikbal Metbası, İstanbul, 1918, b. http://www. kovarabir.com/ mehmet-mihrim-m-mukaddimet-ul-irfan/

19 Roger Lescotê

20 Emîr Celadet Bedirxan, & Roger Lescot, Kürtçe Dilbilgisi, Doz Yayınları, İstanbul, 1997, r. 9

21 Kemal Badıllı, Türkçe İzahli Kürtçe Gerameri (Kurmancça Lehçesi), Med Yayınları, 2. Baskı, 1992, İstanbul, r. 22-23

22 Prof. Maruf Xeznedar, Zimanê Kurdî, http://www.kovarabir.com/dr-marufx-eznedarzimane-kurdi/

23 Qanatê Kurdo, Gramera Zimanê Kurdî (Kurmancî-Soranî), KoralYayınları, 1990, İstanbul, r. 7

24 A. Bali, Kürtçe Dilbilgisi (Türkçe İzahli), Alan Yayınları, 1992, İstanbul, r. 35

25 Ziya Gokalp, Kürt Aşiretleri Hakkında Sosyolojik Tetkikler, Sosyal Yayınları, İstanbul, Nisan 1992, r. 27

26 Mela Ehmedê Xasî, Mewlûdê Nebî, Fırat Yayınları, İstanbul, 1994, r. 42. Kurmancîya wê: Temam bû çêkirina Mewlûda kirdî, bi alîkarîya Xaliq û bereke-ta pêxemberê me.

27 Malmisanij, Kird, Kirmanc, Dimilî veya Zaza Kürtleri, Deng Yayınları. İstanbul, 1996, r. 11

28 Dr. Nûrî Dersimî, Kurdistan Tarihinde Dersim, Doz Yayınları, İstanbul, İkinci Baskı, 2004, r. 65

29 Kemal Badilli, Türkçe İzahli Kürtçe Gerameri (Kurmancça Lehçesi), Dipnot: 2, Med Yayınları, İstanbul, r. 22

30 Izady, Mehardad R, Bir el Kitabı Kürtler, Doz Yayınları. r. 299

31 İslam Ansiklopedisi, Cilt:6, r. 1112

32 Şeref Xan, Şerefname, Hasat Yayınları, 4. Bask, 1990, r. 21

33 Robert Olson, Kürt milliyetçiliğinin kaynakları ve Şeyh Said ayaklanması, Özge Yayınları, Ankara, 1992, r. 145-46

34 Malmisanij, Kird, Kirmanc, Dimilî veya Zaza Kürtleri, Kasim 1996, Deng Yayınları, b. notê jêrîn ê 153, r. 11

35 Nazmi Sevgen, Zazalar ve Kızılbaşlar: Coğrafya-Tarih-Hukuk-Folklor-Teogoni, Kalan Yayınları, Ankara, r. 34

36 Hayri Başbuğ, İki Türk Boyu: Zazalar ve Kurmanclar, Türk Kültürünü Araştırma Enstitüsü, Ankara-1984), r. 17-33

37 Kurdîyê Bîtlîsî, Jîn, h.: 14 (1919),Wer.: M. Emîn Bozarslan,Weşanxaneya Deng, Sweden,1985

38 Osman Aydın, Li Kurdistana Bakûr struktura demografîk, www.lemondekurdi.com, hej.: 19

39 Seyîdxan Kurij, Zazalar ve Zazaca Yazınının Tarihçesi, http://www.kovarabir.com/seyidxan-kurij-zazaca- yazininin-traihcesi-II

40 Mehmed Mîhrî, (M.M.), Mukaddimet-ûl Îrfan, Necmî İstikbal Metbası, İstanbul, 1918, b. http://www.kovarabir.com/ mehmet-mihrim-m-mukaddimet-ul-irfan/

41 Peter J. A Lerch, Forschungen über die kurden und die iranischen Nordchaldar. r. 78, Band I St. Petersburg 1857

٤٢ ب.، قسمێک چیرۆکا کە ئای مەتنان مییان دە ئامەیا ڤەلاکەردش: ”زەمانێ ڤەریێ یەو (یاو) مێردە و جێنیای (جێنا) خۆە بی، یەو (یاو) کەینا و یەو لاج تەرا بی. جەنییا ئەیی مەردە، پەینیدە مێردە شی یەونا جێنی ئاردە. د سەڕی ڤینەرت، یەو کەینا ئایا جێنی را بی. ئەنا جێنی بییە دشمەنێ لاجەک و کەینەکا ڤەرییێنە.

کەینەکە شوەنا گۆلکان دا؛ کەینەکە رۆجێکی یەرەیی گۆلکانا یەنا، ئەک برایێ خۆە چنو، پەرسێنا جێنییای باووکی خۆە، ڤانا ک: برایێ م چا یۆ؟ جەنێکە کەینەک را ڤانا ک: برایێ توە شیو کەی خالانێ خۆە. کەینەک ئایا شو را کووەنا، هاو(هاون) ڤەیێنەنا، ئەک برایێ خۆە کشتو، ئەشتو زیندان. سباه واردەنا، باوکێ خۆە را ڤانا: باوۆ م ئەمشەوە یەو هەون دی، ئەک جەنییای توە (تۆ) براییێ م کشتۆ، ئەیشتۆ زیندان. باوکێ کەینەکە خۆە را ڤا ک: خێر بۆ، سەنی برایێ توە (تۆ) کشێنۆ؟

کەینەک ڤا ک: باو(باوۆ)، م هاونێ (هاوونێ) خۆە دا دی، برایێ م کشتۆ، ئەیشتو زیندان، ئەز ها وارزەنوا، شوەنا گۆلکان دا، یەرەی یەنا کەییە، ئەکە برایێ م ئامەو (ئامەوۆ)، ئەز زاما وەشو، خەیر کە برایێ م نیامەوو ئەز هێنی توەری گۆلکاندە نیشوێنا، ئەز ئەتییا نیڤندەنا.

باوکێ کەینەکە خۆە را ڤا ک: ئەورو ت شوە گۆلکاندە، ئەز گێرەنا، ئەکە م برای توە دی، بزان ک: ئەک جەنیا م شما دە ساخە نا، خەیر ک م برای تووە نێدی، نە ئەز ڤندەنا نە ت ڤوندە.“

Lerch, Peter J. A.: Forschungen über die kurden und die iranischen Nordchaldar. r. 80-81. Band I St. Petersburg 1857

٤٣ مەلا ئەحمەدێ خاسی، د سالا ١٨٦٧–٦٨ان دە ل گوندێ هەزانا ب گرێدایی قەزا لجێ ژ دایک بوویە و د ١٨ێ سالا ١٩٥١ان دا کۆچا داوی کرییە. مهانی، مەولوودا ئەحمەدێ خاسی ژ تیپێن ئارامی وەرگەراندییە تیپێن لاتینی و ب تەڤی هەلبەستەکە وییا کورمانجی و یەکا ترکی، سالا ١٩٩٤ان د چاپخانەیا فراتێ دە ژ نوو ڤە دایە چاپکرن.

44 Mela Ehmedê Xasî, Mewlûdê Nebî, açarnayişê Mihanî, Weşanên Firat, 1994-Îstenbul

45 Çimeyo corên, r. 7

46 Mela Ehmedê Xasî, Mewlûdê Nebî, açarnayişê Mihanî, Weşanên Firat, 1994-Îstenbul

47 Celadet Alî Bedir-Xan, Hawar, hej. 23, r. 604, Weşanê Nûdem, Stocholm-1998

48 Celadet Alî Bedir-Xan, Hawar, hej. 23, r. 605, çapakerdişê weşanê Nûdem, Stocholm-1998

49 Mutlu Can, Bîblîyografya Kirmanckî (Zazakî) 1963-2017, Weşanxaneyê Vateyî, 2018

# مزگەوت و
## کارەکتەرەکانی لە ڕۆمانی کوردیدا



**د.عەبدوڵڵا ڕەحمان**
بەشی زمانی کوردی، کۆلێژی پەروەردە / زانکۆی سەلاحەدین

دامەزراوە ئاینییەکان پێگەیەکی دیار و بەرچاویان لە ژیان تاک و کۆمەڵگەدا هەیە و بەهۆیەوە بنیادی کۆمەڵگە بەهۆی ڕایەڵەی گرینگی ڕۆشنبیری ئایینی ڕێکدەخرێت، چونکە ئایین چەقی کۆکردنەوەی مرۆڤەکانە. لەهەمانکاتیشدا بایەخی ئەو پەیوەندییە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە هیچ خەسڵەت و سیمایەکی چینایەتی لەخۆی ناگرێت و لەکاتی بەجێگەیاندنی ڕێوشوێنە ئاینییەکانەوە جیاوازی چینایەتی هیچ پێگەیەکی نابێت، ئەمەش وا گیانی تەبایی و یەکسانی و برایەتی لە نێوان مرۆڤەکان بەهێز دەکات. بەهۆی ئەمەشەوە دەزگا ئایینییەکان کاریگەری ڕاستەوخۆیان لەسەر لایەنی پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی و دەروونی مرۆڤەکان هەیە. لەمبارەیەوە کۆمەڵناسی فەرەنسی (دورکهایم) بۆچوونی وایە کە ((بەتەنیا دامودەزگا ئاینییەکان توانای یەکخستنی مرۆڤیان لەڕووی هەست و سۆزەوە هەیە)) (ناجم مولای، ٢٠١١:١)، بەم پێیەش دامەزراراوە ئاینییەکان بەشێک لە پێوانە و ڕۆڵێکی ڕێکخراو پێکدەهێنن لە هەست و خولیا و ئارەزووەکانی مرۆڤ بۆ گەڕان بەدوای نهێنییەکانی ژیان و مردن. بێگومان ((ئایینی هەر کۆمەڵگەیەک بەشێکی گەورە لە شێوەی بیرکردنەوە و بۆچوونەکان لەلای خەڵکی ئەو کۆمەڵگایە دروست دەکات، کاریگەریشی لەسەر ڕەفتار و ئەخلاقی تاکەکانی و دیاریکردنی سنووری پەیوەندی نێوانیان ....هەیە)) (د.عبدالله خورشید، ٢٠١١:٢٨٢)، بەو واتایەی دەزگا ئاینییەکان لەکاتێکدا بایەخ بە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی و ئابووری مرۆڤ لە ژیان دەدەن و هەوڵی پێگەیاندنی مرۆڤ دەدەن، لەهەمانکاتیشدا بایەخ بەدوای ئەو ژیانە و دنیای ئەو دیویش دەدەن، ئەمەش وایکردووە ڕۆڵێکی گەورە و پیرۆزکراوی لە ژیانی مرۆڤایەتی بگێڕێت، لەبەر ئەم ڕۆڵە کاریگەرە پەیوەندییەکی پتەویشی بە ئەدەبەوە هەیە و باسکردنی ئایین و دامودەزگا ئاینییەکان لەناو دەقە ئەدەبییەکاندا مەسەلەیەکی هەستیار و دژوارە، بەتایبەتیش لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا، ئەمەش بۆ ئەو پێگە گەورە و مەزنەی ئایین دەگەڕێتەوە لە گشت بوارەکانی کۆمەڵگەدا هەیە. بۆیە باسکردنی ئایین و بەتایبەتیش ڕەخنەلێگرتن و دەستنیشانکردنی کەموکوڕییەکانی بەیەکێک لە بابەتە باسنەکراو و قەدەغە و تابۆکانی ئەدەب لەقەڵەم دەدرێت. لەم ڕوانگەشەوە ڕۆمان بەحوکمی ئەوەی هونەری گێڕانەوەی ژیانە، لەژێر کاریگەرییەکانی ئایینیدا ڕۆڵێکی دیار و بەرچاوی هەیە لە باسکردنی ئەو تابلۆیە ئایینییەدا، لەمەشدا ڕۆماننووس پێویستی بە بوێرییەکی گەورە هەیە، بەشێوەیەک کە ((بەرهەمی ئەدەبی مەترسی و بوێری لەوکاتەدا زیاتر دەبێت، کە بابەتی باسکراوی ئایین بێت، ئەوکات دوو گوتاری ئایینی و ئەدەبی دروست دەبێت، یەکەمیان بەشێوەیەگی گشتی پشت بە شێوازی ڕاستەوخۆ دەبەستێت، ئەوی دیکەشیان لەوانەیە ڕاستەوخۆ بێت، بەڵام شیمانەی بەرەمزبوونی زیاتری لێ دەکرێت. بۆیە هەر ڕۆمانێکی لەم شێوەیە خاوەنی ڕوانینێکی بوێرانەی هەیە و پیرۆزییەکەی وایلێکردووە

دووباره ئایین بنووسێتەوە و شیبکاتەوە، تەنانەت لای هەندێکیشیان گەیشتۆتە ڕادەی گومانکردن لێی)) (أ. روایە رحابلی، ٢٠١٥:٦٠).

جیا لەمانەش ڕۆماننووس لەڕووی تەکنیکی ڕۆمانەوە وەکو شوێنێک سوود لە دامودەزگا ئایینییەکان وەردەگرێت و بەکاریان دەهێنێت. ئەمە سەرەڕای ئەوەی سوود لە کارەکتەرەکانی ناو ئەو دامودەزگا ئایینیانە وەردەگرێت و لەناو دەقدا ڕۆڵی دیاریکراو و ئامانجداریان پێ دەسپێرێت، لەوانەش پیاوانی ئایینی کە ڕەنگە بەهۆی ئەو ڕۆڵ گێڕانەشەوە ڕۆماننووس ڕەخنەیان ئاڕاستە بکات و کەموکوڕییەکانیان دەستنیشان بکات. لێرەدا ئاماژە بەو دامودەزگا ئایینیانە دەدەین کە لەو ماوەیەدا لە ڕۆماندا ڕەنگیان داوەتەوە:

مزگەوت وەکو دامەزراوەیەکی ئایینی ڕۆڵێکی گرنگی لە ژیانی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و ئابووری کۆمەڵگەی کوردی گێڕاوە، بەتایبەتیش کە مزگەوت لە ئایینی ئیسلامدا بە شوێنێکی پیرۆز و بنچینە و بناغەی ئایینەکە لەقەڵەم دەدرێت. (مەلا)ش وەکو وتارخوێن و پێشنوێژی مزگەوت، کارەکتەرێکی گرنگی ناو کۆمەڵگە بووە و پێگە و پایەکی سیاسیی و کۆمەڵایەتی گەورەی هەبووە. لەم ڕوانگەیەوە مزگەوت لە کۆمەڵگەدا ڕۆڵی ئایینی خۆی لە ڕێنمایی و ئاڕاستەکردنی ژیان و گوزەرانی خەڵکی گێڕاوە و هەمیشە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر تاکەکانی کۆمەڵگە و لایەنەکانی ژیاری هەبووە، چونکە تەنیا شوێنی خواپەرستی نەبووە، بەڵکو ڕۆڵێکی گەورەی کۆمەڵایەتیشی هەبووە لە کۆکردنەوەی خەڵک و دروستکردنی پەیوەندی و کارلێکی کۆمەڵایەتی، بەمەش بەشدارییەکی کارای لە بەستەرەکانی ناو کۆمەڵگەدا دەبێت.

لە کۆمەڵگەی گوندنشیندا (مزگەوت) پێگەیەکی گرنگی هەیە و تاکە دەزگا و گرووپی دامەزراوەییە کە هەمیشە و لە هەموو بارودۆخێکدا لەناو گوند هەبووە. بەو واتایەی ڕەنگە دەزگا و دامەزراوەی وەک قوتابخانە و بنکەی تەندروستی و بنکەی پۆلیس و... لە هەموو گوندێکدا نەبووبێت، بەڵام بەحوکمی ئەوەی کۆمەڵگەی کوردی زۆرینەی مسوڵمانە و بۆ ئەنجامدانی ڕێوشوێنە ئایینییەکانیان مزگەوت بوونێکی هەمیشە پێویست بووە، بۆیە مزگەوت وەکو دامەزراوەیەکی گرنگ ئامادەیی هەبووە، بەشێوەیەک ئەگەر لەلایەن دەوڵەتەوەش بینایەکەی دروست نەکرابا، ئەوا گەلێک جاران لەلایەن خەڵکی گوندەوە بەکاری هەرەوەزی بینایەکەی دروستکراوە، سەرەڕای ئەوەش خەڵکی گوند و بەتایبەتیش پیاوماقووڵ و ڕیش سپییانی مشوری هێنانی مەلایان خواردووە و ساڵانەش زەکات و سەدەقە و سەرفیترەیان بە مەلا داوە، بۆئەوەی لەڕووی ئابوورییەوە پێداویستییەکانی دابین بکات، بۆیە دەبینین خانەوادەی مەلا تاڕادەیەک خۆشگوزەران ژیاون و خودی مەلاش تەنیا خەریکی بەجێهێنانی کاری ئایینی بووە و هیچ کارێکی دیکەی نەکردووە.

لە ڕۆمانی (ژانی گەل)ی (ئیبراهیم ئەحمەد)دا لە تیشک خستنە سەر ڕووداوی خۆپیشاندانەکەی (٢٥)تشریندا لە گۆشەیەکدا ئاماژە بە مزگەوتی شار دەکات، بەتایبەتیش کاتێک دەسەڵات بە زمانی گوللە وەڵامی خۆپیشاندەران دەداتەوە. کارەکتەری سەرەکی ڕۆمانەکەش کە (جوامێر)ە بەناچاری لەگەڵ ئەو خۆپیشاندانەدا تێکەڵ بووە و هەوڵی ئەوە دەدات خۆی لە دەستدرێژی گوللە بپارێزێت، بۆیە لەکاتی جێگۆڕکێیەکانی بۆ خۆحەشاردان لە دەستدرێژی گوللە تێبینی ئەوە دەکات کە ((ژەندرمەیەکی تر لە پەنا کۆمەڵێک گونیە کە لەسەربانی مزگەوتی بەرامبەر بە کتێبخانەکە ڕیزکرابوو ملەقوتێی بۆ ئەکات)) (ژانی گەل :١٦). دیارە مزگەوت پیرۆزییەکی ڕەهای هەیە لە کۆمەڵگەی مسوڵماندا، سەرەڕای ئەمەش نابێت لە هیچ بار و زوورفێکدا حەرەمی پەرستگاکان پێشێل بکرێن، بەڵکو پەرستگاکان لە هەموو بارودۆخێکدا دەبێت پارێزراو بن و جێگەیان لەناو کۆمەڵگەدا دیار بێت و لە شەڕ و جەنگ و توندوتیژی بەدوور بێت، کەچی لەم دیمەنەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە دەسەڵات فەرامۆشی ئەو بنەمایانەی کردووە و حەرەمی مزگەوتەکانی شکاندووە و سەربازی لە سەربانی ئەو مزگەوتە داناوە بۆ دستدرێژیکردنە سەر خەڵکی سڤیل و خۆپیشاندەر. ئەمەش جگە لەوەی لەرووی ئاینییەوە ڕەتدەکرێتەوە و لەڕووی مرۆڤایەتیشەوە جێگەی قبوڵ کردن نییە و بەشێکە لە تاوان.

هەروەها لە دیمەنێکی دیکەدا ڕۆماننووس سوودی لە پێگەی مزگەوت وەرگرتووە و لەگەڵ ڕەوتی ڕووداوەکاندا تێکەڵیکردووە، بەتایبەتیش ڕۆڵی مزگەوت لە کۆمەڵگەی گوندنشینیدا، کە ڕۆڵی کارایە و هەمیشە مزگەوت شوێنی کۆبوونەوەی خەڵکی گوند بووە و جێگەی مشتومڕ و گفتوگۆیەکانی بووە، جیا لەمەش هەرکەسێکی بێگانە ڕووی لە گوند کردبێت، یەکراست بەرەو مزگەوتی گوندەکە چووە، ئەوەتا (جوامێر) کاتێک بەدوای خێزانەکەیدا لە ڕێگادا لە یەکێک لەو گوندانەی کە هێشتا وێران نەکراوە لادەدات، ئەمە ئەوە نیشان دەدات کە مزگەوت لە کۆمەڵگەی گوندنشینی جگەلەوەی دەزگایەکی ئاینییە، لەهەمانکاتدا دەزگایەکی کۆمەڵایەتیشە و بێگانە و ڕێبوار لەوێ پشوو دەدەن و ئەگەر شەویشیان بەسەردا بێت لەوێ دەمێننەوە، بۆیە (جوامێر)یش لەو مزگەوتەدا بۆ حەسانەوە دەمێنێتەوە. لێرەشدا مزگەوت جیالەوەی کە بەشداری لە ڕووداوەکان کردووە، لەهەمانکاتیشدا لەلایەن ڕۆماننوسەوە ڕەخنە ئاڕاستەی ئەو کەسە دیندارانە کراوە کە لە مزگەوتەکەدا بوون، ئەویش لەو دیمەنەدا بەدی دەکرێت کە کارەکتەرێکی ئایيندار ڕووی تێ دەکات ((کابرایەکی نوێژکەر هات بەلایەوە، وادیار بوو تینووی قسە و دەنگوباس بوو، بەڵام جوامێر ئەوەندە بەساردی وەڵامیدایەوە زاتی هەڵترووشکانی نەبوو، هەر بە پێوە یەک دوو پرسیارێکی تێگرت و لێی دا چووەوە بەلای بەرماڵ و نوێژ و هاونوێژەکانی خۆیەوە و کەوتنە تەنووری قسەداخستن و ئاشی خەیاڵ خستنەگەڕ،

جوامێریش لە پێشەوە گوێی بۆ هەڵخستن، بەڵام لە پاش نەختێ تاقەتی لێیان چوو، سەرێکی لبادەکەی ژێری پێچا لە پێڵاوەکانییەوە و سەری خستە سەر و لێ پاڵکەوت)) (ژانی گەل : ١٣٩-١٤٠).

ڕۆماننوس وێنای ئەو کەسە نوێژکەرانە وادەکات کە هێشتا لەگەڵ واقیعی کۆمەڵەکەیان نایەنەوە کە ژێردەستە و داگیرکراوە و کەوتۆتە بەر زوڵم و زۆرداری دوژمن، بەڵکو ئەوان هەر خەریکی ئاشی خەیاڵ خستنەگەڕن و بۆیەش کاتێک (جوامێر) لەناو ئەو هەموو وێرانی و ئێش و ئازارەوە گوێیان بۆ شل دەکات، تاقەتی لێیان دەبڕێت. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە پێویستە کەسانی ئایینی لەگەڵ واقیعی کۆمەڵگەکەی خۆیان بڕۆن و ئاگایان لە ئێش و ئازاری تاکەکانی کۆمەڵگەکەیان بێت، نەک دوای خەیاڵ و خورافیات بکەون.

> **مزگەوت وەکو دامەزراوەیەکی ئایینی ڕۆڵێکی گرنگی لە ژیانی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و ئابووری کۆمەڵگەی کوردی گێڕاوە.**

لە ڕۆمانی (هەرەس)ی (محەمەد موکری)دا، مزگەوت وەکو دەزگایەکی گرینگی کۆمەڵگە ئاوڕێکی بەرچاوی لێ داوەتەوە، سەرەڕای ئەمەش پیاوی ئایینی وەکو کارەکتەرێک بوونیان لەناو ڕووداوەکاندا هەیە و بەشدارییان لە چنینی ڕووداوە سەرەکییەکە کردووە، بەهۆی ئەمەشەوە ڕۆماننوس ڕاوبۆچوونی لەسەر بیروڕای ئایینی و هەڵسوکەوتی پیاوانی ئایینی دەربڕیوە. لەم ڕووەوە لەناو دەقەکەدا باس لە پێگە و جێگەی مزگەوت کراوە و ڕۆڵی لە ژیانی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابووریدا بەرچاو خراوە. لە سەرەتای ڕووداوەکاندا ڕۆماننوس ڕۆڵی مزگەوت لە کۆمەڵگەی گوندنشینی بەدیار دەخات و ئاماژە بەو مزگەوتە دەدات کە لە گوندەکەی (حەمە)ی کارەکتەر دایە ((مزگەوتەکە خۆی بۆخۆی مێژوویێک بوو، گەورە و بچووکی ئەو هەرێمە دەماودەم و پشتاوپشت دەیانگێڕایەوە گوایە (سەی پیرخدر) چەند ساڵێ لەمەوبەر، پاش ئاوارەیی لەو دێیەدا نیشتەجێ دەبێ و مزگەوتێ دروست دەکات، لەکاتی دارەڕاکردندا سەی پیرخدر و کوڕەکەی دەبینن دارەکان کورتن، یەک دوو جار باوک بە کوڕ دەڵێت: ئاسنگەر دەتوانێ ئاسن درێژ کاتەوە، ئێمە ناتوانین ئەم دارانە درێژ کەینەوە.... دەی بابەگیان ئەو سەری دارەکەم لەگەڵدا بگرەو ناوی خوای لێ بێنە. بەجۆرێ دارەکان درێژ دەبنەوە لەدارە ڕاکردندا، گەزێ لەمسەر

و گەزێ لەوسەر زیاد دەکەن، لەکارەکەیان دەبنەوە)) (هەرەس :٢٣) لێرەدا ئەفسانە بۆ پیرۆزکردنی زیاتری مزگەوتەکە بەکارهێنراوە، دیارە ئەو ئەفسانەکردنەی مزگەوت بووە بەهۆکاری ئەوەی کە ناوبانگی زیاتر بەدەستبهێنێت، لێرەدا جیا لەوەی مزگەوت شوێنێکی پیرۆزی لە دڵ و دەروونی خەڵکەکە پێکهێناوە، بەهۆی ئەم ئەفسانەیەشەوە بووە بە نەزرگا و خەڵکی دەوروبەر سەردانیان کردووە، واتە جیا لەو ئەرکانەی کە مزگەوت وەکو دەزگایەک لەناو گوند دەیگێڕێت، ئەرکی نەزرگا و بەجێهێنانی داوای ئەو خەڵکانەی کە سەردانی دەکەن، بۆ زیاد دەبێت.

بێگومان مزگەوت وەکو دەزگایەکی ئایینی لەناو گوند جیا لە ئەنجامدانی ڕێوشوێنەکانی ئایینی، گەنجەکانیش کاتەکانی خۆیان لە بەردەرگا و دیوارەکانی بەسەردەبرد و لەوێ بە قسەوباس و ئاڵوگۆڕی هەواڵ دانیشتنەکانیان گەرم دەکرد،. سەرەڕای دەرخستنی پێگەی مزگەوت لە کۆمەڵگەی گوندنیشندا، ڕۆماننووس پێگەکەی لە کۆمەڵگەی شارنشینیدا باسکردووە، ئەمەش کاتێک کە (سمایل) لەدوای ئاوارەبوونیان لەگەڵ (حەمە)ی برای دووچاری ناکۆکی دەبێتەوە و بەوهۆیەش (حەمە) و خانەوادەکەی بەدزییەوە جێی دەهێڵن و بەتەنیا دەمێنێتەوە، گەلێک غەمبار دەبێت و بەدوایاندا دەگەڕێت، یەکێک لەو شوێنانەی کە بەلایەوە زۆر گرنگە پرسیار و سۆراخیان لێ بکات، مزگەوتە، چونکە لەناو شارەکانیشدا شوێنی کۆبوونەوەی خەڵکە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ڕەنگە کەسێکی نامۆ و ئاوارە لەو مزگەوتانە بەشێوەیەکی کاتی نیشتەجێ ببن. بۆیە (سمایل) لە مزگەوتەکانی شاردا بەدوایاندا دەگەڕێت، لێرەشدا ڕۆڵی گرنگی مزگەوت لە شاردا بەدیار خراوە، بەوپێیەی کە شوێنی کۆبوونەوەیە بۆ نوێژکردن و ئەنجامدانی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان. هەروەها لەم ڕۆمانەدا ڕۆڵی مزگەوت لە شۆڕشەکانی کورددا خراوەتەڕوو، بەتایبەتیش لە شۆڕشی ئەیلوولدا، ئەوەتا کاتێک ئەو شۆڕشە چەخماخەی دەدا، مزگەوتەکان ئەو شوێنانە بوون کە هەمیشە دەنگوباس و هەواڵەکانی شۆڕش و پێشمەرگەی تێدا باس کراوە و ئاڵوگۆڕی بیروڕای لەبارەی شۆڕشەوە لێکراوە، لەگەڵ یەکەم تەقەی شۆڕشیشدا مزگەوت ڕۆڵی گەورەی لە بڵاوکردنەوەی سەرهەڵدانی ئەو شۆڕشە هەبووە، ڕۆماننووس لەمبارەیەوە باس لە شاری کەرکووک دەکات کە لەوێ مزگەوت ڕۆڵی لە بڵاوکردنەوەی تەقەی یەکەمی شۆڕشە دەبێت، ئەمەش بەهۆی کارەکتەری سەرەکی ڕۆمانەکە (ئەحمەد) کە بەهۆی گەڕانەوەی یادەوەرییەکانی ئەو ڕۆژەوە، باسی لەو شۆڕشە دەکرد ((بەرەو چواردەساڵی ڕەبەقی بەر لە ئێستای چوو، بەرەو ئەو ڕۆژە مەزنەی ئەیلوولی ١٩٦١) گەڕایەوە کە: بەشێکی تەواوی کوردەکانی کەرکووک تووشی شاگەشکە ببوون، لە هەموو کوچە و ماڵێکدا لە هەموو چایخانە و مزگەوتێکدا، یەکەم تەقەی (دەربەندی بازیان) سەرباسی ئاخاوتن و پلیتەی ناخ تەقاندن بوو)) (هەرەس :١٩٥). هەر لەم شۆڕشەدا

مزگەوتی گوندەکان ئەو شوێنانە بوون کە باوەشیان بۆ پێشمەرگەکان کردبۆوە و وەک بارەگایەکی ئەوان وابوون.

ڕۆماننووس لە چەند دیمەنێکدا ڕۆڵی ئەرێنییانەی (مەلا) لەناو کۆمەڵگەدا دەخاتەڕوو کە خاوەن هەڵوێست و کاروکردەوەی خۆیان بوون و لەپێناو  سەرکەوتنی حەق و خۆشنوودی مرۆڤ تێکۆشاون. لە دیمەنێکدا  ئاماژە بەو خۆپیشاندانە دەکات کە لە (گاورباغی) شاری کەرکووکدا بەبۆنەی ساڵیادای شۆڕشی (١٤)ی تەموزەوە بەڕێوەچوو، تێیدا پیاوانی ئاینیش لەتەک چین و توێژەکانی دیکەدا بەشدارییان کرد  ((لە پێشدا مەلا و پیاوە ئاینییەکان و قەشە بەرگ ڕەشەکان، لێپرسراوانی شار لە پێشەوەی ڕیزەکەدا وەستابوون. پاش ڕیزی مەلا و قەشەکان ڕیزی ئافرەتان و کچان بوو بەهەمان جۆر دروشمی ڕەنگاوڕەنگیان  پێ بوو، پاشان ڕیزی کرێکار و جوتیار و کاسبکار و قوتابی..)) (هەرەس : ١٦٤-١٦٥). ئەمەش ڕۆڵی (مەلا) لە بەشداربوون لە چالاکییە کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکانی ناو کۆمەڵگە نیشان دەدات. هەروەها لە هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلوولدا، ڕۆڵی (مەلا) وەکو پیاوی ئایینی ناو کۆمەڵگە گرنگ بووە، بەتایبەتیش بۆ ڕەواندنەوەی ئەو ڕەشبینییەی کە خەڵکەکە دووچاری ببوو، بۆیە لە دیمەنێکدا کاتێک (خەجێ) بە ئوتومبێلێکی نەفەرهەڵگرەوە بەرەو (حاجی ئۆمەران)ی سەرسنوور بۆ زانینی هەواڵی (ئەحمەد)ی کوڕی، بەڕێ دەکەوێت، یەکێک لە سەرنیشنەکان (مەلا)یە. بۆیە لەکاتی گفتوگۆکردنی سەرنشینەکان و باسکردنی هۆکارەکانی هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلوول دەبێتە سەرباسەکەیان و تێیدا گەلێک کەموکوڕیی و خەوشی بەرپرسەکانی ئەو شۆڕشە باس دەکەن، لەڕێگەی ئەو (مەلا)یەوە گەلێک لایەنی باسەکەیان بۆ ڕوون دەکرێتەوە. کاتێک باس لە دزینی ماڵی شۆڕش لەلایەن بەشێک لە بەرپرسەکان و پێشمەرگانەوە، مەلا هەڵوێستی خۆی لەمبارەیەوە ئاشکرا دەکات ((مەلا پێیوابوو، ئیدی نابێ بێدەنگ بێ، بەکرخە کرخەوە دەستی بە قسان کرد: یاخوا چ کەسێ ماڵی حەرامی بەنسیب نەبێ. گەنجەکە ڕووی لە مەلا کرد و پێی وت: مامۆستا ئەو پارەیە ماڵی حەرام نییە.. دیارە جەنابتان نازانن کێ ناردبووی. مەلا، قسەی گەنجەکەی پێ ناخۆش بوو، دانی بەخۆداگرت، پێی وت: کوڕی خۆم من حەقم بەسەر ئەوەوە نییە کێ ناردوویەتی، ئەمریکایە، جولەکەیە، شەیتانە، من ئەمانە نازانم، هەرکەسێ ناردوویەتی کەیفی خۆیەتی، بەڵام پارەیێک بە ئارەقی ناوچەوان پەیدا نەکرێ حەرامە!.... نیمچە وەعزێکی بۆ دان، کۆتایی وەعزەکەیشی بەوە هێنا: خوا چ قەومێک چاک ناکاتەوە تا خۆیان چاک نەکەن، بەڵێ فەرموودەی خوایە...خوایش ئەمری وابووە کە وای لێ بێ)) (هەرەس :٣٨٢). لێرەدا ڕۆڵی (مەلا) ئەرێنییە و زیاتر ڕوونکردنەوەی لایەنە ئایینییەکانە کە ئەرکی سەرشانییەتی، پاشان لە دیمەنێکی گفتوگۆکانیدا (مەلا) ڕای وایە پێویستە مرۆڤ لە بەردەم کێشەکاندا

و بەتایبەتیش ئەو هەرەسهێنانەدا سوپاسی خوا بکات، چونکە هەموو شتێک بە فەرمانی ئەوە بووە. ئەمەش جۆرێکە لە قەناعەت دروستکردن، ئەو قەناعەتیش ئەگەر دروست بوو، ئەوا لەڕووی دەروونییەوە کاریگەری لەسەر کەسەکە دەبێت و بەرچاوی ڕوونتر دەکاتەوە و دەتوانێت هەنگاوی نوێ بهاوێت.

لە ڕۆمانی (شار)ی (حوسێن عارف)دا، مزگەوت ڕۆڵی دیاری لەناو کۆمەڵگەدا بەرچاوخراوە، لەگەڵ ئەویشدا پێگەی مەلا وەکو پیاوێکی ئایینی شەن و کەو کراوە و لەو گۆشەنیگایەوە ڕۆماننووس ڕەخنەی لێگرتوون، بەتایبەتیش لە باسکردنی کەسایەتی (دەروێش کەریم)دا ڕەخنەیەکی توندی لە کاروکردەوەی کۆمەڵایەتی دەروێشەکان گرتووە. لە دیمەنێکدا کاتێک باس لە دۆزینەوەی مەلۆتکەیەکی سەربڕاو دەکەن و تۆمەتەکەی دەخەنە ئەستۆی دایکی، لە گفتوگۆی نێوان (خورشید و ئەوڕەحمان و حەمەشین)دا لە چایخانەدا ئەوە دەخرێتەڕوو، کە دایکی ناتوانێت ئەو کارە بکات، بەڵکو لە بەردەم مزگەوتێکدا دایدەنا و دەڕۆیشت، ئەم دیمەنە ڕۆڵی گەورەی مزگەوت لە کێشە و گرفتە کۆمەڵایەتییەکان دیاری دەکات. هەروەها لەو کاتەی کە تەرمی (شێخ  مەحمود) هاتووەتەوە شاری سلێمانی، مزگەوتی گەورە ئەو شوێنە دەبێت کە دیاریکراوە بۆ ئەوەی ڕێوڕەسمی ناشتنەکەی تێدا  ئەنجام بدرێت، بەڵام لە ترسی خۆپیشاندانی خەڵک، حکومەت هەر شەوەکەی تەرمەکەی ناشتبوو ((خەڵکێکی زۆر بەنیازی بەشداریکردنن لە ناشتنی تەرمی شێخدا بەرودوا ڕوویان کردە بەر مزگەوتی گەورە، بەڵام هەرچی دەگەیشت، یەکسەر دەیزانی کە هەر شەوێ نێژراوە و دەگەڕایەوە)) (شار :٢٢٥). لەهەمانکاتیشدا ڕووناکی خراوەتە سەر ڕۆڵی مەلا، بەوپێیەی کە پیاوی ئایینییە و کاریگەرییەکی گەورەی لە ڕەوشی ژیانی کۆمەڵگەدا هەیە، بۆیە ئەو ڕۆڵەی مەلا کاتێک بەرچاو دەکەوێت، کە (حەمە عەلی)ی کارەکتەر، کە لە دوای مردنی (میمکە حەلیم)ەوە لەسەر چارەنووسی ئەو خانووەی کە تێیدا کرێچینە، پرس و ڕای بە گەلێک چین و توێژ و فەرمانگە حکومییەکان دەکات، لەوانەش مەلای مزگەوتەکەی گەڕەکەیان ((حەمەعەلی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ پیشەی پرسیار و ڕاوێژکردن بوو، هەر لە برادەر و ناسیاو و مەلای مزگەوتەکەی نزیکیانەوە بیگرە، تا دایەرەی تاپۆ و دادگە و شارەوانی باسەکەی هێندە دووبارە کردبووەوە کە دەتوت نووسراوێک لەبەر دەخوێنێتەوە)) (شار :٤٦). لێرەشدا  ڕۆڵی گرنگی مەلا لە کێشە و گرفتە کۆمەڵایەتییەکان بەدیار دەکەوێت کە بەهۆیانەوە بەشێک لە چارەسەرکردن بۆ ئەو کێشانە کراون.

لەدیمەنێکی دیکەشدا ڕۆڵی مەلا لەو مارەیی کردنە بەدیار دەکەوێت کە (وەستا تایەر) بەهۆی ڕەتکردنەوەی داخوازییەکەی، لەگەڵ ئەو کچەی کە پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵدا هەبووە، کە بەناچاری ڕەدووکەوتووە و ئەویش خۆیی و خانەوادەکەی کۆچیان

کردووە و هاتوونەتە باشووری کوردستانەوە ((هێندەمان پارە بێ بوو کە تا لە شوێنێک دەگیرسێینەوە، خەمم نەبێ، کچەیە و لای یەکەم مەلا کە تووشی هاتین، کردمە حەڵاڵی خۆم، دایکە و برایە هیچ گلەییەکیان لێم نییە)) (شار :١٤١). لێرەشدا ڕۆڵی مەلا لە گەیشتنی دوو دڵدار بەیەکتر بەدیار دەکەوێت، کە ڕۆڵێکی ئەرێنییە و لەپێناو خۆشنودی مرۆڤدایە. لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆماننووس گلەیی و ڕەخنە ئاڕاستەی مەلا و دەروێش دەکات، کە بەهۆی ئەو کردار و ڕەفتارانەیانەوە کێشە و گرفتی کۆمەڵایەتی هاتووەتە ئاراوە، ئەوەتا باس لەو کۆڵکە مەلایە دەکات کە بێ هەستکردن بە لێپرسراوێتی کچێکی بێ باوکی تەمەن منداڵ لە (دەروێش کەریم) کە بەتەمەن زۆر لەو گەورترە، مارە دەکات ((پیرێژن...... هەستی بە ماندووبوونێکی زۆر دەکرد، دەروێش ئەو ڕۆژە، گەلێ ڕاکەڕاکەی پێ کردبوون، تا لە ئەنجامدا گەیاندبوونییە لای کۆڵکە مەلایەک و کارەکەی ساز دابوو)) (شار :٩٩)، لێرەدا لەلایەکەوە ڕەخنە لەو مەلایە گیراوە کە بێ ئەوەی لە مەسەلەکە بکۆڵێتەوە و بەبێ ئەوەی ڕەچاوی باری تەمەنی نێوانیان بکات، ئەو کارەی ئەنجامداوە کە وەکو تاوانێک وایە، چونکە بەشێکی لەو تاوانە بەرپرسیارییەتەکەی دەکەوێتە ئەستۆی مەلاوە. لەلایەکی دیکەشەوە ڕۆشنایی خراوەتە سەر کردار و ڕەفتارەکانی (دەروێش کەریم) و بەهۆیەوە ڕەخنە لە کاری دەروێشایەتی گیراوە. بەتایبەتیش بەهۆی گواستنەوەی کچی منداڵکارەوە. جیا لەمانەش ئەو هەڵسوکەوتانەی لەگەڵ ئەو کچە تەمەن منداڵانە دەکرد لە بەزۆر سێکس کردن و لێدان و ئەشکەنجە و بەستنەوەیان و بەکەم سەیرکردنیان و هەروەها ئەو هەڵسوکەوتەی لەگەڵ (خورشە)ی خوشکیدا کە بووە هۆکاری تەڵاقدانی، لەلایەکەوە بەشێک بوو لە چەوساندنەوەی ئافرەت و لەلایەکی دیکەشەوە زوڵم و زۆرداریی بوو لە دژی مرۆڤانێک کە لەپێناو دەربازبوون لە هەژاریی و نەبوونی و برسێتییەوە پەنایان بۆ ئەو جۆرە کارانە بردبوو.

ئەمانەش هیچیان پەیوەندییان بە ئایینەوە نەبوو، کە ئەو وەکو دەروێشێک بەرگێکی ئایینی پۆشیبوو و بەهۆی پارەو فرت و فێڵەوە کارەکانی بۆ دەچووە سەر. ڕۆماننووس ئاماژە بە هێمایەکی دەروێشایەتی دەکات، کە بریتییە لە قژێکی درێژ، دیارە دەروێشەکان وەکو ناسنامەیەک بێت بۆیان قژێکی درێژ دەهێڵنەوە و کە بەهۆیەوە لەناو کۆمەڵگەدا دەناسرێنەوە. ئەم کاروکردەوانەی کە دەروێش کردوویەتی دوورە لە ئایین و زیاتر لەپێناو بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیدا بووە، جیا لەمەش لە شێوەی توندوتیژیی و زوڵم و زۆردارییەوە بووە و جۆرێک بووە لە غەدرکردن لە خەڵکی و بەتایبەتیش ئافرەتان بوونەتە قوربانی ئەو کاروکردەوانە، بۆیە ڕۆماننووس لەڕێگەی باسکردنی ئەو کارەکتەرەوە ڕەخنەیەکی توندی ئاڕاستەی ئەم جۆرە کارانە کردووە و ڕووی ناشیرینی پیشانداوە.

لە ڕۆمانی (توانەوە)ی (غەفور ساڵح عەبدوڵڵا)دا مزگەوت و کاروباری ئایینی بەشێک لە ڕووداوەکان پێکدەهێنێت و ڕۆڵی کارەکتەرەکان دیاری دەکات، بەتایبەتیش بەهۆی ئەو پرسەوە، ڕۆماننووس لەبارەی کۆمەڵێک بابەتی ئاینییەوە بیروڕای خۆی دەربڕیوە، لەوانەش بەکارهێنانی ئایین لەلایەن مەلاوە بۆ بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان، ئەوەتا لە دیمەنێکدا ئاماژە بەوە دەکات کاتێک ئاژەڵێک دیار نەدەبوو، پەنایان بۆ مەلا بردووەوە و ئەویش ئەوانی بە نوشتەکردنەوە هەڵخەڵەتاندووە، ئەمەش وەکو بیرەوەرییەکی منداڵی لەلایەن (قارەمان)ی کارەکتەری سەرەکی دەگێردرێتەوە ((منداڵ بووی، هەر کە ئاژەڵێکتان نادیار دەبوو، لە مێگەل نەدەهاتەوە خێرا داپیرەت خۆی دەگەیاندە مەلا شینە و دەمی گورگی لێ دەبەست، کەچی پاش یەک دوو ڕۆژ کەلاکی خوراوی ئاژەڵەکەیان دەدۆزیەوە، عەقڵیان ئەوەندە پێ دەشکێ)) (توانەوە :١١١).

لێرەدا بەشێوەیەکی گشتی ڕەخنە لە عەقڵی دواکەوتووی خەڵکی گوندنشین گیراوە، کە سەرەڕای ئەوەی ئاژەڵەکەشیان خوراوە، ئەوان هەر باوەڕیان بەو نوشتەیەی مەلا کردووە. هەروەها کاتێک باس لە پەیوەندی خۆشەویستی نێوان (قارەمان و هەتاو) دەکرێت، بەهۆی ژیانی نێوانیانەوە کە هەمیشە لە کوچە و کۆڵانەکانی ناو شاری کەرکوک بووە، ئاماژە بەوە دەکرێت کە چوونەتە ناو مزگەوتێکی شارەوە بەیەکەوە ئاویان خواردۆتەوە و بەهۆی ئەو دیمەنەشەوە ڕۆماننووس دیدوبۆچوونی مجێور و درویشەکان لە بەرانبەر خۆشەویستی و بەیەکەوەبوونی کچ و کوڕ لە دەرەوە دەردەبڕێت، کە بەچاوێکی خراپ و لە ئایین دەرچوونەوە لێیان ڕوانیوە. یاخود لە دیمەنێکی دیکەدا ئاماژە بەکاری خراپی دەروێش و مەلا کراوە کە چۆن ئاینیان بۆ مەرامە تایبەتییەکانی خۆیان بەکارهێناوە و لەم پێناوەشدا سڵیان لە هیچ کار و کردەوەیەک نەکردۆتەوە، ئەوەتا کاتێک (هەتاو)ی کارەکتەر (شاناز)ی کچە ئیفلیجبووەکەی بردۆتە لای ئەوان بەبێ ئەوەی هیچ زانستێکیان لەبارەیەوە هەبێت، خۆیان لەو کارە هەڵقورتاندووە. ئەو جۆرە کارانە بێگومان کاریگەرییان لەسەر ئاستی پێشکەوتنی کۆمەڵگە کردووە و زیاتر بەدواکەوتوویی هێشتوویانەتەوە، چونکە بەهۆی دواکەوتنی کۆمەڵگەوە، ئەو جۆرە کەسانە دەتوانن باشتر بەهۆی ئایینەوە سوودی تایبەتی خۆیان بەدی بهێنن.

دیارە ڕۆماننووس دژی ئەم جۆرە کارانەیە و دژی بەکارهێنانی ئایینە بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵک، لەکاتێکدا ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی ڕۆشنبیریی و هزری ئەو خەڵکەی کە باوەڕیان بەو جۆرە کارانەوە هەبووە، ئەوەتا ڕۆماننووس ڕاوبۆچوونی خەڵکی لەبارەی ئەو کەسانەی کە ئایین بۆ مەرامە کەسییەکانی خۆیان بەکاردەهێنن خستۆتە بەرچاو، ئەمەش لەبارەی ئەو کەسەیە کە لە گوندەکە خۆی بە سەید و پیاوچاک و مەلا ناساندووە ((خەوشە بە ژنێکی تری دەوت: ـ ئەڵێن دوێنێ شەو لە ئاسمان بەچاوی خۆیان دیویانە

ئەفرێ و لەگەڵ ئەستێرەکان قسەی دەکرد. ئەویتر دەیوت: ـ بەخوا خوشکم دەمخۆش ڕاست ئەکەی کێ ئەوێرێ خۆی لەقەرەی ئەو بدات مووی سەری با ئەیبا. پوورە خەوشە دەیوت: ـ هەر مەپرسە، سەیدێکی زۆر پڕە، هار و مار چاک ئەکاتەوە)) (توانەوە : ٢٨٠-٢٨١). دواتر کەسایەتی ڕاستەقینەی ئەو سەیدە ئاشکرا دەکرێت، کە کەسێک بووە دووچاری لادەری کۆمەڵایەتی بۆتەوە و سیخۆریش بووە، لەبەرئەوەش دواجار کوژراوە. هەروەها لە دیمەنێکی دیکەشدا ئاماژە بەو کەسانە دەکات کە دووچاری لادانی کۆمەڵایەتی بوونەتەوە و کاری دزی دەکەن، کەچی دواتر لە بەرگێکی ئاییندا ئەو مێژووەیان دەشارنەوە و تەنانەت ڕێنمایی خەڵکیش دەکەن ((هەشبوون تەنانەت بەرماڵی مزگەوتیان دەدزی، بە کەفل و کونێک بوونە پێغەمبەر ئاسا، ڕێگەی چاکەیان بە خەڵک نیشان دەدا)) (توانەوە: ٢٨٦). لێرەشدا ئایین کراوە بە بەرگێک و تاوانی دزیکردنی پێ شاردراوەتەوە، بەو واتایەی ئایین بۆ کارێکی دیکەی خراپتر لە دزیکردن بەکارهاتووە، چونکە خەڵکانێک بەهۆی ئەو کارە ئایینییەوە دووچاری هەڵخەڵەتاندن دەبن و گومڕا دەبن، ئەمەش لە کاری دزیکردنەکە خراپترە.

لەلایەکی دیکەوە لەناو دەقەکەدا مزگەوت وەکو شوێنێک بۆ ناونیشان بەکارهاتووە و بەهۆی ئەمەشەوە ناوی بەشێک لە مزگەوتەکانی شاری کەرکوک هێنراوە، لە دیمەنێکدا کاتێک باس لە پەیوەندی کردنی (قارەمان)ی کارەکتەری سەرەکی بە قوتابخانەوە دەکات، بەهۆیەوە باس لە گەڕان و سووڕانەکانی کارەکتەر بەناو شارەکەدا دەکات و ئاماژە بە مزگەوتی (بەرتەکیە) دەکات ((دەمەو نیوەڕۆ لەگەڵ هاوڕێکانت لە قوتابخانە بەرەڵا بوون، لەو قوتابخانەیەی کە ڕووی دەمی تائێستاش لەسەر جادەی سلێمانییە، بەرامبەر برە خانوو بەرەکەی گەڕەکی (بەرتەکیە)یە کە بەخۆی و منارە بەرزەکەی مزگەوتەکەیەوە، تائێستاش لە ناوەڕاستی ماڵەکان دەڕوانێتە هەموو شاری کەرکوک)) (توانەوە: ١٧٤). لێرەدا وەکو ناونیشانی شوێنێکی دیاریکراوی شاری کەرکوک کە گەڕەکی (بەرتەکیە)یە، ئاماژە بە مزگەوتەکەی کراوە.

لە ڕۆمانی (هەڵکشان بەرەو لوتکە)ی (عەبدوڵڵا سەڕاج)دا سەرەڕای ئەوەی لەچوارچێوەی باسکردنی جوگرافییانەی شاری کەرکوکدا، مزگەوتەکانیش بەسەرکراونەتەوە و باسیان کراوە و وەکو ناونیشانێکیش بەکارهێنراون، چەندین باس و بیروڕای ئایینی لەناو دەقەکەدا بەرچاو دەکەوێ، بەشێوەیەک ئەو دەقە تژییە لە بابەتی ئایینی و ڕۆماننووس سوودێکی تەواوی لەو باس و بابەتە ئاینییانە وەرگرتووە و چنینی ڕووداوەکانی پێ تەواوکردووە و ڕەهەند و لایەنەکانی کارەکتەرەکانیشی پێ ڕوونکردۆتەوە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە کارەکتەری ئایینیش ڕۆڵیان لە دوو توێی دەقەکەدا گێڕاوە. لە دیمەنێکدا کاتێک باس لە مزگەوتی (کیلانە) دەکات، بە مزگەوتە

ترسێنەرەکە ناوی دەبات و چیرۆکی ئەو مزگەوتەش لە زاری (تۆفیق)ی کارەکتەرەوە دەگێڕێتەوە ((دایکم دەیگوت: گوایە فریشتە نشێنە و لەمەڕ ئەو مزگەوتەوە حیکایەتی زۆرم بیستووە، یەکێک لەوانە ئەوەبوو کە پیاوان بە شەو گرەوی ئەوەیان دەکرد کە کێ دەوێرێ بچێتە ناو ئەو مزگەوتە و سنگێکی لێداکوتێ .....تەنیا قوەلەتێنی مزگەوتەکە بۆ غوسلّی مێردان و مەلە و بەزمی کوڕوکاڵ بەکاردەهات، ئەگینا بەتەمەنی من نوێژی لێنەکراوە)) (هەڵکشان بەرەو لوتکە :١٣). ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە ڕوانگەی کۆمەڵگە لەمەڕ دەزگایەکی ئایینی وەکو مزگەوت پیشان دەدات کە کاریگەری بەسەر کۆی ژیانی تاکەکانییەوە هەبووە و لە گشت بوارەکاندا ئاڕاستەی کردوون.

هەر لەم چوارچێوەیەشدا ئاماژە بە کارەکتەری (مەلا) وەکو پیاوێکی ئایینی کراوە و لە گەلێک دیمەنی ناو ڕۆمانەکەیدا بەشداری پێکراوە، لە هەندێکیاندا کاروباری ئایینی جێبەجێکردووە، لە هەندێک دیمەنی دیکەشدا کەوتۆتە بەر ڕەخنەی ڕۆماننووسەوە، چونکە ئایینەکەی لە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی بەکارهێناوە. لەمەشدا زیانی لە ناوبانگی ئایینەکەش داوە، لەوانەش کاری جادووکەریی و نوشتە کە جگەلەوەی ئاسەوارێکی خراپی کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە، لە کەسایەتی مەلاش وەک پیاوی ئایینی دەدات و ناوبانگی ئایینەکەش لەکەدار دەکات. ئەوەتا لە دیمەنێکدا کاتێک (ئۆمەر) داوا لە دایکی دەکات کچی (ڕەشە کەوشدروو)ی بۆ بخوازێت، بەڵام دایکی، لە دایکی کچە نیگەرانە، چونکە بەلایەوە ((ئەو جادووکارەی دایکی، حەوتەی سێ جار لای مەلا واحید کەوتووە، نوشتە و جادووی بۆ دەنووسێت)) (هەڵکشان بەرەو لوتکە : ١١٢-١١٣). لێرەدا کەسایەتی مەلا لەو پەڕی خراپیدایە و باسکردنیشی جۆرێکە لە ڕەخنەگرتن لەو جۆرە کاروکردەوانەی کە بەناوی ئایینەوە و لە پەنای بیروباوەڕە ئایینییەکانەوە دەکرێت. هەر لەم میانەیەشدا ئاماژە بەکاری سۆفیگەریی و دەروێشایەتی دەکات و بیروای ئایین و مەلاش لەمبارەیەوە دەخاتەڕوو. ئەمەش لە کارەکتەری (سۆفی محێدین)دا بەرجەستە دەکات. ئەم جۆرە باسکردنەی (سۆفی محێدین) لەلایەکەوە ڕەهەندی ئایینی ئەو کارەکتەرە پیشان دەدات کە توندوتیژی ئایینی و بیرۆکەی دەروێشایەتی کاریگەرییان لەسەر هەڵسوکەوتی ڕۆژانە و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان داناوە و سەرەڕای ئەوەش ڕێچکەیەکی دیکەی ژیانی بۆ دەستنیشان کردووە.

بێگومان ئەو جۆرە بەکارهێنانەی ئایین، لەلایەن مەلا و پیاوانی ئاینییەوە جێگەی پەسەند نییە و ڕەتدەکرێتەوە. لەم ڕۆمانەدا جیاوازی بۆچوونی ئایینی لە نێوان مەلا و سۆفیگەری بەدیار دەکەوێت، ئەم جیاوازی بیروبۆچوونەش وایکردبوو کەسیان باوەڕ بەوی دیکەیان نەکات و تانە و تەشەڕ لەیەکتری بدەن، بۆیە لە دیمەنێکدا (سۆفی محێدین) ڕووبەرووی (مەلا تەها) دەبێتەوە و پرسیاری لێدەکات ((مامۆستا، ئەوانە چین نووسراون

لەم قەد دیوارانە. مەلا تاها سەدان جار ئەو نووسینانەی خوێندبووەوە کەچی دەستی نایە بەرچاویی و کەپرۆکەیەکی بۆ کردە سایە، هەروەکو ئەوەی چاوی خۆی کز نیشانبدات بۆئەوەی لە پرسیارەکەی سۆفی هەڵێت..... دەزانی چی نووسراوە! نووسراوە با سۆفی ئۆقرە بگرێ و لە ئاشییانەکەی خۆی بمێنێتەوە...

ـ کەواتە بۆ مەعاشم بۆ نابڕنەوە؟

ـ سۆفی تۆ لە کونجەکەی خۆتبەو ئەوانە دێن ناونووست دەکەن. مەلا بەوە دەیوست لە کۆڵی خۆی بکاتەوە، کەچی سۆفی وەکو قیر لکایە کەوای مەلاوە.

ـ باشە مەلا، ئەگەر مەعاشت پێنەدەن پێش نوێژی دەکەیت!

پرسیارە چاوەڕوان نەکراوەکەی سۆفی وەکو قەیناخ بەدڵی مەلادا چوو:ـ گەوجە، نوێژ بۆ خواوەندە. سۆفی قسەکەی پێشووی بە پێودانگێکی دیکە دوو گاسنە کردەوە: ـ نوێژی مەلایان بە نیو ئەجر دەنووسرێ. مەلا متەقی نەکرد و لە دڵی خۆیدا بەخۆی گوت: ئەمەیە مەلا بەزێن)) (هەڵکشان بەرەو لوتکە : ١٩٨–١٩٩). لێرەدا جیاوازییەکانی ئەو دوو توێژە ئاینییە دەردەکەوێت کە هیچ لایەکیان باوەڕی بە کاروکردەوەی ئەوی دیکە نییە، لەکاتێکدا هەردوو لاشیان لەچوارچێوەی ئاییندا کار و فەرمایشتەکانیان ئەنجام دەدەن.

### سەرچاوە


١. د.عەبدوڵڵا خورشید عەبدوڵڵا و ئەسرین زرار: کێشە کۆمەڵایەتییەکانی ئافرەتی کورد و هۆکارەکانی، گۆڤاری (ئەکادیمی)، ژمارە (١٨)، ٢٠١١.

٢. أ.راويه رحابلي، الروايه و تاريخ الاديان بين التقديس و التدنيس، مجله جيل الدراسات الادبية و الفكرية، العام الثاني ـ العدد ٩، يوليو ٢٠١٥.

٣. ناجم مولاى، موسسة الدينية ودورها في الحفاض على الهويه الوطنية، ٢٠١١http:// elaphblogs.com/post/.html

٤. ئیبراهیم ئەحمەد: ژانی گەل، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چ٥، هەولێر، ٢٠١٠.

٥. موکری: هەرەس، چاپخانەی بێسارانی، چ٣، سلێمانی، ١٩٩٨.

٦. حسەین عارف: شار، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چ٢، هەولێر، ٢٠١١.

٧. عەبدوڵڵا سەراج: هەڵکشان بەرەو لوتکە، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٩.

٨. غەفور ساڵح عەبدوڵڵا: توانەوە، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیر، چ٢، هەولێر ٢٠٠٩.

# سەڵاحەددینی ئەیوبی
## ئەو سەرکردەی لە مێژووی کورد
# دووبارە نابێتەوە



**سوداد ڕەسوڵ**

نووسەر و مامۆستا لە زانکۆی سۆران. خوێندکاری دکتۆرا
لە بواری زمانەوانی لە زانکۆی ساینس لە مالیزیا

### ڕوانگەیەکی ئەکادیمی بۆ مێژووی سەلاحەددینی ئەیوبی

سەلاحەددینی ئەیوبی وەک گەورەترین کەسایەتیی مێژووی کورد، تائێستا لای کورد بەشێوەیەکی ئەکادیمی توێژینەوە لەسەر کەسایەتی و مێژووەکەی نەکراوە، هەروەها کورد وەک نەتەوەی خاوەن ئەم کەسایەتییە گەورەیە تائێستا وەک پێویست بایەخی بە مێژوو و ناووشۆرەتی سەلاحەدین نەداوە. ئەگەر سەیری کتێبە مێژووییەکانی پەروەردەی حکومەتی هەرێم بکەین، دەبینین مێژووی ئەیوبییەکان زۆر کەم بایەخی پێ دراوە، لە مەڵبەندە ئەکادیمی و ڕۆشنبیرییەکانی باشووری کوردستانیش ناوی سەلاحەدین و مێژووەکەی تائێستا پێگەی شیاوی خۆی پێ نەدراوە، کەچی لای غەیری کورد، لە مەڵبەندە ئەکادیمییەکانی جیهانی ئیسلام و ئەوروپا بایەخێکی زۆر بە مێژووی سەلاحەدین دەدرێت.

بایەخ نەدانی کورد بە سەلاحەدین زیاتر بۆ هۆکاری ئایدیۆلۆجی دەگەڕێتەوە، چونکە تاکی ڕۆشنبیری کورد لە ڕوانگەیەکی ئایدیۆلۆجییەوە سەیری مێژوو دەکات و هەر لەم ڕوانگەیەش هەڵسەنگاندن بۆ کەسایەتییەکان و ڕووداوەکان دەکات.

سەرهەڵدانی بیری نەتەوایەتیی کورد و بڵاوبوونەوەی لە سەرەتای سەدەی بیستەم بە نێو چینی ڕۆشنبیری کورددا، تێڕوانینێکی نوێی هێنایە دنیای هزری کوردییەوە، کە لە ڕوانگەی ئەم بیرە نەتەوەییە: کورد سەر بە نەژادی ئارییایە و لە نەژادی سامی باشتر و بەرزترە، ئیسلام دینێکی عەرەبی سامییە، ئەم دینە بە فەرهەنگ و زمان هیچ پەیوەندی بە کوردەوە نییە، سەردەمی هاتنی ئیسلامیش بۆ ناو کورد سەردەمی مەینەتی و ژێردەستەیی کوردە، هەربۆیە هەوادارانی ئەم بیرە حەز دەکەن بە مێژوو و فەرهەنگ بگەڕێنەوە بۆ پێش ئیسلام، و هەموو شتێکی پێش ئیسلامیش لایان خۆشەویستە، هەر بەشدارییەکی کوردیش لە شارستانیەتی ئیسلام بە خزمەتی بێگانە وەسفی دەکەن و بایەخی پێ نادەن. بەپێی ئەم ڕوانگە نەتەوەییە، سەلاحەدین خزمەتکاری عەرەب بووە و هیچ سوودێکی بۆ کورد و مەسەلە نەتەوەییەکەی نەبووە، بۆیە پێویست ناکات کورد بایەخی پێ بدات، هەندێک جاریش زۆر بەتوندی ڕەخنەی لێ دەگرن و بە خیانەتکار و خۆفرۆش تۆمەتباری دەکەن. هاوکات لەگەڵ ئەم ڕەوتە ناسیۆنالیستییە، ڕەوتێکی دیکەی هزری چەپی و مارکسی بۆ دنیای هزری کوردی هات، کە ئەم بیرە لە ڕوانگەی ململانێی چینایەتییەوە مێژوو دەخوێنێتەوە و پێیوایە لەم ململانێیە، ئایین ئامرازێکە بە دەستی دەسەڵاتدار و چەوسێنەران بۆ هێشتنەوەی چینی کرێکار بە چەوساوەیی، بۆیە ئایین هیوایەکی درۆیینەیە و خزمەت بە چینی کرێکار و چەوساوە ناکات، ئایین وەک ئەفیون وایە بۆ گەلان. ئەم ڕەوتە هزرییە جیاکاری نەژادی و ڕەگەزی لە نێوان ئارییایی و سامی ناکات، بەڵام دژایەتی هزری ئایینی دەکات، بۆیە لە مێژووی کورددا هەر کەسایەتییەک

پاشخانێکی ئایینی هەبووبێت، شایەنی ئەوە نییە بایەخی پێ بدرێت، سەلاحەدین لای ئەوان کەسایەتییەکی گرنگ نییە لە مێژووی کورد، چونکە خزمەتی بە ئایینی ئیسلام کردووە. لە بەرانبەر ئەم دوو ڕەوتە، ڕەوتێکی دیکەی هزری ئیسلامی سیاسی هەیە کە بەرگری هزری لە سەلاحەدین دەکات، و بایەخی پێ دەدات. دەکرێ بڵێین لەنێو هەموو ڕەوتە هزرییەکانی دنیای کوردی، تێڕوانینی ئەوان بۆ سەلاحەدین ڕاستتر و زانستیترە، و خزمەت بە کورد و مێژووی کورد دەکات.

ئەگەر سەرنج بدەین، پێش هاتنی ئەم ڕەوتە هزرییانە بۆ ناو کورد، مێژووی سەلاحەدین لای کورد هیچ کێشەیەکی نەبووە و کورد زۆر شانازی بە مێژووی ئەیوبییەکان کردووە. لە شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی لە سەدەی شازدەم و خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستانی ئەمین زەکی بەگ لە سەدەی بیستەم، مێژووی سەلاحەدین و ئەیوبییەکان وەک بەشێکی گرنگ  و پڕ شانازی کورد باسی کراوە. لە هەموو مێژووی ئەدەبیاتی کوردیش، لە شیعری شاعیرانی کورد، سەلاحەدین هەر شانازی پێوە کراوە. کەواتە ئەسڵی کێشەی کورد لەگەڵ مێژووی سەلاحەدین ئەو ڕوانگە ئایدیۆلۆجیستییەی ڕۆشنبیری کوردە کە بە پێوەرە ئایدیۆلۆجییەکان مێژوو دەخوێنێتەوە، ئەم خوێندنەوەیەش بۆ مێژوو لە ڕووی مەعریفییەوە یەکجار هەژارە، دەرسە مێژووییەکان چەواشە دەکەن و مێژوو بێنرخ دەکەن، نەوەی نوێش بەڕاستییە مێژووییەکان لاڕێ دەکەن، لەهەمانکاتدا کورد لە گەورەترین کەسایەتیی مێژووەکەشی بێبەش دەکەن. ئەگەر ئەم مێژووە لە ڕوانگەیەکی ئەکادیمییەوە سەیری بکرێ، و لە چوارچێوەی سەردەمی خۆی و ئەو ڕووداوانەی لەو سەردەمە هەبوون خوێندنەوەی بۆ بکرێت، ئەوا سەلاحەدین مێژوویەکی یەکجار گرانبەها و پڕ بایەخە بۆ ناسنامەی کورد، چونکە سەلاحەدین تاکە کەسایەتیی مێژووی کوردە کە لەسەر ئاستی هەموو جیهانی ئیسلام و ئەورووپا ناسراوە و کاریزمایەکی جیهانی هەیە، بۆیە ئەم مێژووە بۆ کورد دەستکەوتێکی گەورەیە، زۆر گرنگە کورد ئەم مێژووە بە هی خۆی بزانێ و بایەخی پێ بدات، و بیکات بە هێز و وزە بۆ ئەمڕۆ و نەوەکانی داهاتوو.

گلەییەکی زۆر لە سەلاحەدین دەکرێت کە هیچی بۆ کورد نەکردووە..! ئەوەی تۆزێک بە مێژوو ئاگایی هەبێت، لەوە ئاگادارە کە نەتەوایەتی و کێشەی نەتەوایەتی مەسەلەیەکی تازەیە لە مێژوودا، نەتەوایەتی و دەوڵەتی نەتەوەیی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بۆ سەد ساڵێک پێش ئێستا دەگەڕێتەوە، لە دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی نەتەوایەتی بە جیهانی ئیسلام و ڕۆژهەلاتدا بڵاودەبێتەوە، پێش ئەم سەدەیە شتێک نەبووە پێی بگوترێ کێشەی نەتەوایەتی و دەوڵەتی نەتەوەیی. تەنانەت لە ئەورووپاش نەتەوایەتی بۆ دوو سەدە پێش ئێستا دەگەڕێتەوە، بۆیە پێش ئەم سەردەمە سەرکردە و ڕابەر و زانا و دانا و شاعیر و نووسەر.. کەسایەتی سەردەمی خۆیان بوون و لەچوارچێوەی ئەو

فەرهەنگ و ئەو کێشانەی لەو سەردەمە هەبووە بیریان کردووەتەوە و کاریان کردووە و نووسیویانە. ئەم دۆخە لە مێژوودا لای هەموو نەتەوەکان بە هەمان شێوە بووە، بە سەدان شاعیر و دانا و زانا هەبوون لە مێژوودا بە زمانی نەتەوەی خۆیان هیچیان نەنووسیوە و بە زمانێکی دی کە ئەوسا زمانی ئەدەبی یان زمانی باڵادەست بووە نووسیویانە. بە سەدان سەرکردە و پیاوی مێژوویی هەبوون لە ڕووی نەتەوەییەوە هیچیان بۆ نەتەوە و گەلەکەیان نەکردووە، هەڵکەوتی مێژوویی وابووە لە وڵاتێکی تر حوکمڕان بوون، بەڵام ئەو کەسایەتییانە ئەمڕۆ بوون بە جێگەی شانازی و بەڕێزەوە باسیان دەکەن و شەقام و شار و مەڵبەندی ڕۆشنبیرییان بەناو دەکەن.

سەلاحەددینی ئەیوبیش وەک دەیان سەرکردەی دی لە مێژوودا زادەی سەردەمی خۆیەتی، کەسایەتییەکی کورد بووە لە سەدەی دوازدەم ژیاوە و تێکەڵ بە ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەی جیهانی ئیسلام بووە. ئەوەی گرنگە سەرنجی بدەین قورسایی دەسەڵاتەکەی لە دەرەوەی کوردستان بووە، خۆشی لە دەرەوەی کوردستان لە ژینگەیەکی عەرەبی گەورە بووە. هەروەها لەو سەردەمەدا هیچ کێشەیەکی نەتەوەیی لە ئارادا نەبووە، ئینتیمای گەلان و نەتەوەکان بۆ ناسنامەی ئایینی بووە، گەورەترین ڕووداوی ئەو سەردەمەی جیهانی ئیسلامیش، هێرشی سەلیبییەکان بووە، کە هەموو جیهانی ئیسلام بە کوردەوە دەیویست خۆی لەم هێرشانە بپارێزێت، و بەرگری لە خۆی بکات، بۆیە ئاساییە سەلاحەدین و هەر سەرکردەیەکی دیکەی مسوڵمان لەو سەردەمە ئەو ڕۆڵە بگێڕێت، کە بەپێی سەردەمی خۆی ڕۆڵێکی گەورەی لە مێژوو گێڕاوە و سەلیبییەکانی لە فەڵەستین وەدەرناوە، ئەم مێژووەش بوو بە یەکێک لە ڕووداوە گرنگەکانی مێژووی مرۆڤایەتی.

ئەوەی پلەوپایەی سەلاحەددینی گەورەتر کردووە، مامەڵەی جوامێرانە و مرۆڤدۆستانەی بوو لەگەڵ سەلیبییەکان لەکاتی ڕزگارکردنی قودسدا، بە هەزاران مەسیحی و قەشە و پیاوانی ئایینی بەخشی و بە جوانترین شێوە مامەڵەی لەگەڵ کردن، سەلاحەدین وەک پیاوێکی ئاشتیخواز دەرکەوت کە حەزی بە کوشتار و خوێنڕێژی نییە و پەنای بۆ تۆڵەکردنەوە نەبردووە. ئەم هەڵوێستە جوانەی سەلاحەدین لەگەڵ سەلیبییە داگیرکەرەکانی خاکی مسوڵمانان، لە هەموو ئەوروپا دەنگدانەوەی هەبوو، سەلاحەدین بوو بە ڕەمزی ئازایەتی و جوامێری و شەهامەت، چووە نێو دەقی شانۆ و شیعر، بابەتی کاری هونەری.. لەوساوە هەتا ئێستا سەلاحەدین لە ئەوروپا وەک کاریزمایەک سەیری دەکرێ نەک وەک دوژمن. بە سەدان کتێب بە زمانە جیاوازەکانی ئەوروپی لەسەر ژیان و ئازایەتی و حوکمڕانییەکەی نووسراون.

کاتی ئەوە هاتووە کورد مێژووی سەلاحەدین و ئەیوبییەکان بە ئەکادیمی و دوور لە ڕوانگە و ئەجێندای ئایدیۆلۆجی بخوێنێتەوە و توێژینەوەی لەسەر بکات، و لە مێژووی

کورد پێگەی شیاوی خۆی پێ ببەخشێت. بەم تێڕوانینە ئەکادیمییە کورد بە هەموو ڕەوتە ئایدیۆلۆجییەکان دەتوانن سوود لەم مێژووە پرشنگدارە وەرگرن. ئەم توێژینەوەیە هەوڵێکە بۆ خوێندنەوەیەکی ئەکادیمی بۆ مێژووی ئەیوبییەکان، و ئاوڕدانەوەیەکی خێرایە لە مێژووی ژیانی سەلاحەدین و دەوڵەتی ئەیوبی لە میسر و شام، لەگەڵ باسکردنی ئەو ڕۆڵەی کە سەلاحەدین وەک قارەمانێک گێڕاویەتی لە ڕزگارکردنی قودس و مامەڵەی نەرمی لەگەڵ سەلیبییەکان.

**بنەچەی سەلاحەددینی ئەیوبی**

بۆمان دەگێڕێتەوە بنەچەی سەلاحەددینی ئەیوبی دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی قەوقاز لە ئەرمەنستان، کە لەم ناوچەیە لە سەدەکانی دەیەم و یازدەمی میلادیدا میرنشینێکی کوردی بەناوی میرنشینی شەددادی(٩٥١ –١٠٧٥ م) لە هەرێمی ئاران(١) فەرمانڕەوا بووە. محەمەد بن شەداد دامەزرێنەری ئەم میرنشینە بووە، و پایتەختەکەی شاری دوین بووە لە ئەرمەنستان.  بنەچەی بنەماڵەی ئەیوبییەکانیش دەگەڕێتەوە بۆ شاری دوین لە ئەرمەنستان و سەر بە عەشیرەتی (ڕەوادی)ن. نەجمەدین ئەیوب، باوکی سەلاحەدین لە گوندی ئەجدانکان لە نزیک شاری دوین لە ئەرمەنستان لەدایکبووە. شادی، باپیری سەلاحەدین دوای ڕووخانی ئیمارەتی شەدادی لەگەڵ کوڕەکانی نەجمەدین ئەیوب و ئەسەدەدین شێرکۆ، لەسەر داوای بەهرۆز، کە والی بەغدا و دۆستێکی نزیکی شادی بووە، بۆ بەغدا کۆچ دەکەن. شادی و کوڕەکانی زۆر لە بەغدا نامێننەوە بۆ تکریت کۆچ دەکەن. شادی لە تکریت پۆستێکی ئیداری دەبێت و هەر لەوێش کۆچی دوایی دەکات و بە خاک دەسپێردرێت(٢).

دوای مردنی شادی لە ساڵی ١١٣٢ز نەجمەدین ئەیوب لە پۆستە ئیدارییەکەی جێگەی باوکی دەگرێتەوە، لەهەمانکاتدا لەگەڵ ئەتابەگی موسڵ عیمادەدین زەنگی پەیوەندییەکی دۆستانەی دەبێت، تا ئەوە بوو لە ساڵی ١١٣٨ نەجمەدین ئەیوب و شێرکۆ، تکریت بەجێدەهێڵن و ڕوو لە شاری موسڵ دەکەن، عیمادەدین زەنگیش بە گەرمی پێشوازیان لێ دەکا و چاکەیانی لە یاد بووە. سەرچاوە مێژووییەکان باس لەوە دەکەن لەو شەوەی کە کۆچ دەکەن بۆ مووسڵ، سەلاحەدین لە شاری  تکریت لە دایک دەبێت.

دوای ئەوەی عیمادەدین زەنگی دەسەلاتی فراوان دەبێت و ناوچەی سووریا و بەعلەبەک(بعلبک) لە لوبنان داگیر دەکات نەجمەدین ئەیوب لەی دەکرێ بە بەرپرس و فەرماندەی عەسکەری ئەو شارە. نەجمەدین لەم شارە بۆماوەی هەشت ساڵ حوکمڕان بووە، کەسێکی هێمن و لەسەرخۆ بووە لەهەمانکاتدا سیاسییەکی دووربین و چاوکراوە و شارەزا بووە، خەریکی کاری خێرخوازی و چاکە بووە، ئەوەندە وێڵی سامان و پلەوپایە نەبووە(٣).

سەلاحەدین لەگەڵ باوکی لە بەعلەبەک منداڵی خۆی بە سەر دەبات و گەورە دەبێت، لەهەمانکاتدا ئاگاداری هێرشی سەلیبییەکان بووە بۆ دەشتی بیقاع، کە شاری بەعلەبەک لە دەشتی بیقاع هەڵکەوتووە، بەچاوی خۆی ئەو وێرانکارییە دەبینێت کە لە ئەنجامی دەستدرێژکاریی سەلیبییەکان بەسەر ناوچەکەدا هاتووە(٤) ، بۆیە سەلاحەدین هەر لە تافی لاوێتییەوە لەگەڵ باوکی و مامی قاڵبووی ناو سیاسەت و ئیدارە بووە، و لەنێو ڕووداوە گرنگەکانی ئەو سەردەمەشدا ژیاون.

شێرکۆی مامی سەلاحەددین، دەبێ بە سەرلەشکر لە سوپای نورەدین مەحموودی کوڕی زەنگی، ئەتابەگی حەلەب، دواتر بەهۆی دڵسۆزی و لێهاتوویی خۆی دەکرێ بە حاکمی شاری حومس (حمص) لە وڵاتی شام (کە ئەمڕۆ سووریایە)(٥).

دواتر شێرکۆ لە میسر پۆستێکی ئیداری گەورەی پێ دەدرێ و دەکرێ بە وەزیری دەوڵەت لای دەوڵەتی فاتمی لە میسر، سەلاحەددینیش لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکان هاوکار و ڕاوێژکاری دەبێ. دوای وەفاتی شێرکۆ، سەلاحەدین لە جێگەی دەبێ بە وەزیری دەوڵەت و کاروباری میسری دەکەوێتە ژێردەستی. دوای ڕووخانی دەوڵەتی فاتمی، ئەمجارە سەلاحەدین بۆ خۆی دەبێ بە سەرکردەی میسر، و لەگەڵ زەنگییەکانی شام یەک دەگرن و دەوڵەتێکی بەهێزی یەکگرتوو لە ناوچەکە پێکدێنن بەناوی دەوڵەتی ئەیوبی. دواتر هەرێمی حیجاز و یەمەنیش دەکەوێتە ژێر فەرمانڕەوایی ئەیوبییەکان. بەم پێیە دەوڵەتی ئەیوبی بەسەر ناوچەیەکی بەرفروان لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا فەرمانڕەوا بووە، بۆماوەی ٢٦٢ ساڵ بەردەوام بووە. بەم شێوەیە بنەماڵەی ئەیوبییەکان کە لە ناوچەی قەوقازەوە ئاوارە دەبن بۆ ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، لەوێ ئەستێرەی بەختیان دەگەشێتەوە و دەبن بە خاوەن پلەوپایە و فەرمانددەی عەسکەری و دەسەلاتدار بەسەر ناوچەکەدا.

### سەردەمی سەلاحەددینی ئەیوبی

ئەو سەردەمەی سەلاحەدین لێی لەدایکبووە سەدەی دوازدەمی زاینی بووە، ئەو شوێنەش کە لێی لەدایکبووە تکریت بووە و دواتریش لە بەعلەبەک( لە لوبنان) گەورە بووە، واتە دوور لە کوردستان و لە ژینگەیەکی عەرەبی لەدایکبووە و گەورە بووە، ئەمە لە لایەک، لەلایەکی دیکەوە زۆر گرنگە بزانین کە ئەو سەردەمە جیهانی ئیسلام لە چ بارودۆخێکدا بووە کە ئەم بنەماڵە کوردە لە جەرگەی ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە کارگێڕ و کاربەدەست و فەرماندەی عەسکەری بوون. لەو سەردەمە کە سەلاحەددینی ئەیوبی وەک سەرکردەیەک بە دەردەکەوێت، ئەوسا فەرمانڕەوایی جیهانی ئیسلام لەژێر دەسەلاتی خەلافەتی عەباسیدا بوو کە پایتەختەکەی لە بەغدا بوو، بەلام لە چەند لایەکی قەڵەمڕەوی ئەم خەلافەتە دەوڵەتی ناوچەیی سەربەخۆ هەبوون، وەک فاتمییەکان، کە بنەماڵەیەکی

شیعەی ئیسماعیلی بوون لە میسر فەرمانڕەوا بوون و دژ بە دەسەڵاتی خەلافەت بوون، سەڵیبییەکانیش کەناری ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاستیان داگیر کردبوو، هەر لە ئاسیای بچووکەوە، لە ناوچەی ئەنتاکییەوە هەتا لوبنان و فەلەستین و نیمچەدوورگەی (سینا) لەژێر داگیرکاری سەڵیبییەکاندا بوو، ئەتابەگەکانیش کە تورکە سەلجوقییەکان بوون لە باکووری عێراق و سووریا فەرمانڕەوا بوون.

بەم شێوەیە جیهانی ئیسلام لە ناوخۆدا پارچە پارچە بوو، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە دوچاری داگیرکاری دەرەکیش هاتبوو. خاڵێکی دی زۆر گرنگە بزانرێ کە مسوڵمانان لەو سەردەمە هەموو پێکەوە یەک ناسنامەیان هەبووە کە ئەویش ناسنامەی ئۆممەتی ئیسلام بوو، واتە هەموو نەتەوە و گەلانی ناو ئۆممەتی ئیسلامی لەو سەردەم لە یەک بەرەدا بوون، هیچ کام لە نەتەوەکانی ناو جیهانی ئیسلامی هەوڵی دروستکردنی کیانی نەتەوەییان بۆ خۆیان نەداوە، چونکە هەستی نەتەوایەتی و بیری نەتەوایەتی لە ناودا نەبووە. وەک ئاشکرایە بیری نەتەوەیی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم لەنێو گەلانی موسڵمان بڵاودەبێتەوە، بەتایبەت دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی لە سەرەتای سەدەی بیستەم. بۆیە لە سەدەی دوازدەیەمی زاینی نەک هەر لە جیهانی ئیسلامی بیری نەتەوەیی نەبووە، بەڵکو لە ئەورووپاش نەتەوایەتی هێشتا دەرنەکەوتبوو، بۆیە گەلانی ئەورووپاش پێکەوە لە بەرەیەکدا بوون کە ئەویش بەرەی مەسیحیەت و بەرژەوەندییەکانی جیهانی مەسیحی بوو. لێرەوە ڕوون دەبێتەوە کە سەلاحەدین وەک قارەمانێکی کورد لە دەرەوەی کوردستان پێ دەگات و دەسەڵاتی دەبێت، لەو سەردەمە ئەرکێکی گەورەی مرۆڤایەتی و مسوڵمانەتی لە ئەستۆ بووە کە بەرگری لە جیهانی ئیسلام بووە، هەوڵدان بووە بۆ یەکخستنی مسوڵمانان لە دژی داگیرکاریی سەڵیبییەکان. بۆ ئەم ڕزگارکردنەش هەموو گەلانی مسوڵمان بە کورد و عەرەب و تورکمان و تورکی سەلجوقی و ئەمازیغی لەگەڵ سەلاحەددیندا بوون بۆ شەڕ لە دژی سەڵیبییەکان و ڕزگارکردنی خاکی مسوڵمانان لە چنگیان.

### شەڕ لە دژی سەڵیبییەکان و ڕزگارکردنی قودس

شەڕی سەڵیبی، زنجیرە شەڕێک بووە لە نێوان ئەورووپای مەسیحی لە ڕۆژئاوا و جیهانی ئیسلامی لە ڕۆژهەڵات لە کۆتایی سەدەی یازدەیەم و سەدەی دوازدەیەم و کۆتایی سەدەی سێزدەمی زاینی (١٠٩٦ – ١٢٩١ م) کە مەسیحییەکان لە ڕۆژئاواوە هێرشیان دەهێنایە سەر جیهانی ئیسلام بۆ داگیرکردنی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست و بەتایبەت فەلەستین و شاری قودس کە شوێنی پیرۆزی مەسیحییەکانە و شوێنی لەدایکبوون و ژیانی حەزرەتی عیسا بووە. مەسیحییەکان بەردەوام دەهاتن بۆ زیارەتی شوێنە پیرۆزەکانیان.

دوای ئەوەی تورکە سەلجوقییەکان لە ئاسیای ناوەڕاستەوە کۆچ دەکەن بۆ ئاسیای بچووک (تورکیای ئێستا) گوشار دەخەنە سەر دەسەڵاتی بیزەنتییەکان لەم هەرێمە و پێشڕۆیی دەکەن بۆ ناوچەکانی دی، تا ئەوەبوو لەکۆتاییدا دەست بەسەر ناوچەی ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاستدا دەگرن، شاری قودس و فەلەستین دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی سەلجوقییەکان، و ڕێگە لە مەسیحییەکان دەگرن بۆ زیارەتی شوێنە پیرۆزەکانیان. ئەم ڕێگەگرتنە لەلایەک و، زیادبوونی دەسەڵاتی تورکە سەلجوقییەکان لە ئاسیای بچووک لە دژی بیزەنتییە مەسیحییەکان لەلایەکی دیکەوە دەبێتە جێگەی هەڕەشە بۆ سەر جیهانی مەسیحییەت، ئەمانە بەهانە دەدەنە دەست مەسیحییەکانی ئەوروپا کە بەرگری لە جیهانی مەسیحییەت بکەن، بۆیە پاپای کاسۆلیک ئوربانی دووەم Pop Urban II بانگەوازی مەسیحییەکانی ئەوروپا دەکات کە چیدی لەناو یەک شەڕ نەکەن و ڕیزەکانیان یەک بخەن بۆ شەڕی پیرۆز Holy War دژ بە مسوڵمانەکان کە بوون بە جێگەی هەڕەشە بۆ سەر مەسیحییەکان، هەروەها بۆ ڕزگارکردنی خاکی پیرۆزی مەسیحییەکان لە چنگی مسوڵمانەکان(٦). بەم بانگەوازەی پاپای ناوبراو لە ساڵی ١٠٩٦ یەکەم شەڕی سەڵیبی دەستپێدەکات. لە مێژوودا هەشت شەڕی گەورەی سەڵیبی لە هەرێمەکە بە دوای یەک بەرپا بووە.

ئەم شەڕانە بۆماوەی زیاتر لە دوو سەدە بەردەوام بوون، خەڵکێکی زۆر لەم شەڕانە بوون بە قوربانی و وێرانکارییەکی زۆریشی لەگەڵ خۆیدا هێنا. هەرچەندە ئەم شەڕانە بە بەهانەی ڕزگاری شوێنی پیرۆزی مەسحییەکان بوو، بەڵام هۆکاری ئابووریی و سیاسی هەبووە. لە سەدەکانی دەیەم و یازدەیەم قەیرانی ئابووریی و وشکەساڵی و برسێتی ڕووی لە وڵاتانی ئەوروپا کردبوو، چاویان لە جیهانی ئیسلامی بوو بۆئەوەی بتوانن خاکێکی بەپیت و بەرهەم لە ڕۆژهەڵات بخەنە ژێردەستی خۆیان، هەروەها هۆکاری سیاسیشی هەبوو کە ئامانجیان ئەوە بوو بە بەهانەی ڕزگارکردنی شوێنی پیرۆزی مەسیحییەکان، زەبرێکی کوشندە لە جیهانی ئیسلام بدەن بۆئەوەی سوپای مسوڵمانان چیدی بەرەو ئاسیای بچووک و ئەوروپا پێشڕۆیی نەکات(٧).

ئەم شەڕە لە جیهانی مەسیحییەتی سەدەکانی ناوەڕاست ئەوەندە جێگەی بایەخ بووە، دەسەڵاتی کەنیسە هەموو دەزگاکانی مەسیحییەتی لە ئەوروپا خستەکار بۆئەوەی بتوانن ژمارەی زیاتری شەڕکەر بۆ ئەم شەڕانە کۆ بکەنەوە. تەنانەت مەلیک هێنری دووەم مەلیکی ئینگلتەرا، و باوکی ڕیچاردی شێردڵ، بەسەر و بە ماڵ خۆی بۆ ئەم هێرشانە ئامادە دەکرد، باجێکی تایبەتی لە خەڵک وەردەگرت بەناوی باجی سەلاحەدین Saladin Tax کە دەیەکی لە هەموو بەروبومێکی خەڵک وەردەگرت(٨).

لە شەڕی یەکەمی سەڵیبی کە لە نێوان ساڵانی ١٠٩٦ – ١٠٩٩ زاینی بوو، سەڵیبییەکان

توانیان ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست هەر لە ئاسیای بچووکەوە هەتا لوبنان و فەلەستینی ئەمڕۆ لەگەڵ شاری قودس داگیربکەن. لەم داگیرکردنەدا کوشتارێکی بێبەزەییانەی خەڵکەکە دەکەن. سەلیبییەکان لەم هەرێمانە چەند ئیمارەتێک دادەمەزرێنن وەک ئیمارەتی ڕەها، ئەنتاکییە، تەرابلوس، قودس. لە شەڕی دووەمی سەلیبی کە لە نێوان ساڵانی ١١٤٧ – ١١٤٩ زاینی بوو، مسوڵمانەکان لە هێرشەکانیان بۆ سەر ناوچە داگیرکراوەکانیان لە سەردەمی عیمادەدین زەنگی چەند ناوچەیەک ڕزگار دەکەن بەتایبەت شاری ڕەها (کە شاری ئورفای ئێستایە).




**ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست کە لە لایەن سەلیبییەکانەوە داگیرکرابوو چەند ئیمارەتێکیان لەم هەرێمە دامەزراند بوو، لە سەدەی یازدەیەم و دوازدەیەمی زاینیدا.**

لە شەڕی سێیەمی سەلیبی کە لە ساڵی ١١٨٧ز بەرپا بوو، ئەم شەڕە بە فەرماندەیی سەلاحەددینی ئەیوبی بوو. ناوبراو سەرکەوتنی گەورە بە دەست دەهێنێت، بەتایبەت لە شەڕی حەتین(٩) (حطين) کە شەڕێکی یەکلاکەرەوە بوو، هێزەکانی سەلیبی زۆر بە خراپی دەشکێن و زیانێکی گەورەی گیانی وماڵیان بەر دەکەوێ و ئەسیرێکی زۆریان دەبێت. ئیدی دوای ئەم تێکشکانە سەلیبییەکان لە شارەکانی سەر کەنار وەک یافا، سەیدا، بەیروت، جوبەیل و عەسقەلان و ئەوانی دی یەک لە دوای یەک شکان. ئەم شەڕە هاوسەنگیی هێز دەگۆڕێت و سنوورێک بۆ داگیرکارییەکانی سەلیبی لە ڕۆژهەڵات دادەنێت، کە بۆماوەی ٩٠ ساڵ بوو ئەم ناوچەیان داگیر کردبوو(١٠).




شوێنی بەرپابوونی شەڕی حەتین لە باکووری فەلەستین

**ڕزگارکردنی قودس**

دوای شکانی سەڵیبییەکان لەم ناوچانە، سەلاحەدین بە سوپایەکەوە بەرەو باشوور کشا بۆ ڕزگارکردنی شاری قودس، لە دیوارەکانی شاری قودس نزیک دەبنەوە و، شارەکە بۆماوەی دوازدە ڕۆژ گەمارۆ دەدەن. سەڵیبییەکان لەوێ  هێزێکی وا گەورەیان نابێ کە بتوانن بەرانبەر سوپای سەرکەوتووی سەلاحەدین بەرگری بکەن، بۆیە داوای گفتوگۆ دەکەن بۆئەوەی بەبێ شەڕ شارەکە بدەنە دەست سوپاکەی. بۆ سەلامەتی گیانی سەڵبییەکانی دانیشتوانی قودس، هەردوولا ڕێکدەکەون کە هەرکەسێک لە سەڵیبییەکان بڕێک پارە بدەن وەک فدیە بۆئەوەی بە سەلامەتی لە شارەکە دەرچن، بڕە پارەکەش بۆ پیاو ١٠ دینار و ژن ٥ دینار و منداڵیش ١ دینار. دوای ئەم ڕێککەوتنە، سوپای سەلاحەدین بەبێ شەڕ بە سەرکەوتوویی دەچێتە ناو شاری قودس. لە دەروازەکانی شارەکە فەرماندەی سوپا دادەنێن بۆ وەرگرتنی فدیە. لەنێو شارەکە بێجگە لە ژن و منداڵ، ٦٠ هەزار پیاوی سوار و پیادەی لێ بوو(١١).

بۆ ڕزگارکردنی خەڵکە سەڵبییەکەی ناو شاری قودس، سەلاحەدین ئەوپەڕی لێبوردەیی دەنوێنێت: ئەوانەی بە تەمەن بوون بەبێ دانی فدیە لە شار دەرچوون. ئەوە جگەلەوەی کە سەلاحەدین حەوت هەزار هەژاری لەسەر تکای مەلیک عادلی برای لە پێدانی فدیە بەخشی، خۆشی دە هەزار هەژاری بەخشی. ڕۆژێکیشی تەرخانکرد هەر لەبەیانییەوە هەتا ئێوارە بۆ دەرچوونی خەڵکی هەژار لە شارەکە، بەبێ فدیە(١٢).

ئەو کچ و ژنە سەڵبییانەی کە مێردەکانیان لە شەڕ کوژرا بوون یان ئەسیر بوون،

یان باوکیان کوژرا بوو، بەگریانەوە هاتن بۆ لای سەلاحەدین داوای یارمەتییان لێ کرد، سەلاحەدینیش فەرمانیدا ئەوانەی مێردیان ئەسیر بووە، مێردەکانیان ئازاد بکەن و بە هاوسەرەکانیان شادیان بکەنەوە و ئازادشن بۆ هەرکوێ دەیانەوێ بڕۆن، ئەوانەش کە مێردەکانیان کوژراوە یان باوکیان نەماوە، فەرمانیدا لە پارەی گەنجینەی خۆی بەگوێرەی ژیان و گوزەرانیان پارەیان بۆ خەرج بکرێ و ئازاد بکرێن. هەروەها بۆ بێوەژن و مندالانی هەتیویش لە گەنجینەی خۆی بەگوێرەی بژیی و گوزەرانیان پارەیان بۆ خەرج کردن. بۆ مەسیحییەکانی ئەو شارەش، سەلاحەدین ڕێزیکی زۆر دادەنێ و شوێنە پیرۆزەکانیان دەپارێزێت(١٣).

مامەڵەی جوان و نەرمی سەلاحەدین لە فەتحکردنی شاری قودس تەواو بەپێچەوانەی مامەڵەی سەلیبییەکان بوو کە بۆ یەکەمجار لە شەڕی یەکەمی سەلیبی لە داگیرکردنی قودس کوشتارێکی بێبەزەییانەی خەڵکی شارەکەیان کرد. سەلیبییەکان کە لەساڵی ١٠٩٩ قودسیان داگیرکرد، مەلیک گۆدفری Godfrey بەدانپێدانانی مێژوونووسە ئەورووپییەکان، نزیک بە حەفتا هەزار مسوڵمانی قەتڵوعام کرد(١٤).

دواتر لە ڕزگارکردنی شاری عەککا، کە سەلاحەدین لەگەڵ مەلیکی ئنیگلتەرا ڕیچارد شێردڵ ڕووبەڕوو دەبێتەوە، بەهەمان شێوە نەرمی دەنوێنێ، کاتێک شێردڵ نەخۆش دەکەوێ، سەلاحەدین میوە و بەفری بۆ دەنێرێ کە داوای لێکرد بوو(١٥). کەچی شێردڵ دواتر کوشتارێکی بێبەزەییانەی خەڵکە مسوڵمانەکەی ئەو شارە دەکات: سێ هەزار کەس بە گوریس دەبەستنەوە و لەسەر گردێک هەموویان بەشێوەیەکی دڕندانە دەکوژن(١٦).

بەم پێیە گیانی لێبوردەیی و بەزەیی و دڵنەرمی سەلاحەدین لە هەموو دنیا دەنگدەداتەوە، سەرکردە و پاشاکانی ئەورووپا لە ئیتاڵیا و فەڕەنسا و ئینگلتەرا بە ئەخلاقی جوان و کرداری پڕ سەروەریی و جوامێری سەلاحەدین سەرسام دەبن، لە شار و لە گوند باسی دەکرێ، دەبێ بە بابەتی چیرۆک و شیعر و شانۆکانیان(١٧).

سەلاحەدین لە ڕزگارکردنی شاری قودس و مامەڵەی جوانی لەگەڵ سەلیبییەکان، هەشت سەدە پێش ئێستا سەلماندی کە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە ملمالنێی شارستانیدا نین و دەتوانن پێکەوە بەئاشتی بژین، و بەشداربن لە بنیاتنانی شارستانیەتێک لە سایەیدا مرۆڤەکان یەکدییان خۆش بوێ و ڕیزی یەکدی بگرن. هەتا ئەمڕۆش ئەورووپا باسی ئەم مێژووە پڕ لە شانازییە دەکەن و باس لە گەورەیی سەلاحەدین دەکەن، هەروەها باس لە بنەماڵەکەی دەکەن کە بە بنەچە کوردن و لە کوردستانەوە هاتوون.




**دەوڵەتی ئەیووبی و دەوڵەتەکانی دەوروبەری لە سەدەی دوازدەیەمی زاینیدا**

**کۆچی دوایی سەلاحەددین**

سەلاحەدین دوای ئەم سەرکەوتنە گەورەیە، لە شام خەریکی ڕێکخستنی ئیشوکاری وڵاتەکەی بوو، هەروەها خەریکی دابەشکردنی سەدەقە بوو بەسەر خەڵکی داماو و هەژار. لە ساڵی ١١٩٣ نەخۆش دەکەوێ و نیشانەکانی تای زەرد (الحمى الصفراء)ی لێ بە دەردەکەوێت و ئارەزووی خواردن ناکات و باری تەندرووستی خراپ دەبێت، دواتر لە تەمەنی ٥٤ ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات. لە نزیک مزگەوتی ئەمەوی لە شاری دیمەشق تەرمەکەی بە خاک دەسپێردرێت.

کەسایەتیی سەلاحەددینی ئەیووبی

دەکرێ لەبارەی کەسایەتی و کارە مەزنەکانی سەلاحەدین زۆر بنووسرێ. لەوکاتەوەی کە ناوی چووەتە مێژوو وەک پیاوێکی مەزن باسی دەکرێ. سەلاحەدین نەک هەر لای مسوڵمانان زۆر گەورە و جێگەی ڕێزە، بەڵکو لای ئەورووپییە مەسیحییەکانیش، بەهۆی گیانی لێبوردەیی و مامەڵەی جوان و نەرمی لەگەڵ دوژمنەکانی، بۆتە جێگەی ڕێزێکی گەورە. لە ئەورووپا لەجیاتی ئەوەی وەک دوژمن سەیری بکرێ، کە سەلیبییەکانی لە فەلەستین وەدەرناوە، کەچی بووە بە ڕەمزی ئازایەتی و لێبوردەیی، هەربۆیە بە زمانە جیاوازەکانی ئەورووپی بە دەیان و سەدان کتێب لەسەر ژیان و ئازایەتی و جوامێری سەلاحەدین نووسراوە، لە چەندین چیرۆک و شیعری ئینگلیزی و فەڕەنسی ئەو سەردەمە

ناوی هاتووە. لە کارە هونەرییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا، لە تابلۆ و نیگار و مینیاتۆرییەکان، ئازایەتی و جوامێریی سەلاحەدین نیشان دراون.

سەلاحەدین لە حوکمڕانیدا هەتا ئەوپەڕی بە عەدالەت حوکمی کردووە، ئەم عەدالەتەی لەسەر خۆی و کەسوکار و برازاکانیشی جێبەجێ کردووە. کەسێکی چاوتێر و بەخشندە بووە، هەرگیز لە دەسەلاتیدا لە هەوڵی ئەوە نەبووە سامان کۆبکاتەوە، پێیوابوو سامان دەبێ لە ڕێی خوا سەرف بکرێت. لەگەڵ دۆست و دوژمن خاوەن بەڵێن بووە، هەر بەڵێنێکی بدایە بەجێی دەگەیاند، کەسێکی دڵنەرم و بە ویژدان بوو، هەرچەندە دوژمن بەرانبەری زۆر دڵڕەق و بێویژدان بوو، بەڵام ئەو هەرگیز وەک دوژمنەکەی ڕەفتاری نەدەکرد. کەسێکی هەژاردۆست و پشتیوانی خەڵکی داماو و لێقەوماو بوو. سامان و کۆشک و گوند و باخ و بێستان و هیچ کەلوپەلێکی لە دوای خۆی بەجێ نەهێشت، ئەمە لەکاتێکدا خاوەن دەوڵەتێکی گەورە و بەرفراوان بوو، تەنانەت لەدوای مردنی خۆی لە گەنجینەکەی تەنیا ٤٧ درهەم و یەک گرام زێڕ هەبوو، کە ئەمەش بەشی کفن و دفنی نەدەکرد، بۆ خەرجی شاردنەوەی پارەیان بۆ قەرز کرد(١٩).

نووسەرە ئەورووپییەکان بەرانبەر ئەم مێژووە پرشنگدارەی سەلاحەدین زۆر سەرسامن، لە کتێبەکانیان زۆر بەگەورەیی باسی کەسایەتیی و لێبوردەیی و جوامێریی سەلاحەدین دەکەن. دەکرێ لەم ڕووەوە ئاماژە بە لاوران پەین Lauran Paine نووسەری ئەمەریکی بدەین، کە لە کتێبێکی بەناوی (سەلاحەددین، پیاوی هەموو سەردەمێک Saladin, A Man For All Ages) بەم شێوەیە وەسفی سەلاحەدین دەکات:» مێژوو زۆر کەم پیاوی وەک سەلاحەددینی بەرهەمهێناوە. لەو سەردەمە لە هەموو ئەورووپا هیچ سەرۆک و پاشا و ئیمپراتۆرێک نەبووە وەک ئەو بوو بێت. تەنانەت ئیسلام، لە دوای مردنی سەلاحەدینەوە هەتا ئێستا، پیاوێکی دیکەی وەک ئەوی بەرهەم نەهێناوەتەوە»(٢٠)



**پۆرتریتی سەلاحەدین لەلایەن هونەرمەندی فەرەنسی ئەندرێ تیڤات لە ساڵی ١٥٨٤ز لە پاریس کێشراوە.**




مینیاتۆرێکی سەدەی پازدەمی میلادی کە لەلایەن دەیڤید ئوبێرت کێشراوە.

سەلاحەدین نیشان دەدات لەسەر ئەسپ بەسەرکەوتوویی هاتووە بۆ ناوی شاری قودس.



تابلۆیەکی سەدەی پازدەیەمی زایینی، کوشتاری مسوڵمانان نیشان دەدات بەدەستی هێزەکانی ڕیچاردی شێردڵ، کە ٣٠٠٠ ئەسیری مسوڵمانانی بەگوریس بەستەوە و لەسەر گردێکی شاری عەکا هەموویان دەکوژێت.




**ژمارەی یەکەمی گۆڤاری (ڕۆژی کورد) کە لە ساڵی ١٩١٣ لە ئەستەنبوڵ دەرچووە، بەرگی پێشەوەی بە نیگاری سەڵاحەدین ئەیووبی ڕازێندراوەتەوە.**

# سەرچاوە و پەراوێزەکان


١- ناوچەی قەوقاز لە سەدەکانی ناوەڕاستدا چەندین ناوی جیاوازی هەبووە، ناوچەی نێوان هەردوو ڕووباری ئاراس و کورا لای مێژوونووسە عەرەبەکان بە هەرێمی ئاران ناسراو بووە.

٢ – م. کاردوخ. جنبش های کرد، از دیرباز تا کنون، چاپ اول، سوید، ١٩٩٣، ص ١٤١ – ١٤٢.

٣ – د. زرار صدیق توفیق، کورد و کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەی ئیسلامیدا، لە بڵاوکراوەکانی خانەی ئاوێر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١١، ل ٣٥٠.

٤ – دکتۆر محسن محەمەد حسین، صەلاحەدینی ئەیوبی، ژیننامەی گەشترین، و. عەبدولڕەزاق بیمار، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٣٩٩٣. ل.١٣

٥ – د. زرار صدیق توفیق، کورد و کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەی ئیسلامیدا، ل٣٥١.

6 - Karen Armstrong, Holy War: The Crusades and Their Impact on Today›s World, Anchor Book, New York, 1992. P.3.

٧ – شراره شرفی، جنگهای صلیبی و علل آن، شرکت تاعونی، چاپ گناباد، مشهد، ١٣٧٨، ص ٣٩.

٨ – د. محسن محەمەد حسین، صەلاحەدینی ئەیوبی، ژیننامەی گەشترین، و. عەبدولڕەزاق بیمار، دەزگای ڕۆشنبیریی و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٩٣، ل١٠١.

٩ – حەتین ناوچەیەکە لە نێوان شاری ناسیرە و دەریاچەی تەبەرییە لە باکووری فەلەستین.

١٠- د.علي محمد الصلابی، صلاح الدین الأیوبی، و جهوده في القضاء على الدولة الفاطمية و تحرير بيت المقدس، الطبعة الأولى، دار المعرفة، بیروت، ٢٠٠٨، ص ٥٢٨ – ٥٣٠.

١١ – نفس المصدر السابق، ص٥٣ – ٥٣٨.

١٢ – محەمەد ئەمین زەکی بەگ.، خولاصەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان لە زۆر قەدیمەوە تا ئیمرۆ. ئامادەکردنی: ڕەفیق ساڵح، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٦. ل١١٣.

١٣ – د. علي محمد الصلابی، صلاح الدین الأیوبی، ص، ٥٤٢.

١٤. محەمەد ئەمین زەکی بەگ.، خولاصەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان: ٢٠٠٦، ل ١١٣.

١٥- د. محسن محمد حسین، صەلاحەدینی ئەیوبی، ژیننامەی گەشترین، ل ١٠٦.

١٦ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل.١٠٩.

١٧ – د. علي محمد الصلابی، صلاح الدین الأیوبی، ص، ٥٤٣.

١٨ – د. محسن محەمەد حسین، صەلاحەدینی ئەیوبی، ژیننامەی گەشترین، ل. ١٢٦– ١٢٧.

١٩ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل.١٣٧.

20 - Lauran Paine, Saladin, A Man For All Ages, Clarke. Doble & Brendon Ltd. London, 1974. P.82.

دواخاڵ

**د.ئیسماعیل بەرزنجی**

# چەند سەرەقەڵەمێک لەسەر بیتکۆین و دراوە ژمارەییەکان

سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کە دراوە ژمارەییەکان دراوی ئەلیکترۆنی نین، واتە پێشتر هیچ بەرامبەرێکی کاغەز یان مەعدەنیان نەبووە دواتر بگۆڕدرێن بۆ ئەلیکترۆنی یان ژمارەیی، بەمانایەکیتر هیچ حکومەتێک یان بانکێکی مەرکەزی لە پشت دەرکردن و کۆنترۆڵکردنییەوە نیە، بەڵکو ئەم دراوانە پشتدەبەستن بەتەکنیکی (چینە خشت یان چینە بلۆک) Blockchain کە ئەمەش کارێکی کۆمەڵکارییە و لە ڕێگای شیتەڵکردنی هاوکێشەی بیرکاری ئاڵۆزەوە بەشداربووان خشتەکان دەنێنەسەریەک هەتا دەگەن بە بەرهەمهێنانی دراوەکە، واتە هیچ پەیوەندییەکی بە چاپکردن و هەڵکۆڵینەوە نییە، بۆ ئەم شیتەڵکارییەش کۆمپیوتەر و ئامێری تایبەت و کاری بەردەوام و وزەیەکی زۆری کارەبای پێویستە کە لێرەدا بواری باسکردنی نییە.

بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەدا ئەوەیە هیچ شتێکی شاراوە و فێڵ و تەڵەکەبازییەکی تێدانییە و کارێکی تەواو زانستییە، سکیوریتیشی زۆر بەهێزە کە بواری هاککردنی تێدانییە، چونکە هەموو بەشداربووان وەکو یەک خاوەن دەسەڵات و ئاگادارن لە پرۆسەکە.

لێرەدا من سەرپێیی دەمەوێت هەندێک کورتە تێبینی بنووسم لەسەر ئەو دراوە ژمارەییانە کە بیتکۆین دیارترینیانە:

١ ـ یەکێکە لە لێکەوتە و ڕواڵەتەکانی سیستمی سەرمایەداری دوایین، بێ بەرنامە و لەخۆیەوە پەیدا نەبووە.

٢ ـ بەهۆی ئەوەی نیولیبرِالیزم جەخت لە ئازادی بازارِ و دوورخستنەوی دەوڵەت دەکات لە چاودێریی و تەدەخولی بازرگانی ئەم دراوە هاتووەتە ئاراوە، چونکە تەواو ئازادە، بەومانایەی هیچ حکومەتێک یان بانکێکی ناوەندی یان دەزگایەک چاودێر نییە بەسەریەوە.

٣ ـ سەرمایەداریی تاکە ئامانجی قازانجە بەهەر شێوەیەک بێت، کاتێک دەبینن مامەڵەیەکی زۆر دەکرێت لە دەرەوەی باج و سیستمی چاودێریی و قازانج بیریان لە میکانیزمێک کردووەتەوە کە لەو مامەڵە نایاساییانەش قازانج بکەن، بۆیە رێگادراوە بە چەند کۆمپانیا و بانکێک تا مامەڵە بەو دراوەوە بکەن و لەکۆتاییدا سیستمەکە سوودمەند دەبێت، تەنانەت لە ئێستادا ئەو کۆمپانیایانەی سەکۆی مامەڵەکردنن بەو دراوانەوە خەریکە لە بۆرسەی ناسداک و دواتر نیویۆرکیش پشکەکانیان تۆمار دەکەن.

٤ ـ ناچێتە عەقڵەوە کرِین و فرۆشتنێک بەو سەرمایە زۆرەوە هەروا لەخۆرِا بەرِێوەبچێت، ئەگەر قەرار بێت مامەڵەیەکی بێ دایک و باوک و بێ بنەما بێت چۆن گەورە سەرمایەداری وەک ئیلۆن ماسک دەچێتە ناویەوە؟

٥ ـ وڵاتانی رۆژئاوا بازرگانی بە چەک و کاڵای قرِکەر و دژە مرۆڤەوە دەکەن تەنیا لە پێناوی قازانجدا، عەقڵ نایبرِێ بەبیانووی ئەوەی مامەڵەی بیتکۆین و دراوی ژمارەیی بۆ سپیکردنەوەی پارەیە یان بۆ تەمویلی تیرۆرە خۆیان لەو قازانجە بێبەش بکەن.

٦ ـ بەرِای من ئەوە راست نییە کە هیچ وڵاتێک یان لایەنێک لە پشتییەوە نیە، بەڵکو ئەمریکا وەک هەموو بوارەکانی بازرگانی جیهانی و پێشەنگی دنیا لە سیستمی نوێی جیهانییدا ناراستەوخۆ لە پشتیەتی لە رێگای ژاپۆنی هاوپەیمانییەوە.

٧ ـ چۆن بازارِی ئاڵوگۆرِی دراو و پشکەکان لە بۆرِسە بووە بە رواڵەتی ئابووری ئەم سەردەمە بەبێ ئەوەی هیچ زیادەیەک بخاتە سەر (کۆی داهاتی ناوخۆیی GDP) و وەک ئابووری سێبەر کاردەکات، ئاوا بازارِی دراوە ژمارەییەکانیش کە بیتکۆین دیارترینیانە بەردەوام دەبێت، مادام دەکرێت کاڵایەک بێت کرِین و فرۆشتنی پێوە بکرێت، چونکە تاکە ئامانجی سەرمایەداریی کرِین و فرۆشتن و قازانج کردنە.

٨ ـ نزیکەی پەنجا ساڵێک زیاترە جیهان پێی ناوەتە قۆناغی پۆستمۆدێرنەوە، گرنگترین بنەماکانیشی نەهێشتنی چەقگەرایی (المرکزیە)ە لە هەموو کایەکاندا، کایەی داراییش لەوەدا بیتکۆین و دراوی ژمارەیی بەرکەوتووە، واتە ئەم دراوانە میکانیزمی لێدانن لە نەگۆڕ و چەسپاوەکانی بواری دارایی و بانکی کە چەندین ساڵە ئابووری پشتیان پێ دەبەستێت.

٩ ـ پێموایە جارێ زووە زانایان و شارەزایانی شەریعەت (فتوای حەرامبوون)ی بدەن، ئەگەر عیللەت لە حەرامییەکەی ڕیسکی زۆرە یان ئەوەیە کەس خاوەنی ڕاستەقینەی نییە، ئەوا لە داهاتوودا هەردوو عیللەتەکە لادەچن، چونکە ئەو بەرز و نزمییە زۆرەی لە نرخەکەیاندا دەبیندرێت لەبەر نوێی و قورسی بەرهەمهێنانیانە لە داهاتوودا زیاتر جێگیریی لە نرخیاندا دەبیندرێت، ئەگەریش مەسەلە ئەوەیە کەسێکی مەعنەوی وەکو بانکێک یان حکومەتێک خاوەنی نییە ئەوا هەموو بەشداربووەکان بەیەکەوە خاوەنین کە بێگومان مسوڵمانیشیان تێدایە، مەگەر کامیان باشترە بۆ ژیانی خەڵکی، وڵاتێکی زلهێزی نامۆ بەدین و بانکێکی سووخۆر کە بەرژەوەندی چەند کەسێک لەبەرچاو دەگرێت؟ یان خەڵکێک کە تێکەڵەیەکە لە مسوڵمان و نامسوڵمان و بەرژەوەندی هەموویان ڕەچاو دەکرێت؟ و جێگای سووخواردنیشی تێدا نابێتەوە.

١٠ ـ ئێستا زۆربەی وڵاتانی دنیا بەرەو نەهێشتنی دراوی کاغەز و مەعدەن دەچن و ڕوودەکەنە دراوی ئەلیکترۆنی و ژمارەیی، بەڵام هیچ کاتێک وڵاتان ئەم دراوە تەبەنی ناکەن و هەر سەربەخۆ دەمێننەوە، چونکە سروشتەکەیان وایە ئەوکاتە دەبنە دیاردەیەکی ئاسایی و وەکو زێڕ و زیو و کاڵاکانی تر مامەڵەی ئاڵوگۆڕ و کڕین و فرۆشتنی بۆڕسەشیان پێوەدەکرێت.




# گۆڕانکارییە فیکرییەکان
# لە جیهانی ئیسلامیدا

کتێبی نوێی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

ئێستا لە کتێبخانەکاندایە

